رۆهات ئەڵاکۆم

# کوردەکانی ئەستەمبووڵی کۆن

## (١٤٥٣ — ١٩٢٥)

و: لە تورکییەوە

**ئەحمەد تاقانە**

کوردستان ـ هەولێر
٢٠٠٥


ناوی کتێب: **کوردەکانی ئەستەمبووڵی کۆن (١٤٥٣ - ١٩٢٥)**

- نووسینی: رۆهات ئەلاکۆم
- وەرگێڕانی: ئەحمەد تاقانە
- نەخشەسازی ناوەوە: طــه حسين
- بەرگ: هۆگر صديق
- پیتچنین: کاوە حسین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٤١٥)
- چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠٠٥
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب: (٣٢- ١٣٥)



**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@ maktoob.com

**ژمارەی تەلەفۆن :** 2260311

www.mukiryani.com

# ناوەڕۆک

## پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم کتێبەی لەبەر دەستتاندایە، نووسەر و لێکۆڵەرەوەیەکی توانا دایناوە، تەنیا ئەوانەی خۆیان لەم جۆرە کارانە داوە، دەزانن نووسەر چ کارێکی گەورەی ئەنجام داوە. جگە لە مێژووی نزیکەی چوار سەد ساڵی لە کتێبەکەدا چڕ کردووەتەوە کە زانیارییەکان لەناو دەیان سەرچاوە و کتێب و رۆژنامە و گۆڤار و بەڵگەنامەی دیکەدا پەرت و بڵاوبووەتەوە و هێز و تینێکی ماندوو نەناسی دەوێ کۆیان بکاتەوە و بە وردبینی و بەرچاو روونییەکی وەها لێیان بکۆڵێتەوە.. دەڵێم، جگە لەمانە لێکۆڵەرەوە بەدوای سەدان شوێنەوار و گەڕەك و خانوو و کێلە قەبری چەندین گۆڕستانی کۆن و نوێدا گەڕاوە و بە بیندرێژییەکی وردەوەکە شایەنی رێز لێنانە وبەشتی دیکەوە کارەکەی ئەنجام داوە.

جگە لەمانەی کە لە سەرەوە بە کورتی باسیان لێوەکرا، کە نووسەری کتێب مێژوویەکی چڕکراوەی نزیکەی چوار سەدەی هێناوەتە گۆڕێ، مرۆڤ لە ئەنجامدا بە تایبەتی ئەگەر کوردێکی دڵسۆزی نەتەوەکەی بێ، هەست بەو کارەساتە گورچکبڕەی کۆچباری کورد و بەجێ هێشتنی نیشتیمانەکەیان دەکا. کە لە دوو توێی کتێبەکەدا چەندین هۆی ئەم کارەساتە خراوەتە روو.

نووسەری کتێب-رۆهات ئەلاکۆم-، یەك لەو لاوە لێکۆڵەرەوە کوردانەیە کە سەرباری دوورولاتی و دوورە دەستیی لێکۆڵینەوەکانی بەتایبەتی لە کوردستانی باشووردا، نووسەرێکی ناسراوە و هەموو کارەکانیشی نەبێ، خەڵکانێکی خاوەن مەبەست زۆری ئەمانەیان دەست خستووە و دیویانە و حەیرانیان بوون. بەهەر حاڵ ئەگەر هەندێك لەبارەی نووسەرەوە بدوێین سوودی دەبێ و زیانی نابێ.



رۆهات ساڵی ١٩٥٥ لە (کاغزمان)ی سەر بە (قارس)ی کوردستانی باکوور لە دایك بووە. لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە ئەنقەرە، بەشی دەروونناسی (سایکۆلۆژی)ی کۆلیژی پەروەردەی تەواو کردووە. ساڵی ١٩٧٨ وڵاتی خۆی بەجێ دەهێڵێ و بەرەو ئەوروپا کۆچ دەکا و(سوێد) دەگیرسێتەوە. لە ساڵانێکەوە کە هێشتا بە منداڵ دادەنرا، دەستی بە نووسین کردووە. لە شازدە ساڵیدا (زارۆکێن یەنیجەیێ)ی دەردەچێ. خەبات و کۆششی رۆهات لە دەرەوەی وڵات بەرچاوتر دەبێ، جگە لە بەرپرسیاری و ئەندامییەتیی دەستەی نووسەرانی هەندێك گۆڤاری کوردی، بەبێ وەستان لە گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکاندا نووسینی بڵاوکردووەتەوە.

رۆهات لە نووسەرە کوردە بە پیت و بەرەکانە و پتر لە (دە) کتێبی بە کوردی و تورکی هەیە. لەبەر ئەوەی لەو بڕوایەدام، هەموو نووسینەکانی رۆهات شایەنی خوێندنەوە و لێ وردبوونەوەن، بەتایبەتی ئەم کتێبەی و بەتایبەتیتر بۆ خوێنەری کورد بە پێویست دەزانم.. بۆیە خۆم بە بەختەوەر دەزانم ئەگەر توانیبێتم لە ئاستی بەرزی کتێبەکە خۆیدا بیخەمە بەردەستی خوێنەری کورد.

ئەم کتێبەی بە تورکی بە ناونیشانی (Eski İstanbul Kürtleri)یەوە دەزگای (ئاڤێستا) ساڵی ١٩٩٨ لە ئەستەمبووڵ بڵاوی کردووەتەوە.

مایەوە ئەوە بڵێم، بە پێویستی دەزانم سوپاسی (د.موحسین ئەحمەد عومەر)ی برادەری رۆشنبیرم بکەم کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە رێی گەڕانەوەیدا، لە پاریسەوە، بۆ چەند سەعاتێك لە ئەستەمبووڵ وەستا بوو و دانەیەکی لەم کتێبەی لە دەستی خۆی بۆ هێنابووم. هەروەها رنکردنەوەی هەندێك وشەو زاراوە کە بە پێویستم زانی بە تایبەتی بۆ خوێنەرانی کوردستانی باشوور، بۆ جودا کردنەوەیان لە پەراوێزەکانی نووسەر، لە پاڵ ئەستێرەیەکدا ژمارەم بۆ نووسین.

# پێشەکی

**ئەی چەلۆی کورد**

**کارت کرد، رێزت لێ نرا؟!**

**بووی بە پەلکێکی پاییزە، هەمدیسان هەر بەخۆت ژاکایت**

**لە سەرتاسەری سنوورەکاندا دەمری،**

**داخۆ ناوت، نازناوت گەیشتنە ئاسمان، دەسا بپرسە، بپرسە!**

"پارچـــەیەکە لـــەو شـــیعرەی-کـــەریم کۆرجـــان-
نووســــــیویەتی و پەیوەنـــــدیی بـــــە چـــــەلۆی
کـــوردەوە هەیـــە کـــە بەشـــداریی لـــە یـــاخی بـــوون
و راپــــەڕینی پاترۆنــــە (وەســــتا) خــــەلیل-ی
ئەستەمبووڵی ۱۷۳۰ دا کردووە."

نووسینی مێژووی ئەو کوردانەی لە سەرەتای ئەم سەدەیە و(*) پێشتریشەوە لە ئەستەمبووڵ (کۆنستانتینۆ پۆڵس)ی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا ژیاون، تا دوا پلە مەیدانێکی نوێی لێکۆڵینەوەیە. ئەوەندەی ئێمە بزانین تا ئێستا لە بارەی کوردەکانی ئەستەمبووڵی کۆنەوە هیچ کارێك ئەنجام نەدراوە. ئەم بابەتە، ئەوەندەی لە روانگەی مێژووی سیاسیی کوردەوە

(*) لێرەو لە شوێنی دیکەشدا مەبەست لە سەدەی بیستەمە. (وەرگێڕ)



گرنگە، لەڕوانگەی مێژووی کۆمەڵایەتیشەوە گرنگ و بە بایەخە، بە دەرکەوتنی هەندێك بەڵگەی نوێش ئەوەندەی دی بایەخی پتری پەیدا کردووە.

توێژینەوە لە بابەتی ئەو کوردانەی ئەستەمبووڵ، لە ساڵی (۱۹۲۲)ەوە بووەتە پێویستییەکی رۆژانە، لێکۆڵینەوەی لیژنەیەکی ئەمریکایی کە لەبارەی ئەستەمبووڵەوە ئامادەیان کردووە، خۆی لە گرنگیی ئەم باسە دەدا و دەڵێ: ((... هەروەها لە پایتەختدا، ئەو ئێرانی و کورد و ئەرناووت (ئەڵبانی) و عەرەب و ئەو جۆرە کەمایەتییانەش دەکرێ ببنە بابەتی لێکۆڵینەوەی دیکە. ئەستەمبووڵ لە مێژە بووەتە موگناتیسێکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ کە هەموو جۆرە مرۆڤێك بۆ خۆی رابکێشێ، هەندێك بۆ زەوی و هەندێك بۆ قازانج و هەندێك بۆ رابواردن و هەندێکی دیکەش وەکو پەنابەر هاتوونەتە ئەستەمبووڵ..))(۱) تا ئێستا کۆمەڵانی کورد لە ئەستەمبووڵدا هەر بە چاوێکی سیاسییانەوە تەماشا کراوە، بەڵام بەپێی جێکەوتە رێژەیی (پرێسپێکتیڤ)ێکی ئەستەمبووڵ واتە جێکەوتەی شارێکی گەورەی وەك ئەستەمبووڵ، کار لەسەر بابەتی کوردەکانی نەکراوە. نەبوونی، یان کەمبوونی لێکۆڵینەوە لەبارەی کۆچی

1- İstanbul-1920, Editör: Clarence Richard Johson, Çev. Sönmez Taner, İstanbul, 1995, s.76.

لە بابەت ژیانی ئەو رۆم و ئەرمەنی و جوولەکە و بولغار و ئەمریکییانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان، ساڵی ۱۹۹۷ لە یۆنان لێکۆڵینەوەیەکی نوێ بڵاوکرایەوە: بوونی کەمینە ئەتنیکییەکانی ئەستەمبووڵ-ی سەدەی۱۹. کتێبێکی رەخنەیی لە لایەن (فۆتی بەنلیسۆی)ەوە نووسراوە پەیوەندیی بە لێکۆڵینەوەکەوە هەبوو. بڕوانە: کەمینە ئەتنیکییەکان، مێژووی کۆمەڵایەتی لە ئەستەمبووڵ لە سەدەی نۆزدەهەمدا، ژمارە/۵۳.

ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەو روونکردنەوانە پێکهاتووە کە ساڵی ۱۹۹۸ پێشکەش بە کۆنفرانسێك کراوە، وەك لە سەرەوە باسمان لێوەکرد، باس لە کەمینەی دیاریکراو کراوە. ئەوەندەی ئێمە بزانین تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر و کۆکراوە لە بارەی ئەو خرستیان (دیان) و کەمینە ئەتنیکییە موسوڵمانانەی لە ئەستەمبووڵ ژیاون نەنووسراوە. بەمجۆرە، هێشتا جوگرافیای ئەتنیکی و دیمەنی ئەستەمبووڵی کۆن بە هەموو رەهەندەکانییەوە روون نییە.

کوردەوە، لە گۆشەنیگای نووسینەوەی مێژووی کوردەوە بۆشاییەك دەخولقێنێ. ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەبارەی کوردەکانی ئەستەمبوولی کۆنەوە کراوە، کە بوونەتە دێرینە. بە ئومێدی بەشداریکردن لە تێگەیشتنی باشتری ئەو دیاردەی کۆچە، نووسراوە، کە لە روانگەی کوردی ئەم سەردەمەمانەوە، وەکو ژیانی رۆژانەی لێ هاتووە.

وەکو زانراوە، بە درێژایی مێژوو، گەلێك ناوی جودا جودا بە ئەستەمبووڵ دراوە، دیارترینی ئەم ناوانە ئەمانەن: کۆنستانتینۆبڵ، دەرسەعادەت، ئیسلامبوڵ، ئیستانبوڵ، قوستەنتینییە، کۆنستەنتینۆپۆڵس، میکلاگارد، نۆڤا رۆما، پۆلین، شەهری کۆنستەنتین، تەختی رووم و ... کوردەکانی ئەم پایتەختە مێژووییە بە خۆیان پێی دەڵێن: ئەستەمبۆڵ.

بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەر نەك تەنیا بۆ ئەستەمبوولی ئەمڕۆ رابکێشین، بەڵکو تا بتوانین سەرنجی بۆ سەدان ساڵی پێشتری ئەستەمبوڵ کێش بکەین .. لە سەرەتای سەرەکیی کتێبیشدا و لە پێشەکیی ئەو بەشانەشدا کە لە ناو کتێبەکەدا جێی خۆیان کردووەتەوە.

بەر لە هەموو شتێك، پێشنیارکرا ناوی کۆنستانتینۆپۆڵس بەکار بهێنرێ، بۆ ئەوەی ئەو ناوەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەی لە پایتەختی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا بووە و لە سەدان ساڵی بەر لە ئێستای خوێنەرانی ئەمڕۆدا ماوەتەوە، بە ئاسانی هەناسە بدات و دەربکەوێتەوە، بیر لەوە کرابووەوە کە بەکارهێنانی ناوێکی وەها لە جێی خۆیدا بێ. بەڵام لە دواییدا ناوێك هەڵبژێررا کە تەنیا گوتارێك بێت بۆ چینی خوێندەوار و وشەی کۆن، خرایە دووی ئەستەمبوڵ و بەمجۆرە ئەستەمبوولێکی دیکە هاتە گۆڕێ کە بووەتە سامانی مێژوو و لەبیرەوەرییەکاندا ماوەتەوە. بەمجۆرە کتێبەکە تایبەتمەندییەکی روونتری بەدەست هێناکە هەموو کەس پێی بگا ((کوردەکانی ئەستەمبوولی کۆن (١٤٥٣-١٩٢٥) )). لەلایەکی دیکەوە ئەستەمبوڵ، بە گوێرەی کۆنستانتینۆپۆڵس کورتترە و وشەیەکە ئاسانتر دەخوێندرێتەوە. لەم سەردەمەماندا لە بابەت کوردی لە ئەستەمبوڵ ژیاوەوە کە ژمارەیان دەگاتە ملیۆنان، تەنیا لە بەشی پێشەکیی کتێبدا جێی هەندێك روونکردنەوە کراوەتەوە. لەم کتێبەدا وەکو شتێکی تایبەتی کۆمەڵانی ئەو کوردانە بە بەرچاوەوە گیراوە کە لەنێوان ساڵانی (١٤٥٣-١٩٢٥) دا لە ئەستەمبووڵدا ژیاون. وەکو دواتر دەبینین لە سەرەتای ئەم سەدەیەماندا بە دەیان هەزار کورد لە ئەستەمبووڵدا ژیاون.



ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئەنجام دراوە و لەبارەی هەندێك بڕی ئەو کوردانەوەیە وا لە ئەستەمبوولی کۆندا ژیاون، سەرەڕای ئەوەی تێزێکی ئەکادیمییە، گەڕانێکی مێژوویی لێکۆڵەرەوەیە کە لە شوێنەوارە کۆنەکانی ئەستەمبوڵ، بەڵکو لە هەندێك تێبینیی رێکخراوەوە پێکهاتووە. خوێنەر ناوەناوە لەگەڵ هەندێك ژمارە و بەراورد کردنەوە و پارچەی وەرگێراو و گەلێك پەراوێزی بە پیت و دەوڵەمەندی بەکارهێنراودا ئاشنا دەبێ.

بە بەرچاوەوە گرتنی ئەو چینە خوێندەوارەی ئارەزووی وەدەستهێنانی زانیاریی پتری هەیە، ئەم رێبازە گیرایە بەر، لەلایەکی دیکەوە بیرۆکەی ئارەزووی رزگارکردنی کتێبەکە لە شێوە و دەقی ئەدەبیش، نووسەری بەم لایە نیمچە ئەکادیمییانەدا بردو بەرەو تەکنیکی پەرەپێدانی چەمك بەرەو پێشەوە چووە.

ئەم کتێبە لە چوار بەشی بنچینەیی پێکهاتووە. لە بەشی یەکەمدا گەشتێکی مێژوویی دەکرێ لە بابەت کۆچی کوردانەوە بۆ ئەستەمبوڵ. لە بەشی دووەمدا بەتایبەتی ئەو بیرە نەتەوایەتییە مۆدێرنەی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا رۆشنبیرە کوردەکان پەرەیان پێ داوە و چالاکییە بنەڕەتییەکانی وەکو رێکخراوە کوردییەکان و چاپەمەنیی کوردی ئەنالیز (شی) کراوەتەوە. بابەتی ئافرەتانی کورد کە ئەم چالاکییە بنچینەییانە پێکدەهێنێ بە شێوەیەکی سەربەخۆی جودادا، واتە بابەتی بەشی سێیەمی کتێبەکە پێکدەهێنێ .. لەم بەشەدا ئەو دید و بۆچوونە نوێیانەی لە بابەتی ئافرەتدا دێتە پێش و هەڵوێستی ئافرەتی کورد لە ئەستەمبووڵدا بە بەرچاوەوە گیراوە.

بەشی چوارەم و دوا بەشی کتێبەکە .. ئەو ناخۆشییە گەورانەی کە لە ئەستەمبووڵدا بە درێژایی سەدان ساڵ، کۆڵهەڵگرە کوردەکان تووشی هاتوون و بەسەریاندا هاتووە، روون دەکرێتەوە .. بە تایبەتی لە سەرەتای داهاتنی سەدەی بیستەمدا ئەو مرۆڤانەی لە هەموو چین و جۆرێکی کۆمەڵی کوردەوە هاتوونە گۆڕێ، نزیکییەکی هەست و گیانیان لە بیری نەتەوەیی کورددا بە بەرچاو دەکەوێ. لەناو مۆزاییکی عوسمانیدا بزووتنەوەی ئەتنیکی، کوردەکانیشی خستووەتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە.

لە سەدان ساڵەوە، یەکگرتنی کولتوور و بیروباوەڕەکان و یەکدی لە ئامێز گرتنەوەیان، لە شارێکی گەورەی وەك ئەستەمبووڵدا چیرۆکی ژیان بەسەربردنی کوردان، لەم کتێبەدا بە

هەندێك فۆتۆگرافی جیا جیاوە ڕەنگینتر کراوە و دواتریش کتێبێکی وەهای لێ پەیدا بوو کە چەمکی مێژوویی جەماوەریی بەسەردا زاڵ بێ .. ئەم کارە، بە تایبەتی بۆ ئەو کارانەی لە داهاتوودا لە بارەی ئەو کوردانەوە دەکرێت کە لە ئەستەمبوولی ئەمڕۆماندا دەژین، پاڵپشتێکی مێژووییانە پێکدەهێنێ. لە بابەتی کوردەکانی ئەستەمبوولی کۆنەوە، بێگومان لەو لێکۆڵینەوانەدا کە لەمەودوا دێنە کایەوە، زانیاریی نوێ و بەڵگەی تازە دەخرێنە ڕوو.

لە لایەکی دیکەوە، لە کۆتایی کتێبدا، ئەو وێنانەی دەمانگەڕێنێتەوە سەردەمە کۆنەکان، جێیان گرتووەتەوە. ئەم فۆتۆگراف و تابلۆ و وێنە هەڵکۆڵراوانە (گراڤویر)، هەندێکیان بۆ جاری یەکەمە لەم کتێبەدا بڵاو دەکرێنەوە، بەهای ئەم بەشە بینراوە ئاشکرایە، گەلێك وێنەکێشی ناسراو و وێنەگری بیانی لە ئەستەمبوولی کۆندا ژیاون، کە هەر لە ئەستەمبوولدا درێژەیان بە کارەکانیان داوە و هەر لەوێشدا مردوون. هەندێکی ئەم هونەرمەندانە ناوە ناوە مۆرکی کوردی لەناو کارەکانیاندا بووەتە بابەت و هێنراونەتە سەر شێوەی مۆتیف. لەمانە، ئەمادیۆ پرێزیۆسی (١٨١٦-١٨٨٢)ی وێنەکێشی ئیتاڵی، تابلۆیەکی ڕەنگا و ڕەنگی جەنگاوەرێکی کوردی کێشاوە، ئەم جەنگاوەرە کوردەی بە ڕەنگی ئاوی وێنەی کێشاوە، کوردێکی شاری (وان)ە، لە ئەستەمبووڵ ژیاوە. ئەمادیۆ پرێزیۆسی کە لە کۆڵانی سەرۆکی کۆڵهەڵگرانی (بەیۆغلۆ)دا ژیاوە، ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤانی کۆمەڵە ئەتنیکییە جیاجیاکانی بۆ بابەتی تابلۆکانی هەڵبژاردووە. مۆزاییکی ڕۆشنبیریی خەڵکانی ئەستەمبووڵ، بۆ ئەمادیۆ پرێزیۆسی مۆتیفێکی بە بایەخی پێکهێناوە. گویلیۆم بێرگگرن (١٨٣٥-١٩٢٠)ی وێنەگری فۆتۆگرافیی سویدی، وێنەی فۆتۆگرافیی کوردێکی بە ساڵداچووی کردووەتە (کارت پۆستاڵ- پۆست کارت) و لە ئەستەمبووڵدا خستوویەتییە بازاڕەوە. هەروەها ئەو هونەرمەندانەی بە عەبدوڵڵا فرێری، یان بە برایانی عەبدوڵڵا ناسراون، وێنەی (سەرکردەی کورد)ێکیشی گرتووە کە خراوەتە سەر بەرگی ئەم کتێبە. ڤیچن و هۆوسیپ و کەڤۆرك کە برا بوون، ئەو ستۆدیۆیەی دایاننابوو ناوبانگی زۆری پەیدا کردبوو، دواتر ئەم برایانە بوونەتە وێنەگری سەرا(**)، وێنەی هەندێك منداڵی کوردیان گرتبوو کە، لەو قوتابخانەیەی عەشایەرە دەیانخوێند کە لە ئەستەمبووڵ دامەزرابوو. هەروەها ئەم برایانەی

(**) سەرا: دەرباری سوڵتانی عوسمانی. (وەرگێڕ)



وا بە برایانی عەبدوڵڵا دەناسران و (پاسکال سێباه) کە لە ئەستەمبووڵ دەژیا، لەگەڵ پۆلیجار پەژۆ ئیلێر- ی بە ڕەگەز فەرەنسی لە ئەستەمبووڵ ستۆدیۆیەکیان دامەزراندووە. لە وێنەیەکدا کە پەیوەندی بە ترومپاچییانەوە(***) هەبووە و لە لایەن ئەم ستۆدیۆیەوە گیراوە، وێنەی کوردێکی ترۆمپاچیش گیراوە کە ناوی (دلاوەر) بووە. وێنەیەکی زارۆ ئاغای بە تەمەنترین مرۆڤی جیهان، ساڵی ١٩٣٠ گیراوە و کراوەتە پۆستکارت و خراوەتە بازاڕ. ئەم هونەرمەندە بیانییانەی لە ئەستەمبووڵدا ژیاون، مۆدێلەکانیان بە زۆری لەناو کۆمەڵانی کوردی لە ئەستەمبووڵدا ژیاویانەوە هەڵبژاردوون. ماکس فروختەرمان (١٨٥٢-١٩١٨)ی بە ڕەگەز نەمسایی- مەجەر (هەنگاری)، ئەو شوێن و کەسایەتییانەی ئەستەمبووڵی کردووەتە بابەتی نزیکەی دوو هەزار پۆستکارت و بڵاوی کردوونەتەوە(٢). تەنیا ئەو کوردانەی ئەستەمبووڵی کۆن نین بوونەتە مێژوو، لە لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوە لە بابەت ئەو کوردانەوە کە لە ئەستەمبووڵی ئەمڕۆشماندا دەژین و ژمارەیان دەگاتە ملیۆنان، هەژارین.

ئەمڕۆ لە هەموو گەڕەکێکی ئەستەمبووڵدا، زۆر ئاساییە کوردت بەرچاو بکەوێ. کوردەکان گەورەترین کەمایەتیی ئەتنیکیی ئەستەمبووڵی ئەمڕۆ پێکدەهێنن. کۆن، ئەتنیکی ڕۆم کە لە ریزی یەکەمدا ئاماژەی بۆ دەکرا، ئەمڕۆ بە ژمارە، کوردەکان ئەو جێیەی ئەوانیان گرتووەتەوە. لەم سەردەمەماندا پێویستیی وردبوونەوە لە بابەتی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبووڵدا دەژین، ناوە ناوە لە ڕۆژنامە و گۆڤارە جوداجوداکاندا دەخرێنە بەرچاوان، ئەو نووسینانەی لە بابەتی ڕووە جیاجیاکانی کوردەکانی ئەستەمبووڵەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا ناوە ناوە بڵاو دەکرێنەوە بەرچاو دەکەوێت. لەم بوارەدا هەندێك شوێنپێی ئەو کۆمەڵە ڕێکخراوانەی بۆ ئامانجی کۆمەڵایەتی دادەمەزرێن و لە بارەی دیاردەی کۆچەوە هەندێك کار و کۆشش لە

(***) ترومپاچی: لە سەردەمی عوسمانیدا بە ئاگر کوژێنەوەکانیان گوتووە کە بە ترومپای ئاو ئاگریان دەکوژاندەوە. وشەکە واتەی وەستای ترومپا چاککردنەوەش دەگەیەنێ. (وەرگێڕ).

2- Engin Özendes, Abdullah Fréres- Osmanlı Sarayı'nın Fotoğrafçilari YKY, İstanbul. 1998.

چاپەمەنیدا بەرچاو دەکەوێت .. ئەم جۆرە یانانە بە تەنگ ژیانی رۆژانەی ئەو کوردانەوە بوون کە بەتایبەتی بەهۆی جەنگەوە ناچاری کۆچ کردن بوون بۆ ناوچە جیاکان و بەتایبەتیش بۆ ئەستەمبووڵ، بایەخ بە گرفتی رۆژانەیان و یارمەتیدانیان دەدەن. ئەستەمبووڵی ئەمڕۆ، مۆرك و تایبەتمەندیی گەورەترین شارێکی پێوەیە کە بەپێی سەرژمێر، گەورەترین ژمارەی کوردی تێدایە، تەنانەت لە کوردستانیشدا شارێکی وەها نییە ئەوەندەی ئەستەمبووڵ کوردی بەخۆوە گرتبێ. ئەم بارودۆخە سەرنجی لێکۆڵەرەوان زۆر رادەکێشێ، لەم روانگەیەوە، گرنگی و بایەخی ئەستەمبووڵ لە زیادبووندایە. تەنانەت سولەیمان دێمیرێل-ی سەر کۆماری (پێشووتری) تورکیا، لەو کۆبوونەوە و لێدوانەیدا کە لەگەڵ نووسەرانی رۆژنامەی (میللییەت)دا ئەنجام یدابوو، وەك لە گۆشەکەی (یاڵچن دۆغان)دا روون کردنەوەی: ((ئەستەمبووڵ گەورەترین شارێکی کوردە لە جیهاندا)) بڵاوکراوەتەوە[٣].

ئەستەمبووڵ وەك شارێکی سەرەکی و لە هەندێك شاری دیکەی بەشی خۆراوای تورکیا، وەك ئەوەی ناوەندی ئەو تۆ هەن دەیانەوێ کۆچکردنی کوردەکان پێشی لێ بگیرێ، هەندێك لایەنی دیکەش هەن بە چەمکێکی سیاسی یان سەربازی، حەز لە کۆچکردنی کوردەکان دەکەن بۆ ئەستەمبووڵ و هانیشی دەدەن. ئەم ناوەندانە پێیان وایە ئەو بزووتنەوە ئەتنییانەی لە کوردستاندا بەرپا دەبن، بەم کۆچکردنانە، کز دەبن و لەناو دەچن.

بۆ شکاندنەوەی یان کز کردنەوەی کاریگەریی ئەو نارەزاییەی کوردە کە لەسەر بنەمای ئەتنیکی پێکهاتووە، تەنانەت لە پێناویشیدا پەنا بۆ خەباتی چەکدارانەش براوە. ناوەندە سەربازییەکان یان (پرۆ-سیاسی)یەکان هەوڵێکی زۆر ئەستووریان بۆ خەرج کردووە و دەکەن. بەتایبەتی چۆڵکردنی ئەو گوندانەی لەناوچە دەشتەکییەکاندان بووەتە ئامانجی سەرەکیی ئەم ناوەندانە، هۆیەکانی کۆچباری کوردان و شێوەکانی جۆراوجۆرن، ژمارەی ئەو کوردانەی لە ئەنجامی سووتاندنی گوندەکان و چۆڵکردنیان کۆچ دەکەن،هەمیشە لە پتر بووندایە.

3- Milliyet gazetesi, 22.8.1998.



نەبوونی چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ دۆزی کورد لە تورکیا، گومانی تێدا نییە ئەمجارەیان لە ئەنجامی کۆچ کردندا گیروگرفتی دیکە دەهێنێتە سەر رێی تورکیا، نەك هەر تەنیا مرۆڤەکان، بەڵکو گیروگرفتەکانیشیان بۆ ئەستەمبووڵ دەگوێزنەوە. ئەم هەڵوێستە هەر تەنیا سیاسییەکانیش نییە، بەڵکو بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکانی شارە گەورەکان و بەر لە هەموو جێیەك ئەوانەی ئەستەمبووڵیشی هەر لە ئێستاوە تووشی رەشبینی کردووە. دەبێ پێویستیی بە پێشخستنی ڤیزا و پەساپۆرت دەرکردن بۆ ئەمانەی لە سەرەوە باسمانکردن و بۆ ئەستەمبووڵ کۆچیان کردووە، لەسەرچاوەی ئەندێشەیەکی وەهاوە ئاوی خواردبێتەوە.

چیرۆکی ئەو کوردانەی ئەمڕۆ لە ئەستەمبووڵدان و ژمارەیان دەگاتە ملیۆنان، لە شێوەی کتێبێکی جودای سەربەخۆدا، لە داهاتوودا لە ژێر ناوی (کوردەکانی ئەستەمبووڵی نوێ)دا دەردەچێ، بابەتی لێکۆڵینەوەی داهاتوومان پێکدەهێنێ.

## بەشی یەکەم

# کۆچی کوردان بۆ ئەستەمبووڵ (١٤٥٣–١٩٢٥)

### ئەستەمبووڵی گەورەترین شاری کوردو

### سەد ئەوەندە پتربوونی سەر ژمێری کورد

سەرژمێرێك لە سەدەی پانزدەهەمدا، واتە ساڵی ١٤٩٨ کراوە، لە سێ گوندی کورددا کە لە ئەستەمبوولّ و لەناو سنوورەکانیدا رۆنراون، ئەوەی تۆمار کردووە (٣٨٢) کەسیان تێدا ژیاوە[1]، ئەم گوندانە بەناوی دانشمەندلو، دەپەڤیران، ئیشیقلی-یەوە بووە، جگە لەم گوندانە، لە گوندێکی دیکەشدا کە ناوی (یایلا) بووە، کوردی تێدا بەرچاو دەکەوێ[2]. بەڵام نازانرێ ئەم گوندەی دواییان چەند کوردی تێدا ژیاوە.

---

[1] لە بابەتی ئەو یەکەم کوردانەی کۆچیان بۆ ئەستەمبوولّ کردووەدا دەتوانرێ سەیری ئەم سەرچاوانە بکرێ:

Ömer Lütfi Barkan, Osmanlı İmpratorluğu'nda Toprak İşciliğinin Organizasyonu Şekilleri, lü İktisat Fakültesi Mecmuası 1/1939, S. 29-74. Stefan Yerasimos, 15. yüzyılın Sonunda Haslar Kazası, Eyüp'te Sosyal yaşam, editör: Tülay Artan, İstanbul 1998.

2- İstanbul Ahkâm Defterleri- İstanbul Tarım Tarihi (1743-1757), İstanbul Külliyati ıv. Proje ve yayın yönetmeni: Ahmet kal'a, İstanbul Araştırmalar Merkezi, İstanbul, 1997.



ئەمڕۆ ئەستەمبوولّ بە گەورەترین شارێکی دنیای کوردان دەژمێردرێ، لەو ئەستەمبوولّە کۆنەدا کە (٣٠) هەزار کوردی لێ بووە، بەرە بەرە سەرژمێریان لە پتربووندا بووە و لەمڕۆماندا بووەتە سەد ئەوەندە و سەرژمێری کوردی تێدا سێ ملیۆنی رەت کردووە.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەماندا سەرژمێری ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولّ ژیاون، لەلایەن توێژەرەوەکانەوە بە نزیکەی (٣٠) هەزار کەس قەرسێنراوە، لەم ساڵانەی دواییدا سەرژمێری ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولّ ژیاون، دژواربوونی وەڵامدانەوەی پرسیاری بە تەواویی چەند بوونی سەرژمێریان روون و لە ئارادایە. گەورەترینی ئەم دژوارییانە، لەم سەرژمێرانەدا کە لەم ساڵانەی دواییەدا ئەنجام دراون، تەواوی چینە ئەتنییەکان، ئەوانەی خرستیان (دیان) نین، هەر هەموویان بە شێوەیەکی گشتی، لە سەرچاوەی بە موسڵمان دانانیانەوە ئاو دەخواتەوە. جوداییە ئەتنیکییەکانی ناو خودی موسڵمانەکان، لەو سەرژمێرانەدا کە لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوکراونەتەوە، یانیش لەو کارە دیموگرافییانەدا کراوە، زۆر هەڵنەسەنگێنراونەتەوە. لە بارەی کۆمەڵانی وەکو رۆم و ئەرمەنی و جوولەکەو بولگاری، کە موسڵمان نین و لە ئەستەمبوولّ دەژین، توێژینەوەیەکی زۆر تۆمارکراوە، بەمجۆرە دەتوانین بڵێین مۆزاییکی ئەستەمبوولّ لەم لایەنەیەوە لێی کۆڵراوەتەوە.

سەرچاوە کوردییە کۆنەکان و رێکخراوەکانیان لە سەرەتای سەدەماندا لە بابەت سەرژمێری ئەو کوردانەی وا لە ئەستەمبوولّ لە ژیاندا بوون، زانیاریی زۆر جیا جیایان پێ گەیاندووین. تەنیا گۆڤاری ژین کە ساڵی ١٩١٨ لە ئەستەمبوولّ بڵاوکراوەتەوە، لە وتارێکیدا رایدەگەیەنێ، کۆمەڵانی کۆڵهەڵگر (حەماڵ) لە ئەستەمبوولّ زۆرینەی کورد پێکی دەهێنن و ژمارەی قەوارەی کارگەرانی کورد بە ((پێنج تا دە هەزار)) کەسێك دادەنرێ، ئەگەر بڕە کوردەکانی دیکەشیان بخرێتە سەر، ئەو کۆمەڵە کوردەی لە ئەستەمبوولّ بووە، بێگومان ژمارەیەکی گەورەترمان بۆ دەردەکەوێ. هەندێك وردە زانیاریی دیکە، کە لە سەرچاوەگەلێکی دیدا جێی گرتووەتەوە و ژیانی هەزاران کوردمان لە ئەستەمبوولّ ناڕاستەوخۆ دەخاتە بەرچاو، بۆ نموونە (جەمعییەی تەعالیی کوردستان) کە ساڵی ١٩١٨ دامەزراوە، بەپێی هەندێك سەرچاوە (١٠) هەزار، بە

پێی هەندێکی دیکەش نزیکەی (١٥) هەزار ئەندامی هەبووە[٣]. ئەوانەی ئارەزووی سیاسییان بووە و ئەم بڕە کوردانەی لە ڕێکخراوی سیاسیدا ئەندام بوون و ئەو کوردە سادانەی لە دەرەوەی ئەم بڕانەدا ماونەتەوە، واتە ئەو مرۆڤانەی وەکو منداڵ و بە تەمەنەکان .. کە لە دەرەوەی ژیانی ئەکتیڤی سیاسیدا ماونەتەوە، ئەگەر ژمارەیان بخەینە سەر ئەم ژمارانە، بە هزر، هاتنە کایەی ژمارەیەکی لەمە گەورەترمان بۆ دەردەکەوێت. بوونی ژمارەیەکی زۆری کورد لە ئەستەمبوولی ئەم ساڵانەدا دەکرێ ژمارەیان لە ژمارەی ئەوانەوە بە دەست بخەین کە دەنێررانە بەرەکانی جەنگ. بۆ نموونە (خالید سەیفوڵڵای بەدرخان)ی سەر بە بنەماڵەی بەدرخان، ئەوە رادەگەیەنێ کە دەتوانێ (٤-٥) هەزار کوردی خۆویست (متطوع) لە ئەستەمبوولدا کۆ بکاتەوە و بیاننێرێتە بەرەکانی جەنگ[٤]. هەروەها (عەلی شامل پاشا)ی هەر لە بنەماڵەی بەردخان، لە ئەستەمبوولدا نزیکەی سێ هەزار کورد کۆ دەکاتەوە و لە تەکیاندا بەشداریی جەنگی (عوسمانی - رووسی)ی (١٨٧٧-١٨٧٨) دەبێ. بەشێکی زۆری ئەم کوردانە گیان دەبەخشن و عەلی شامل پاشاش لە چەند جێیەکییەوە بریندار دەبێ[٥]. ساڵی (١٩١٨) عیززەت پاشا کە ئەرك و فرمانی جیاجیای دەدرێتێ، وەکو باسکراوە پێنج هەزار کوردی

---

[٣] ژمارەی ئەو کوردانەی لە کۆنەوە لە ئەستەمبووڵ ژیاون بە (٣٠) هەزار کەس دانراون.

Philip Mansel, Dünyanın Arzuladığı Şehır: İstanbul, Çev. Şerif Erol, İstanbul, 1996, s. 331. Martin van Bruinessen, kürdistan Üzerine yazılar, İstanbul, 1992, s.143. Ahmet Mesut, İngiliz Belgelerinde kürdistan, İstanbul, 1992, s. 103.

4- Açık Mektup, Sultan İkinci Hamid Han Hazretlerine, kürdistan, no 20, Arap harflerinden latin harflerine çeviren: M. Emin Bozarslan, Uppsala, 1991, s. 352.

ئاماژەیە بۆ وتاری (نامەیەکی کراوە بۆ حەزرەتی سوڵتان عەبدولحەمید خانی دووەم)ی رۆژنامەی کوردستان. بەڵام لەو چاپەی سەرەوە کە م. ئەمین بۆز ئەرسلان- کردوویەتی بە پیتی لاتینی و ١٩٩١- لە سوێد بڵاوی کردووەتەوە.

5- Nazmi Sevgen, Türk Beylikleri, Ankara, 1982, s.119.



بەدواوە بووە[٦]. عیززەت پاشا کە دانیشتووی (گوێز تەپە) بووە، ساڵی (١٩١٩) دەبێتە والیی (ئایدن)، هەموو ئەم نموونانە ئەوە دردەخەن کە ژمارەی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولدا دەژیان و توانیویانە بەو هێزەوە بەشدارییەکی دینامیکییانەی جەنگ بکەن، ژمارەی ئەو کوردانە هەزارانی رەت کردووە. ئەم بارودۆخە دەریدەخا کە، هەر سەرکردەیەکی کورد لە ئەستەمبوولی ئەو سەردەمە، بە پێی دەسەڵات لەشکرێکی پێ پێکهێنراوە، یان پێی کراوە پێکیبهێنێت.

کورد لە هەموو چین و توێژێکەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، هەندێك لەو کوردانە لە پلەو پایەکانی دەوڵەتدا پۆستیان بەدەست بووە، گەییونەتە پلەکانی سەرەوە و لە بیرۆکراسیدا شوێنی گرنگیان وەدەست هێناوە. لەم ساڵانەدا بڕە قوتابییەك هەبووە خوێندنی باڵایان لە پایتەخت تەواو کردبێ و بە باش دابنرێن. ژمارەی ئەمانە سەدانی رەت کردووە. بۆ نموونە لە سەرچاوەیەکدا دەبینین (٢٠٠) خوێندکاری کورد لێرەدا لە بەشە جیاجیاکاندا خوێندنیان تەواو کردووە[٧]. بوونی کۆمەڵەی (تەعالی)ی کورد کە لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە و خاوەنی (١٥) هەزار ئەندام بووە، یامەتیی ئەوەمان دەدا کە سەرژمێری کوردی ئەستەمبوولی ئەو ساڵانە بە نزیك کردنەوە دەربخەین (بقەسرێنین)، خۆ ئەگەر ژمارەی ژن و منداڵ و پیر بخەینە سەر ئەم بڕە، ژمارەی کوردی ئەستەمبووڵ بە زیاتر خۆی دەنوێنێ.

بەمجۆرە دەچێتە عەقڵەوە کە نزیکەی (٣٠) هەزار کورد لە ئەستەمبوولدا هەبووە، بڕێکی زۆری ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولدا بوون، ئەو کرێکارانە پێکدەهێنن کە بۆ کارکردن هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، زۆربەی ئەمانە وەکو کۆڵهەڵگر (حەماڵ) کاریان کردووە. ژمارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوولی سەرەتای ئەم سەدەیەمان بە نزیکەی (١٠) هەزار کەس دادەنرێ. لە بابەتی کۆڵهەڵگرەکاندا- بەشی چوارەم، کە دوا بەشی ئەم کتێبەیە، زانیاریی پتر و فراوانتری پێشکەش کردووە.

---

6- Kamil Erdeha, Milli Mücadelede Vilayetler ve Valiler, İstanbul, 1975, s.388.

7- Ekrem Cemil paşa, Muhtasar Hayatım, Brüksel, 1989, s.20.

بە پێی ئەو سەرژمێرەی شارەوانیی ئەستەمبوڵ لە نێوان ساڵانی (١٩٣١-١٩٣٢) دا ئەنجامی داوە، نزیکەی کۆمەڵێکی (١٦٧٣) کەسیی کوردزمان لە هەندێك ناوچەی ئەستەمبوڵدا ژیاون، لەمانە (١٢٦٢) پیاو و (٤١١) ئافرەتیان تێدا بووە. ئەم جۆرە سەرژمێرە رەسمییانە ژمارەی هەموو ئەو کوردانە پیشان نادەن کە لە ئەستەمبوڵ دەژیان. چونکە بەر لەم ساڵانە وەکو باسمان کرد، دەیان هەزار کورد لە ئەستەمبوڵدا ژیاون. بەڵام لەگەڵ زمانانی دیکە پێکەوە، لەم سەرژمێرەدا بۆ یەکەم جار زمانی کوردی وەك زمانێکی سەربەخۆ پیشان دراوە کە ئەمەش گرنگیی خۆی هەیە. بە پێی ئەم سەرژمێرانە، بوونی کورد بە پەرت و بڵاوی بە هەندێك ناوچەدا، بەم شێوەیەیە:

| ناوچە | پیاو | ئافرەت |
|---|---|---|
| ئەستەمبوڵ (فاتح، ئەمینونو) | ٧١٣ | ١٨٦ |
| دوورگەکان | ١٤ | ١ |
| بەکر کوێی | ٣١ | ٤ |
| بەیۆغلو (بێشکتاش، ساری یێر) | ٣٣٠ | ١٩٢ |
| ئویسکویدار | ١٧٤ | ٢٨ |
| **کۆی گشتی** | ١٢٦٢ + ٤١١ = ١٦٧٣ | |

سەرژمێری ئەوانەی لە ناوچە جیاکانی ئەستەمبوڵدا دەژین، بە پێی زمانی دایکیان لە سەرژمێرەکاندا تۆمار کرابن، بۆ یەکەم جار دوای ساڵانی (١٩٣٠) بەرچاو دەکەوێت. دواتر ئەو سەرژمێرانەی کە سیمبۆلیکیش بێت ئاماژە بۆ هاوولاتییانی بە کوردی ئاخەڤ کراوە. بە پێی ئەو زانیارییانەی لەم جۆرە خشتانەدا جێیان کراوەتەوە، لە ئەستەمبوڵدا ئەم زمانانە قسەیان پێ کراوە: تورکی، روومی (رۆمی)، ئەرمەنی، فەرەنسی، ئیتاڵی، ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی (عەجەمی)، عیبری (جوولەکانی)، چەرکەسی، کوردی، تەتەری، ئەڵبانی (زمانی ئەرناووت)، بولگاری. بە پێی سەرژمێرەکانی ساڵانی (١٩٣٤-١٩٣٥) لە



ئەستەمبووڵدا ژمارەی ئەو هاونیشتمانییانەی بە کوردی دەدوێن، بووەتە (٢٠٩٥) کەس. لەمانە (١٦٦٨) یان پیاو و (٤٢٧) یشیان ئافرەتن.

لە سەرەتای سەدەماندا، دەمانێك کورد کە نزیکەی (٣٠) هەزار کەس بوون، ئەمڕۆ لە سەرووی (٣) ملیۆن کەس دەقەسرێنرێن. تەنانەت سەرچاوەی ئەوتۆش هەن کە سەرژمێری کورد بە نزیکەی (٤) ملیۆن دادەنێ. بەجۆرە، بە نزیککراوی، سەرژمێری کورد لە ئەستەمبوڵدا لەم دەمەدا وا دەردەکەوێ (١٠٠) ئەوەندەی جاران زیادی کردبێ. ئێستا نزیکەی (٣-٤) ملیۆن کورد لە ئەستەمبوڵدا دەژی، هەڵوێستی هەندێك گەڕەك کە کوردی لێ دەژی، بوونی کورد بە چڕی و پەرەسەندنی لە ئەستەمبوڵدا پیشان دەدا. بە شارستانی بوونی چەواشە، لە ئەستەمبوڵدا دیاردەی شەونشینی- ی لە هەندێك لادا هێناوەتە گۆڕێ، یان ئەو کوردانەی لە کووچە دواکەوتووەکانی شاردا درێژە بە ژیانیان دەدەن، دۆخەکەی هێناوەتەسەر بارێکی ئەتنیکیی ئەوتۆ کە لە بارودۆخی بەر لە ساڵانێك جودایە کەوا رووەکان لە نەخشەی ئەتنیکیی ئەستەمبوڵدا لە پلەی یەکەمدا دەبینران، دیمەنی ئەم سەردەمەی ئەستەمبوڵ تەواوێك گۆڕاوە.

لە سەرەتاکانی ساڵانی (١٩٠٠)دا سەرژمێری کورد کە نزیکەی (٣٠) هەزار کەس بووە، لە (١٩٥٠)دا بووەتە نزیکەی دوو ئەوەندە و گەیشتووەتە (٦٠) هەزار کەس. لەبەر رۆشنایی ئەو سەرژمێرانەی لە بارەی کۆچوباری کوردەوە کراوە بۆ ئەستەمبوڵ. (ئۆیا بایدار) کە هەندێك بەراوردی ئەنجام داوە، بە پێی سەرژمێری ساڵی (١٩٩٠) ئەوانەی لەو ناوچانەوە هاتوونەتە ئەستەمبوڵ کە زۆرینەیان لە کورد پێکهاتووە، ژمارەیان گەیشتووەتە یەك ملیۆن و سەد هەزار کەس، هەروەها دەڵێ: ((.. ئەو کۆچبارەی لە خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتەوە هاتبوو، نەخشەی دوا کۆچەکانی بەرەو ئەستەمبوڵ روون دەکاتەوە و دەهێنێتە گۆڕێ. ساڵی (١٩٥٠) نزیکەی (٥٪)ی ئەوانەی لە ئەستەمبوڵ دەژیان کە لە دایکبووی خۆرهەڵات و باشووری خۆر هەڵاتن، ئەم رێژەیە دوای (١٠) ساڵ، واتە ساڵی (١٩٦٠) دەبێتە (٧٪). ساڵی (١٩٧٥) نزم دەبێتەوە بۆ نزیکەی (٥,٧٪)، کەچی ساڵی (١٩٨٠) نزیکەی (٥٨٠) هەزار لەوانەی لە ئەستەمبوڵدا دەژین لەو ناوچانەوە هاتوون. ئەم کۆمەڵەی رێژەی (١٢٪)ی سەرجەم سەرژمێری ئەستەمبوڵ رەت دەکا، نێوانی ساڵانی (١٩٧٥-١٩٨٠) چڕیی کۆچباری

له خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتەوە پیشان دەدا، (١٩٨٠-١٩٩٠) کۆی ئەم سەرژمێرە لە هەر کوێیەك بێ بۆ دوو ئەوەندە بەرز دەبێتەوە. له (١٩٩٠)دا، له ئەستەمبوولدا (١٥٪)ی سەرژمێر، ئەوانە پێکیدەهێنن که له خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتەوە هاتوون. لەناوچەکەدا هەر لە مێژە ئەو شارانەی کۆچەری پتری بۆ ئەستەمبووڵ ناردووە، ئەمانەن: ئەرزنجان، مەڵاتییە، ئەلازگ، سعرت، دوای ساڵی (١٩٨٥) (قارس) له ریزی پێشەوە دەوەستێت و ئەرزنجان، بینگۆیل، تونجێلی، ئەرزەڕۆم و دیاربەکریش دەبنە سەربار..))[٨].

ئەگەر تێکڕای ژمارەی ئەو کوردانەی له ئەستەمبووڵی کۆندا ژیاون، به سەرژمێری کوردی ئەستەمبووڵی ئەمڕۆ بەراورد بکەین، ئەوا دەبینین ئەستەمبووڵ (شارێکی کوردانە). ساڵی (١٩٩٨)، سەرژمێری کورد کە لەم رۆژانەی تێیدا دەژین، دەبێ ئەو ژمارانە بەرزتر بووبنەوە. ئەو گێرەوکێشە سیاسییە و ئەو سیاسەتی کۆچ پێکردنەی لەو ژینگەیەدا هەیە که کوردی تێدا دەژی. لەم سەردەمەماندا شێوەی کۆچی به کۆمەڵی پێکهێناوە. بەرەو شارە گەورەکان، کە ئەستەمبووڵ له ریزی پێشەوەیاندایە. (فیلیپ مانسەل)، ئەم تەقینەوە سەرژمێرییەی کوردەی له ئەستەمبووڵدا گەییوەتە له سەدا (٢٠-٣٠)، به یەکێك لەو دۆزە گرنگانە دادەنێ که لەبەردەمی ئەستەمبووڵدا قوت بووەتەوە. ئەو ژمارەیەی (یەك) ملیۆن و (١٠٠) هەزار کوردەی له ساڵی (١٩٩٠) دا له ئەستەمبووڵ دەژیان، هاوتای سەرژمێری هەموو ئەستەمبووڵی سەد ساڵ لەمەو پێشە. لەسەرەتای سەدەماندا سەرژمێری ئەستەمبووڵ نزیکەی دەوروبەری یەك ملیۆن دادەنرا.

8- Oya Baydar, 1950 Sonrası Göç Dünden Bugüne İstanbul Ansiklopedisi, Cild: 3. İstanbul'daki nüfus hareketliliği konusunda Prof. Ferhunde Özbay'ın yayımlanmış İstanbul Nüfusu adlı bir çalışması bulunmaktadir. Erol Tümertekin, İstanbul'da Nüfus Dağılışı, İstanbul, 1979. Ayrıca E. Tümertekin & N. Özgüç, İstanbul Nüfusunun Doğum yerlerine Göre Dağılışı, İTÜ Mimarlık Fakültesi Şehircilik Enstitüsü Dergisi, no 20-21.



وەك دەبینرێ، رەوتی بە کوردبوونی ئەستەمبووڵ که سەدان ساڵی خایاندووە و ئەم کۆمەڵە کوردە، لەم سەردەمەماندا له مۆزاییکی ئەستەمبووڵدا یەك لە بەردەکانی بناغەی شارەکە پێکدەهێنن. ئەمڕۆ له هەموو گۆشەیەکی ئەستەمبووڵدا دەکرێ کورد ببینرێ. ئەم هەڵوێستە، شیعرێکی (ئەتائۆڵ بەهرامۆغڵو)مان بیردەخاتەوە که بەر له ساڵانێك له بارەی ئەستەمبووڵەوە نووسیویەتی و دەڵێ:

**کۆڵانەکانی (کیرازڵی مەسجید)**

...

**له رێی گەڕانەوەی له کارگەوە**
**کیژ رەت دەبن به جلی رەنگ چووەوە**
**هەرزەکاران له سەرە کووچەکاندا**
**بە کوردی، شتێلێك دەڵێن**

...

**کۆڵهەڵگرێکی سەد ساڵە**
**زۆرانبازیی لەگەڵ سەد کیلۆ دەکرد**
**کوڕگەلێکی زۆر بچووك**
**لەسەر گوفەکدا جنێوبازییان دەکرد**[١*]

[١*] دەقە تورکییەکەی ناو کتێبەکە ئەمەیە:

**Kirazlı Mescit Sokaği**

…

**Fabrika Dönüşü, yorgun Kırılmayla**

بەڵێ ئەمجارەیان، بۆ دووەم جار، بە هەر شێوەیەك بێ، گرتنەوە و فەتحی ئەستەمبووڵ لە لایەن کوردەکانەوە دەبینین. ئەم چڕبوونی سەرژمێرە، وەکو کات، سەدان ساڵی خایاندووە، لە خوارەوە وەك مێژوو هەوڵ دەدەم بە کورتی رایانبگەیەنم، هێرشی کوردان بۆ ناو ئەستەمبووڵ وەکو لەمەودوا دەبینین وا بە ئاسانی نەکراوە. ئەو کوردانەی لەو کوردستانەوە بۆ ئەستەمبووڵ کۆچ دەکەن کە، دەستکورتی، بێکاری، پەشێوی و ئاڵۆزیی سیاسی دەستی بەسەردا گرتووە. ئەمجارەیان لێرە لە ئەستەمبووڵ رووبەڕووی گیروگرفتی دیکەو نوێ دەبنەوە. تا دواڕادە زەحمەتە هەر لە ئێستاوە بڕیاری ئەوە بدرێ دۆزی ((بە کورد بوونی)) ئەستەمبووڵ، یانیش بە ((ئەستەمبووڵی)) بوونی کورد لە داهاتوودا چ شێوەیەکی دەبێ. دەکرێ هەندێك گرفتی کەسایەتی، یان شێوەی کەسایەتیی نوێ لەمەودوا کە دەردەکەوێ بیڕێنینەوە، بەڵام ئەوەی دیارە ئەوەیە کە ئەم شارە گەورەیە، بەتایبەتی لەمەیدانی ژیانی کولتووریی بەر لە سەدان ساڵ و وەکو ئێستا لە داهاتووشدا لە گۆشەنیگای کوردەکانەوە ئەرکێکی بە بایەخ لە ئەستۆ دەگرێ. چونکە ئەستەمبووڵ بووەتە شاری کولتوورێکی گشتگیر و بووەتە مەڵبەندێکی گرنگی کۆبوونەوەی کولتوورەکان. ئەم پێکهاتە کۆسمۆپۆلیت و رەگەز جیاوازەی ئەستەمبووڵ بە پێچەوانەی خەیاڵپڵاوی ئامانجەکانی بزووتنەوە تۆتالیتارییەکانە کە لە مەیدانی مەبەستی پێگەیاندنی مرۆڤی تاك نموونەدا هەیەتی. تەنانەت سوڵتان محەمەدی فاتیح-ی داگیرکەری ئەستەمبووڵیش لە ساڵی (١٤٥٣)دا پێی نەکراوە پتر دەست لە کولتووری خاوەنە کۆنەکانی ئەستەمبووڵ بدا.

---

**Geçer Solgun giysili Kızlar**
**Kürtçe bir şeyler konuşur**
**Köşe başlarında delikanlılar.**

**...**

**Yüz yaşında bir hamal**
**Yüz kiloyla didişir**
**Minnacık oğlanlar**
**Çöplükte küfürleşir.**



## سێ گوندی لە ئەستەمبووڵدا رۆنراوی کورد

لە سەردەمی (سوڵتان محەممەدی فاتیح) دا، ئەستەمبووڵ بەسەر چوار (قازییەتی) دابەشکراوە. یەکیان (ئەییووب)ە کە مەڵبەندی قەزای (خاسلەر) پێکدەهێنێ. بەم هۆیەوە، ئەم مەڵبەندە (قازییەتیی خاسلەر)یشی پێ دەگوترا. سەدان گوندی بەسەرەوە بووە، بە پێی بەڵگە مێژووییەکان، هەندێك لە کوردەکان رێك (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر بۆ ئەم قەزا دوورە، دەشتەکییەی ئەستەمبووڵ دوور خراونەتەوە.

بە پێی دەفتەری تۆماری ساڵی (١٤٩٨)ی قەزای (خاسلەر) لەبەری ئەورووپای ئەستەمبووڵدا، لەناو سنووری ویلایەتەکەدا دامەزرانی سێ گوندی کوردمان بەرچاو دەکەوێت. ئەم سێ دێیە کە ناویان: دانشمەندلو، دەپەویران و ئیشیقلی - یە و ئەوە روون کراوەتەوە کە ئەو کوردانەی لەم گوندانەدا بوون، بۆ ئێرە دوور خراونەتەوە و هەروەها خەریکی بازرگانی بوون.

ژمارەی ئەم کوردانەی لەم گوندانەدا بوون گەییوەتە (٣٨٢) کەس. لەمانە ژمارەیان لە نیوە نزیك بکرێتەوە (١٦٣) یان ئافرەتن، گەورەترینی ئەم گوندانە (دانشمەندلو)ە. دەفتەری تۆماری ساڵی (١٤٩٨)ی قەزای (خاسلەر) لە بارەی گوندەکەوە دەڵێ: ((کوردن، لەو بەرەوە، لە گۆلی (ئەعیان)ـەوە دوور خراونەتەوە، جووتیاری ناکەن و بازرگانی دەکەن، لە کێڵگەکانەوە هیچ بەروبوومێکیان بە دەستەوە نییە)).

لەبارەی (دەپەویران)ی گوندی دووەمەوە هەر لەو بەڵگەنامەیەدا ئەم روون کردنەوانە جێیان گرتووەتەوە: ((کوردن، لەو گوندەی ئەنادۆڵەوە دوور خراونەتەوە کەناوی (دۆکورجون) بووە)). لە بارەی گوندی ئیشیقلی- ی سێیەمیشیانەوە ئەم روون کردنەوەیە بەخۆوە دەگرێ: (( کوردن، لە (ئابی سوفییە)وە دوور خراونەتەوە)). ئەم کوردانەی لەم خاکەدا نیشتەجێ کراون دەتوانین بە دیلی دوورخراوەیان دابنێین. ئەو کەسەی بۆ یەکەمجار لە بارەی ئەم گوندە کوردانەوە کە لە ئەستەمبووڵدان ئاگاداری کردینەوە، پرۆفیسۆر عومەر لوتفی بەرکان - ی ئەندامی پەروەردەی کۆلێژی ئابووریی زانکۆی ئەستەمبووڵ بوو، ساڵی (١٩٣٩) لە گۆڤاری کۆلێژی ئابووریدا وتارێکی بەناوی - شێوەکانی ئۆرگانیزیۆنی (ڕێکخستنی) کرێکارانی خاك (کشتوکاڵ) لە سەدەی (١٥-١٦)ی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا- ی بڵاوکردەوە و لە بارەی تەنیا دوو گوندی ئەم کوردانەوە کە (دانشمەندلو و ئیشیقلی)ن چەند روون کردنەوەیەکی کورتی خستووەتەڕوو و

بازی بەسەر گوندی سێیەمی (دەپەویران)دا دابوو، نەك تەنیا ئەم گوندە، بەڵكو باسی هەندێك گوندی موسڵمانی دیكەشی لە لێكۆڵینەوەكەیدا بە بەرچاوەوە نەگرتووە. دوای نزیكەی (٦٠) ساڵ ئەمجارە پرۆفیسۆر ستیفان یەراسیمۆس كە یەكێكە لە لێكۆڵەرەوەكانی ئەنستیتووی فەرەنسیی لێكۆڵینەوەكانی ئەنادۆڵ. ساڵی ١٩٩٨، لەو لێكۆڵینەوەیەیدا كە بەناوی (قەزای خاسلەر لە كۆتاییەكانی سەدەی پانزدەهەمدا) وەی نووسیوە، سەر لە نوێ دەفتەری تۆماری ساڵی (١٤٩٨)ی كە لە بارەی قەزای خاسلەر- ەوەیە بە بەرچاوەوە گرتووە. ستیفان یەراسیمۆس كە لەبەر رۆشنایی زانستە دیموگرافییەكاندا لێكدانەوەكەی كردووە، وردەكاری و زانستیی رێكوپێكتری لەبارەی (١٨٠) گوندو كۆمەڵەوە كە لە دەفتەرەكەدا جێیان بووەتەوە بە خوێنەران رادەگەیەنێ، لەم لێكۆڵینەوەیەدا هەندێك زانیاریی روونكەرەوە لەبارەی سەرژمێری ئەو كوردانەوە كە لەم سێ گوندە باس لێوەكراوانەدا ژیاون بەمجۆرە ریزكراون:

١. ژمارەی كرێكاری پیاوی پێگەییو.

٢. ژمارەی پێگەییوان كە باجیان لێ وەرگیراوە.

٣. ژمارەی تێكڕای كرێكاری پیاو.

٤. ژمارەی كرێكاری ئافرەتی پێگەییو.

٥. ژمارەی تێكڕای كرێكاری ئافرەت.

٦. ژمارەی تێكڕای كرێكار.

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گوندی دانشمەنلو | ٥٨ | ٥٨ | ١٠٣ | ٥١ | ٦٧ | ١٧٠ |
| گوندی دەپەویران | ٢٩ | ٢٩ | ٢٨ | ٢٨ | ٤٦ | ١٠٧ |
| گوندی ئیشیقلی | ٣٣ | ٣٢ | ٣١ | ٣١ | ٥٠ | ١٠٥ |
| **كۆی گشتی** | ١٢٠ | ٢١٩ | ١٦٢ | ١١٠ | ١٦٣ | ٣٨٢ |



بەمجۆرە لە سایەی ئەم دوو لێكۆڵینەوەیەی عومەر لوتفی بارقان و ستیفان یەراسیمۆس - ە، یەك لە ئەڵقە كۆن و گرنگەكانی كۆچی كوردان بەرەو ئەستەمبوڵ روون دەبێتەوە. لە بارەی هۆیەكانی دوور خستنەوەی ئەم (٣٨٢) كوردەوە بۆ ئەستەمبوڵ و نیشتەجێ بوونیان لە نزیك ئەستەمبوڵەوە و بە تەواوی زانینی ئەو شوێنەی لێی هاتوون و بەسەرهاتی دواتریان و وردە زانیاریی دیكەیان لەبەر دەستدا نییە. لەو سەرژمێرەدا كە لە سەدەی (١٥)دا، واتە لە ساڵی (١٤٩٨)دا ئەنجام دراوە و بە (٣٨٢) كورد سەرژمێر كراون هێشتا بە تەواوی نەزانراوە كەی هاتوونەتە ئەستەمبوڵ. لەم بارەیەوە ستیفان یەراسیمۆس ئەم روونكردنەوەیە دەدا: ((دەتوانین بڵێین بە تایبەتی نیشتەجێ كردن لە دەوروبەری ئەستەمبوڵدا یەكسەر دوای گرتنی ئەستەمبوڵ، تەنانەت بەر لە نیشتەجێ كردنی خەڵكی بە فراوانی لەناو ئەستەمبوڵیشدا دەستی پێ كردووە. بۆ نیشتەجێ كردن، سەرەتا دیلەكانی جەنگ بەكارهێنراون. بەمجۆرە بۆ بووژاندنەوەی ئەو زەوییانەی بێ خاوەن و بێ بەروبووم ماونەتەوە. پەیدابوونی كەرەستەی مرۆڤ، كە لە سەردەمی جەنگ و هەراكاندا بەدەست دەكەوتن، كاری بەكارهێنانی ئەو كۆمەڵە ئاپۆرانەی مرۆڤە، هاتووەتە گۆڕێ.

ئەو زەوییانەی (تەركۆس) و دەوروبەری كە سەر بە وەقفی سوڵتان محەمەدی فاتیح-ە، دیارە ناوە ناوە لە لایەن كوردەكانەوە دەستیان بەسەردا گیراوە. لەم بابەتەدا هەندێك رێكخستنی یاسایی بۆ كراوە. لەو بەڵگەنامەیەدا كە لە سەدەی هەژدەدا بەناوی ((حوكمێك لە بارەی تازەكردنەوەی حوكمی پێش لێ گرتنی (قەدەغەكردنی) ئەو دەستدرێژییانەی لە دیوار و هەرچییەكی دیكەی تایبەت بە ئاژەڵ و زەویی ئازادی ناو ئاغەڵی كۆشكدا هەیە، لە تەركۆس)) باسی كوردیشی تێدایە.

هەروەها گەلێك بەساڵداچووش هەن باسی زۆر لەمێژە هاتنی كورد بۆ ئەستەمبوڵ دەگێڕنەوە، یەك لەمانەی ئەم باسە سەر زارەكییە دەگێڕنەوە، لە ناوچەی (شەهرەمینی — شەهرئەمینی) دا بینیم (تەوفیق چاپالار)ە. بە پێی قسەی دایكی كە كوردی مەلاتییەیە، كوردەكان سێ سەد ساڵ لەمەوبەر لەم ناوە نیشتەجێ بوون و گوایە بە مانگا بەخێوكردن گوزەرانیان دابین كردووە. هەندێك لەو كوردانەی لە كۆڵانەكانی (نەجەف) و (گایە)ی (شەهرەمینی) دا نیشتەجێ بوون، لێرە لە دایك بوون و گەورەبوون. پێشتر ناوی كۆڵانی (گایە) لە رابەرەكانی شاردا و لە

تۆمارەکانیدا بە کۆلانی کوردەکان تۆمار کراوە. ئەم ناوە دواتر گۆڕاوە و ناوی گایەی وەرگرتووە. لە شەهرەمینیدا کوردێکی زۆری مەلاتییەیی هەر لە کۆنەوە نیشتەجێ بوون و ماونەتەوە. کوردەکانی (عەرەبگیر)یش زۆرینەن.

## پێشەنگەکانی ئەوانەی هاتوونەتە ئەستەمبوول

دوای ئەوەی ساڵی (١٤٥٣) ئەستەمبوول لە لایەن سوڵتان محەممەدی فاتیحەوە گیراوە، بونیادی دیموگرافیکی ئەم شارە مێژووییە تەواوێك گۆڕاوە، راستتریش ئەوەیە، زانایانە گۆڕاوە. لە سەرەتادا زۆرینەی زۆری دانیشتووانی شار دیانەکان پێکیانهێناوە. دوای ئەوەی سوڵتان محەممەدی فاتیح ئەوێی گرتووە، کردەوەی بە موسڵمان کردنی شار گورجتر راپەڕێنراوە. کۆچکردنی خەڵکی لە هەر لایەکی ئەنادۆڵەوە بەرچاو دەکەوێ، لەم بارەیەوە فەرمان و یاسا گەلێك دەردەکرێت. بەرە بەرە سەرژمێری شار پتر دەبێ. بەمجۆرە، ئەستەمبوول شێوەی شارێکی فرە نەتەوە وەردەگرێ. فرە کولتووری دەبێتە یەکێك لە تایبەتمەندییە هەرە دیارەکانی شار. رۆم، ئەرمەن، جوو، تورك، ئەرنائووت (ئەڵبانی)، عەرەب، چەرکەس، ئێرانی و کورد، ئەو کۆمەڵە ئەتنیکییە سەرەکییانە پێکدەهێنن کە لە ئەستەمبوولدا دەژین. بیروباوەڕ و کولتوور دەست بە زۆربوونەوە دەکەن و دەخرێنە ژێر چاودێریی دەوڵەتەوە.

بەر لە گرتنی ئەستەمبوول، هیچ زانیارییەکمان بە دەستەوە نییە. لەم بارەیەوە چاوگێڕان بەو کتێبە شیعرەی (گوننار ئەکەلۆف)ی شاعیری سوێدی-یەدا کە ساڵی (١٩٦٥) نووسیویەتی سوود بەخشە. لەم کتێبەدا کە بە ناوی (دیوانێك لە بارەی میری ئەمگیۆن-ەوە)یە، چیرۆکی بەگزادەیەکی کوردی تێدایە، لە جەنگی ساڵی (١٠٧١)ی لای شاری (مەلازگرد)[٢*]دا لە لایەن بیزەنتییەکانەوە بە دیل گیراوە و دواتر هێنراوەتە ئەستەمبوول. ئەم بەگزادە کوردە، چوار پێنج

[٢*] ئەو جەنگەیە لە نێوان سەلجووقییەکان و بیزەنتییەکاندا بووە و تێکشکانی لەشکری بێزەنتی بۆ یەکەمجار تورکی سەلجووقی لە سنووری خۆرهەڵاتی تورکیای ئێستاوە چوونەتە ناوەوە..

ئەم رووداوەی ئێرە نموونەیەکی دیکەی وەك سووتەمەنی بەکارهێنانی کوردە، بێ ئەوەی بەرژەوەندییەکی بۆ خۆی تێدابێ، یان کەس منەتی پێی بێ و.. تەنانەت بێ ئەوەی هەر ناویشی بهێنرێ (وەگێڕ).



ساڵ لە زیندانی (ڤلاچێرنە)ی ئەستەمبوولدا بە دیلی دەمێنێتەوە. ئەشکەنجەیەکی زۆر دەچێژێ. بەر لە ئازاد کردنی، چاوەکانی هەڵدەکۆڵرێ. لەگەڵ ئافرەتێکی (کیژ)دا بەرەو (وان)ی شاری خۆیان بەڕێ دەکەوێ. دوای ئەم بەدکارییانە، بەگزادەی کورد بە دەم وڕێنە کردنەوە هەر دەڵێ: ((جارێکی دی، هەرگیز .. کۆنستانتینۆپڵ!)) و نەفرەت بەسەر ئەستەمبوولدا دەبارێنێ. بەڵێ ئەم سەفەرەی ئەستەمبوولی بەگزادەی کورد بۆ یەکەم جار بە هاوڕێیەتیی شیعر سەرنجمان بۆ بابەتی بیزەنتی و کۆنستانتینۆپڵ و کورد رادەکێشێ. گوننار ئەکەلۆف بۆ ئەوەی شێوەی کۆتایی بە دیوانەکەی ببەخشێ، بەهاری (١٩٦٥) هاتووەتە ئەستەمبوول و لە هەندێك شوێنی مێژوویی هەر لە جێی خۆیدا کۆڵیوەتەوە.

کۆچی کورد رووەو ئەستەمبوول هەر لە (١٤٥٣)ی ساڵی گرتنییەوە هەمیشە درێژەی بووە و لە شێوەی شەپۆلدا تا ئەمڕۆمان بەردەوام بووە. دوای (١٤٥٣)ی ساڵی گرتنی ئەستەمبوول لەلایەنسوڵتان محەممەدی فاتیح-ەوە، وەك لەسەرەوە باسمانکرد، کۆچی موسڵمانان بەرەو ئەم شارە، زانایانە پەرەی پێ دراوە. لەناو گرووپەکانی ئەم موسڵمانانەدا کوردیش هەن. دوای ئەوەی سوڵتان محەممەدی فاتیح ئێرەی بە دەست خست، ژمارەی ئەو کوردانەی تاك تاك یان لە شێوەی گرووپدا هاتوونەتە ئەستەمبوول رۆژ بە رۆژ دەست بە پتر بوون دەکا.

بە پێی ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوەکاندا جێیان گرتووەتەوە، یەك لەوانەی لە پێشەنگەکانی ئەو کوردانە بووە کە هاتوونەتە ئەستەمبوول، (مەلا گۆرانی)یە کە بە مامۆستای فاتیح (سوڵتان محەممەدی فاتیح- وەرگێڕ) دەژمێررێ. مەلا گۆرانی ساڵی (١٤١٠) لە ناوچەی شارەزووری عێراقدا هاتووەتە جیهان. لە شارە گەورەکانی وەکو: بەغدا، شام، قودس و قاهیرەدا ماوەتەوە و لەو ناوانەیدا خوێندووە.

مەلا گۆرانی کە بە شیهابوددین ئەحمەد و جار نا جاریش بە ئەحمەدی گۆرانی ناسراوە. لەسەر داوای سوڵتان موڕادی دووەم، ساڵی (١٤٤١) دێتە ئەنادۆڵ و ساڵی (١٤٤٢) لەمەدرەسەکانی[٣*] شاری (بورسە) دەست بەکار کردن دەکا. ساڵی (١٤٤٣) دەبێتە

[٣*] مەدرەسە: ئەو مزگەوتانەی خوێندنی ئایینییان تێدا ئەنجام دراوە (وەرگێڕ).

ماموٚستای سولّتان موحەممەدی فاتیح کە ئەوسا لە (مانیسە) بووە. لەسەردەمی گرتنی ئەستەمبوولّدا مەلا گوٚرانی تێکەلّ بەو یەکە سەربازییانە بووە کە لە (ئەدرنە)وە بەرەو ئەستەمبوولّ چوون، تەنانەت بیروٚکەی گرتنی ئەستەمبوولّ بوٚ یەکەمجار لە لایەن ئەمەوە بە سولّتان راگەیەنراوە و لەم بارەیەوە قسەی ئەوتوٚ هەیە، گوایە مەلا گوٚرانی، یەك لەو کەسانە بووە، گرتنی ئەستەمبوولّیان بە سولّتان سەلماندووە. دوای ئەوەی ئەستەمبوولّ دەگیرێ، مەلا گوٚرانی لە (قازییەتیی عەسکەری) دادەمەزرێ. دواتر ماوەیەك لە بورسە فرمانی پێ دەدرێ. لەوێوە دەچێتە قودس. دووبارە دەچێتەوە ئەستەمبوولّ، گوٚرانی کە شوێنی زوٚر گەڕاوە، لە (١٤٨٠) دا کراوەتە شەیخولئیسلام، دوای سالّێك، سولّتان محەممەدی فاتیح کە قوتابیی بووە، کوٚچی دوایی دەکا. مەلا گوٚرانی، ئەم کارەی (شەیخولئیسلامەتییە)ی تا سالّی (١٤٨٨) بەڕێوە بردووەو هەر لەو سالّەدا کوٚچی دواییی کردووە.

لە هەموو سەرچاوەکاندا مەلا گوٚرانی بە کەسێکی خێرخواز ناسراوە. مزگەوتێکی زوٚر، مەدرەسە و دامەزراوەی خێرخوازیی کردووەتەوە، هەندێك لەمانە لە توانایاندا بووە تا ئەم سەردەمەی دواییانەدا بمێنن. ناوی مەلا گوٚرانی بە هەندێ لەم دامەزراوانەی لە ئەستەمبوولّدان و بەشوێنەکانیان دراوە. لە ئەستەمبوولّ مزگەوت (جامیع)، نوێژگا (مەسجید)، گەڕەك، شەقام و کاروانسەرامان بەرچاو دەکەوێ، ناوی مەلا گوٚرانییان پێوەیە. لە کوٚنەوە خانی مەلا گوٚرانی و مەدرەسەی مەلا گوٚرانی لە ناوچەی (ئەمینوێنو) دا هەبووە. شەقامی مەلا گوٚرانی و گوٚڕی مەلا گوٚرانی لە (فندقزادە) دایە و مزگەوتی کەنیسەی وەفا کە لە (وەفا) دایە هەر ئەو مزگەوتەیە کە بە مزگەوتی مەلا گوٚرانی دەناسرێ. بە لای (ئەکرەم حەققی ئایڤێردی)یەوە ئەو شوێنانەی ناوی نوێژگەی مەلا گوٚرانی و گەڕەکی مەلا گوٚرانی-یان لێ نراوە، دوای سەردەمی فاتیح هاتوونەتە ناو مێژووەوە. مەلا گوٚرانی لە سەردەمی پاشایەتیی سێ سولّتان (مورادی دووەم، سولّتان فاتیح، سولّتان یاوز سەلیم) داو لە سێ پایتەختی گەورەی (بورسە، ئەدرنە، ئەستەمبوولّ)دا ژیاوە. لەو روانگەیەوە بایەخ بەدەست دەهێنێ، کە یەکێکە لەو کوردانەی بوٚ جاری یەکەم پێیان ناوەتە سەر خاکی ئەستەمبوولّەوە. مەلا گوٚران-یەئکە دەیان کتێبی داناوە. وەکی تریش نووسەرێکی بەناوبانگی سەردەمی خوٚی بووە. یەك لەوانەی بوٚ یەکەمجار کورد بوونی رەسەنی ئەتنیکیی مەلا گوٚرانی-ی روون کردووەتەوە، ف. بابنگەر-ی مێژوونووسی فەرەنسییە کە لە بارەی مێژووی عوسمانییەوە کوٚمەلّە توێژینەوەیەکی هەیە. تا ئێستا لە بارەی



مەلا گوٚرانییەوە لێوردبوونەوەیەکی زوٚری جیا جیاو توێژینەوە ئەنجام دراوە. یەك لەمانە لە لایەن ئەحمەد ئاتەش-ەوە ئامادەکراوە و لە ئەنسکلوٚپیدیای ئیسلامدا بلاّوکراوەتەوە. لە چاپە نوێیە ئینگلیزییەکەی ئەم ئەنسکلوٚپیدیایەدا هەر ئەو بابەتە ئەمجارەیان لە لایەن ژ.ڕ. والّش-ەوە چاوی پێداگێڕاوەتەوە و سەر لە نوێ نووسراوەتەوە. لەبارەی مەلای گوٚرانی و بەرهەمەکانییەوە نامەیەکی دوکتوٚرا هەیە کە، د.ساقب یلدز ئامادەی کردووە. هەروەها بەر لەوەی لێکوٚلّینەوەی مەلا گوٚرانی و لێکدانەوە (تەفسیر)ی قورئانی پیروٚز-ەکەی ساقب یلدز لە شێوەی کتێبێکدا بلاّوبکرێتەوە، لێکوٚلّینەوەیەکی دیکەی کە پەیوەندیی هەر بەم بابەتەوە هەیە، لە گوٚڤارێکدا بلاّوکرایەوە. جگە لەمە، ئەو باسانەی (سائیمە ئاك گوین) لە بارەی مەلا گوٚرانی-یەوە و ئەوەی (ناجی قەرەدەنز) کە لە بابەت گوٚڕەکانی مەدرەسەی مەلا گوٚرانی-یەوەی نووسیوە، دوو تێزی دەرچوونن پێشکەش بە زانکوٚی ئەستەمبوولّ کراون[٩].

ئەبو سسوعوود ئەفەندی (١٤٩١-١٥٧٥) یەکێکە لەو کوردانەی کە سالاّنێکی دوور- درێژ لە سەردەمی سولّتان سولەیمانی قانوونی و سولّتان سەلیمی دووەمدا شەیخولئیسلامەتیی کردووە.

9- Ahmed Ateş, Molla Gürani, İslam Ansiklopedisi, Cilt: 8, İstanbul, Dördüncü baskı, 1987, s. 406-408. J.R. Walsh, molla Gurani, The Encyclopaedia of İslam (New edition, vol. 11, 1965). F. Babinger, Mehmed der Eroberer und seine Zeit, 1953, s. 518. Sakıp yıldız, Molla Gürani ve İastanbul Fethindeki Rolü, Atatürk Üniversitesi İslami İlimler fakültesi Dergisi, no 3, 1979. Sakıp yıldız, Fatih'in Hocası Molla Gürani ve Tefsiri, İstanbul, Sahaflar kitap Sarayı yayınları: 5, yayın yılı burada belirtilmemiş. Saime Akgün, Molla Gürani, İstanbul Üniversitesi Edebiyat Fakültesi Tarih Bölümü Mezuniyet Tezi. Tez no 4409. Naci Karadeniz, Molla Gürani Medresesi Mezarları,= Molla Gürani, Cerrah Mehmed Paşa, Haseki Sultan ve Bayram Paşa ile nakşibendi medresesi mezarları. İstanbul, Üniversitesi Edebiyat Fakültesi Mezuniyet Tezi. Tez no 4147. 1965-66.

ئەبوسسوعوود ئەفەندی کە لە گوندی مودەرریس-ی دەوروبەری ئەستەمبوولّدا لە دایك بووە، کوڕی زاتێکە ناوی شێخ موحیّددین مستەفا بووە. بنەماڵەکەی لە (ئامێدی)یەوە، کە یەکێکە لە شارە کۆنەکانی باشووری کوردستان، کۆچی بۆ ئەستەمبووڵ کردووە، بەم هۆیەوە لە سەرچاوەکاندا بە ناوی ئەیو سسوعوود عەمادی-یەوە ناسراوە. ئەبوسسوعوود ئەفەندی لە ئەستەمبووڵ لە مەدرەسەکانی داود پاشاو مەحموود پاشادا کار دەکا. دواتر دوای ئەوەی لە ئەستەمبووڵ و شوێنانی دی قازییەتی دەکا. ساڵی (١٥٤٥) بە شەیخولئیسلام دادەمەزرێ. ئەبوسسوعوود ئەفەندی یەکێکە لەو پیاوە ئایینییە کوردانەی بیست و حەوت ساڵی رێك شەیخولئیسلامەتیی کردووە، کاتێك لە تەمەنی هەشتاو چوار ساڵیدا کۆچی دوایی دەکا، لە تەك ئەو قوتابخانەیەیدا دەنێژرێ کە لە (ئەیییووب)دا بە دروستکردنی داوە. لەلایەکی دییەوە ئەبوسسوعوود ئەفەندی بە زمانی جیا جیا کتێبی ئایینی و شیعری نووسیوەتەوە. شەقامێکی ناسراوی ئەستەمبووڵ کە لە نێوانی ناوچەی (سرکەجی)و (سوڵتان ئەحمەد) دایە، ناوی ئەوی لێ نراوە. بە پێی بۆچوونی ئیبراهیم عەلائەددین گۆیڤسا، لە (ئویسلویپ) مزگەوتێك و لە ئەستەمبوولّیشدا حەمامێك هەیە، بەناوی ئەوەوە دروست کراون.

یەکێکی دیی ئەو کوردانەی لە سەرەتاکاندا هاتوونەتە ئەستەمبووڵ ئیدریسی بتلیسی-یە (١٤٥٢-١٥٢٠). بنەماڵەی ئیدریسی بتلیسی کە بە یەك لە پیاوانی دەوڵەت و بە مێژوونووس ناسراوە، ماوەیەکی زۆر لە تەورێز (تەبریز) ماوەتەوە، کوڕی شێخ حیسامووددین بەگی بتلیسی— یە. دوای مردنی باوکی تەورێز بەجێ دەهێڵێ و ساڵی (١٤٩١) دێتە ئەستەمبووڵ و تێیدا نیشتەجێ دەبێ. لە سەر تکای سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤١٨-١٥١٢) بۆ نووسینی مێژووی عوسمانی. کتێبی (هەشت بە هەشت)ی ئامادە دەکاو دەبێتە هۆی ئەوەی ناوبانگێکی گەورە بە دەست بخات. دواتر کە یاوز سوڵتان سەلیم (١٤٦٧-١٥٢٠) دەچێتە سەر تەختی سوڵتانییەتی، لەو سەردەمەدا تەنگژە دەکەوێتە پەیوەندییەکانی ئێران-عوسمانی، بەناوی کوردانەوە دێتە لای عوسمانییان. بەمجۆرە ئەو پەیوەندییانەی نێوان ئیدریسی بتلیسی و سەرادا پتر پەرە دەستێنێ. ئیدریسی بتلیسی کە لە ساڵی (١٥٢٠)ی ساڵی مردنی یاوز سوڵتان سەلیم-دا مردووە، لە باخچەی نوێژگا (مەسجید)ێکدا، لە نزیك ئەو کۆشکەیدا کە



هەر بە ناوی خۆیەوە لەگەڵ چەشمەیەکدا[*٤] لە (ئەیووب)دا دروستی کردبوون و لە تەك زەینەب خاتوونی هاوسەریدا دەنێژرێ[١٠].. هەر چەند ئیدریسی بتلیسی وەك کەسایەتییەکی سیاسی لە خۆی دەدوێ، ئەو پتر وەکو مێژوونووسێك دەناسرێ. بەشدارییەکی زۆری لە نووسینی مێژووی عوسمانیدا کردووە. ئەگەر ئەو نووسینانەی بە عەرەبی و فارسی و تورکی نووسیونی و لە بارەی بابەتی جیا جیاوە دەیان دانراوی بە بەرچاوەوە بگرین و پێویست بەوە بکا بە زمانی سەردەم بدوێین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، ئیدریسی بتلیسی، زانایەکی ئەو سەردەمە بووە.

ئیدریسی بتلیسی کە ساڵی ١٥٢٠ کۆچی دوایی کردووە لە ئەیییووب دادەنیشت. لێرەدا بەناوی کۆشکی ئیدریسی-یەوە کۆشکێکی دروست کردبوو، لەم سەردەمەی ئێستاماندا شەقامێك و گەڕەکێکی ناوچەی ئەیییووب هەر بەم ناوەوە دەناسرێ. لە تەك شەقامی کۆشکی ئیدریسدا بە ناوی کۆڵانی ئیدریس-ەوە کۆڵانێکی لێیە. لە سەرچاوەکاندا باس لە قوتابخانەی ئیدریسی بتلیسی و مزگەوتی ئیدریسی بتلیسی-ش کراوە. چەشمەی (ڕایەت کەشان خەلیفە)ی سەر شەقامی کۆشکی ئیدریس لە لایەن ئیدریسی بتلیسی-یەوە دروست کراوە. لەبەر ئەوەی ساڵی ١٨٦٨ لە لایەن خەلّفە رایەت کەشان - ەوە نۆژەن کراوەتەوە، ئێستا بەم ناوەوە دەناسرێ. لە نووسراوێکدا کە لەسەر چەشمەکەدا چەسپێنراوە، ئەوە روون کراوەتەوە کە لە سەدەی (١٦)دا لە لایەن ئیدریسی بتلیسییەوە دروست کراوە. لە کتێبی (ئەیییووب سوڵتان، قاوەخانەی لۆتی و

(*٤) چەشمە: حەوزێکی داپۆشراوە، بەلووعە (بۆڕیی ئاو)ی بە دەوردایە، بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن و دەموچاو شۆردنی رێگوزاران، لە ناو مزگەوت و سەرە رێیاندا بە ئەندازەی رازاوە و جوان دروست دەکرێ .. (وەرگێڕ).

10- F. Babinger, Die Geschichtschreiber der Osmanen und ihre Werke, leipzig, 1927. Mehmed Chükri (şükri), Das Heyş Bihişt des idris Bitlisi- I. Teil: von den Anfangen biz zum Tode Orhans. Der Islam xıx, 1931. Hasan Tavakkoli, İdris Bitlisi'nin "Kanun-i şahenşahi" sinin Tenkidi, Neşri ve Türkçeye Çevirisi, basılmamış doktora tezi, IÜEF Tarih Bölümü, 1974. Mehmed Bayrakdar, Bitlisli İdris, Ankara, 1991.

دەوروبەری)ی م.مەسعوود کۆمان لە بابەتی ئیدریسی بتلیسیدا دەڵێ: ((کە لە بەردەمی چەشمەی گویمویش سویو- دا بە ڕێگاماندا بەردەوام بووین، بە دەستەچەپدا لەسەر بەنداودا ئیدریسی بتلیسی نێژراوە. لە پشت هەر ئەو بەنداوەدا ئەو مزگەوتە منارە کورتەی کە دەبینرێ هی زەینەب خاتوونی هاوسەری ئەم زاتەیە و بەهۆی نۆژەنکاریی جۆراوجۆرەوە تایبەتمەندییەکانی لە دەست داوە. بە خۆشی لەسەر ئەو بەنداوەدا نێژراوە کە هەر لەو ریزەدایە. ئەم بەنداو و بەربەستانە لە لایەن ئیدریسی بتلیسییەوە توندو پتەو کراونەتەوەو ڕێ لە ڕمان و داتەپینی خۆڵ گیراوە. هەر بە پێی ئەم سەرچاوەیە ئەییووب بە ناوی زەینەب خاتوونی هاوسەری ئیدریسی بتلیسییەوە چەشمەیەك و نوێژگایەکی لێ دروست کراوە. ئیدریسی بتلیسی نزیکەی بیست کتێبی داناوە، گرنگترینی ئەمانە ئەو لێکۆڵینەوە مێژووییەیەتی کە بەناوی (هەشت بە هەشت)ەوە لە بارەی مێژووی دەوڵەتی عوسمانییەوە ئامادەی کردووە. هەندێك زانیاریی بیۆگرافی لە بارەی هەشت سوڵتانی یەکەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە بە زمانێکی ئەدەبی لەم کتێبەدا تۆمار کراوە کە گەلێك روونووسی هەیە. هەندێك لە بەشەکانی ئەم کتێبەی وا بە فارسی نووسراوە، بۆ زمانی تورکیی عوسمانی وەرگێڕاوە. ئەم کتێبەی (هەشت بە هەشت)ە، کە یەکێکە لەو کتێبانەی بە دانسقە دەژمێررێن، روونووسێکی لە کتێبخانەی زانکۆی ئۆپسالای سوێددایە. وەرگێڕانە عوسمانییەکەی، هەندێك لە بەشەکانی ئەم کتێبە مێژووییە، لە بەشی دەستنووسەکانی خۆرهەڵاتیی کتێبخانەی میللیی سوێددا تۆمار کراوە. ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زۆر چاك پارێزراوە و بە بەرگی رەنگا و رەنگ بەرگ کراوە، لەو دەمەدا کە لێکۆڵینەوەیەکم لە بارەی پەیوەندییەکانی سوێد- کوردەوە ئامادە دەکرد لە سوێد، بۆم لواو بە بینینی ئەم کتێبە و وەرگێڕانە عوسمانییەکەی شادبووم. شەرەفخان کە یەکێکە لەو زانا کوردانەی بۆ یەکەمجار مێژووی کوردی نووسیوەتەوە، لە بارەی کتێبی هەشت بە هەشتی ئیدریسی بتلیسییەوە دەڵێ: ((..ئەم کتێبە لە جوانیی گوفتاردا، لە رەوانبێژیی دارشتنی رستەدا، بە پێشەکییە رەوان و درەوشاوەکەیدا تا بەرزترین پلە نرخدارە، دەتوانین بڵێین ئەمە لە جوانی و ڕێکوپێکیدا کتێبێکی بێ وێنەیە)). لە ڕێی شەرفنامەوە ئەوە تێدەگەین کە ئیدریسی بتلیسی، لەسەر داواکردنی یاوز سوڵتان سەلیم کتێبی مێژوویی (سەلیمنامە)ی نووسیوە، هەروەها شیعریشی داناوە. ئەمجا ئیدریسی بتلیسی، وەك شاعیرێك بەرەو روومان دەبێتەوە، یەك لەوانەی نووسەرایەتیی ئیدریسی بتلیسی بە بایەخدار دەزانێ: ف. بابنگەر- ە. هەندێك



لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە بارەی کتێبەکانی ئیدریسی بتلیسییەوە کراوە. **محەممەد** شوکری بە ئەڵمانی لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی هەشت بە هەشتەوە هەیە. حەسەن تەڤەنکۆللی ساڵی **١٩٧٤** لە بارەی ئیدریسی بتلیسی و کتێبی ((شاهەنشای قانوونی))یەوە تێزێکی دوکتۆرای ئامادە کردووە. بۆ دواجاریش لە بارەی ئیدریسی بتلیسییەوە کارێکی بیۆگرافیك لە لایەن **محەمەد** بەیراقدارەوە بە تورکی بڵاوکراوەتەوە.

بابەتێکی بە بایەخی دیکەش رووداوی بە خنکان (مردنی) دوو نەوەی ئیدریسی بتلیسییەوە لە ناوچەی غەڵەتەی ئەستەمبووڵدا. ئەمانە منداڵی ئەبولفەزڵ **محەممەد** ئەفەندیی کوڕی ئیدریسی بوون. شەرەفخانی مێژوونووسی کوردی بەناوبانگ، لە کتێبی شەرەفنامەدا ئەم بابەتەی هەندێك روون کردووەتەوە: ((ئەبولفەزڵ ئەفەندیی کوڕی مەولانا ئیدریسی تا دوا پلە پایە بەرزو ژیر بوو. لە سەردەمی سوڵتان سولەیمان خان - دا پایەی دەفتەرداریی[*٥] روومێلی- دا[*٦] بووە و ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە. دوو کوڕی هەڵبژاردەی هەبوو، بەڵام بەر لەوەی پێبگەن لە میوە و بەری هەردوو ئەم هەڵبژاردانە بێبەش بوو. رۆژێکیان لەگەڵ هەردوو کوڕەکەی سواری کەشتی دەبێ، لە بەری غەڵەتەوە دەهات. لەناکاوێکدا شەپۆلەکانی دەریا بەیەکدییانیدا داو بە توندی دەستیان بە هەڵچوون کرد. بەم هۆیەوە کەشتی وەرگەڕاو دوو کوڕی بوونە قوربانی و لە نێو شەپۆلە ناپاکەکانی دەریادا خنکان. هەردووکیشیان لە بەهاری منداڵێتیدا و لە سەرەتای لاوییاندا بوون و هێشتا لەم جیهانەوە کە، مانی بۆ نییە، بۆ ئەو جیهانەی لەناوچوونی نییە، هیچیان نەبەخشیبوو)). دواتر شەرەفخان لە بارەی ئەم رووداوە ناخۆشەوە ئەم دێڕە شیعرانە تۆمار دەکا: ((کەشتیی کەسێك کە بەو تۆفانەیەوە نوقم دەبێ کە رزگار بوونی لێ نییە، چنگی ئەو قەدەرەی لە بەرامبەرەوە دێ، لەناو ئاودا دەستی مەلەوان دەشکێنێ))[*٧]. بەلای

[*٥] دەفتەردار: دەفتەرگری داهات و خەرجیی حکوومەت، کارمەندی بەرپرسی کاروباری دارایی (وەرگێڕ).

[*٦] روومێلی (رووم + ئێلی): مەبەست لە نیمچە دورگەی بەڵکانە (وەرگێڕ).

[*٧] شیعرەکە لە رەسەنە فارسییەکەیدا دەڵێ:

**کشتی هرکس کە شد غرق بطوفان أو**

**پنجەء عکس اندر آب دست شناور شکست**

شەرەفخانەوە پێش ئەوەی ماوەیەکی بەسەردا بڕوا، بە کاریگەریی ڕووداوەکە، باوکیشیان دەمرێ. بە پێی ئەم ڕووداوە دەتوانین بڵێین لە سەدەی شانزەهەمدا هەندێك بنەماڵەی کورد پێکەوە لە ئەستەمبوولْدا بوون. بە لای **محەممەد** بەیراقدارەوە کوڕی ئیدریسی بتلیسی، ساڵی (١٥٤٢) بە دەفتەرداری ڕوومێلیی ئەستەمبووڵ دامەزراوە، تا ساڵی (١٥٧٦)ی مردنی هەر لە ئەستەمبوولْدا ژیاوە. لە حەوشەی مزگەوتی دەفتەرداری تۆپخانەدا کە بەناوی خۆیەوە دروست کراوە، نێژراوە.

کەسایەتییەکی دیکەی بتلیسی کە چووەتە ئەستەمبووڵ، شوکری - ی شاعیرە کە بەو شیعرە جوانانەیەوە ناسراوە کە نووسیونی. ئەم شاعیرە بە لای ف.بابینگەرەوە، لە بەشی دوایی کتێبی سەلیمنامەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە بنەماڵەیەکی کوردەوە هاتوون. شەرەفخان دەڵێ: شوکری دوای ئەوەی دەچێتە خزمەتی شەرەفخانی حوکمداری بتلیس- گۆڕاوە: ((دوای ئەمە هەڵوێستی گۆڕاو لە کۆتاییدا چووەتە کۆڕی تایبەتی سوڵتان سەلیم خان و وەك یاوەرێکی ڕیزی پێشەوەی لێ هاتووە)).

---

واتە:

کەشتیی هەر کەسێك بە تۆفانی ئەو نوقم بێ

چنگی ڕەنگدانەوەی ناو ئاوی (چنگی قەزاو قەدەر) دەستی مەلەوان دەشکێنێ.

مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی بەجۆرەی لێکداوەتەوە:

ئەگەر کەشتیی هەر کەسێك بە تۆفانی ئەو نوقم بوو، سێبەری پەنجە ڕەنگدانەوەکەی ناو ئاوی، دەستی کەشتییەوانەکە دەشکێنێ.

بڕوانە: شرفنامە- تألیف الأمیر شرف خان البدلیسی- ترجمة: محمد جمیل الملا أحمد الروژبیانی- الطبعة الثانیة- نشر مؤسسة موکریانی للطباعة و النشر- مطبعة وزارة التربیة- أربیل- ٢٠٠١- ص/٥٨٢ (وەرگێڕ).



کە سەرچاوەکانم دەپشکنی، لە سەدەی حەڤدەدا لە ناو ئەو کارمەندانەی سەرادا کە باوەڕیان پێ دەکرا، ڕووبەڕووی هەندێك کوردی دیکە بوومەوە. یەك لەو نموونانە یووسف نابی ئەفەندیی شاعیرە (١٦٤٢-١٧١٢). نابی کە لە کوردەکانی ئورفە بووە، لە سەردەمێکدا کە بیست و سێ ساڵان بووە. لە سەردەمی **محەممەدی** چوارەمدا دووجار چووەتە ئەستەمبووڵ. بووەتە نووسەری دیوان و ساڵی (١٦٧٨) دەخرێتە سەر کاری کەتخودایی. گۆڕەکەی لە گۆڕستانی (قەرەجە ئەحمەد)ی ئەستەمبوولْدایە. یەکێك لەوانەی حەزیان لە گاڵتە بووە لە بارەی نابی- یووسف ئەفەندی - یەوە گوتوویەتی:

**نـابی یی نابی ایدەن حسن نظر**

**أورفـە کوردندە ظرافت نـەگـرز**[11] [*8]

وەك ئەوەی لە نموونەکانی مەلا گۆرانی، ئەبوسسوعوود ئەفەندی، ئیدریسی بتلیسی، ئەبولفەزڵ **محەممەد** ئەفەندی، شوکریی شاعیر و یووسف نابی ئەفەندی .. دا بینرا، بەتایبەتی ئەو کەسایەتییانەی لە چینی زانایانی کوردن کە بۆ یەکەم جار بانگهێشتی ئەستەمبووڵ کراون، چوونە ژێر خزمەتی سەرایان دابین کراوە و هەندێك دەستکەوتی تایبەتی و کارئاسانییان بۆ کراوە. لە دەرەوەی ئەم زانایانە، کوردی دیکە هەبوون بە ئامانجی جیا جیاوە چووبوونە ئەستەمبووڵ، بە تایبەتیش لەناو ئەمانەدا ئەو بەگزادە کوردانە بەرچاو دەکەون کە بۆ چاکترکردنی هەڵوێست و بارودۆخیان بە نیازی پەیوەندیی نیمچە دیپلۆماسی هاتوونەتە ئەستەمبووڵ. پیترۆ دێلا ڤێللا - ی گەڕیدەی ئیتاڵیایی لە سەدەی حەڤدەهەمدا لە ماوەیەکدا کە سەری لە ئەستەمبووڵ داوە، لەوێ بەگزادەیەکی کوردی چاوپێ دەکەوێ: ((ئەم میرە، هاتووەتە ئەستەمبووڵ تا ئەو خاك و زەوییانەی کەمێك بەر لە مردنی نافیز پاشا لێی وەرگیراوە و سەر لە نوێ وەریگرتووەتەوە، هاتووەتە ئەستەمبووڵ بۆ ئەوەی وەرگرتنەوەی

---

11- Mehmed Süreyya Bey, Sicilli Osmani (yeni baskı), S. 1219.

(*8) واتە: ئەوەی (نابی)ی کردووەتە ئەو (نابی)یە، وردەکاری و بەرچاو ڕوونییەتی، ئەگەر نا ناسکی و ڕەوشت بەرزی و هەڵسوکەوتی چاك، کەی لە لای (کوردەکانی ئورفە)دا دەست دەکەوێ؟! (وەرگێڕ).

تەواوی زەوییەکانی ساغ بکاتەوە))[١٢]. ئەم میرە کوردەی داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ کراوە، نزیکەی دوانزدە هەزار کورد دەخاتە ژێر فەرمانی پادشا بۆ ئەوەی لە جەنگی عوسمانی-رووس-دا ئامادە بن. سەرەك و پیاوماقوولّی کوردی دیکەشمان بەرچاو دەکەوێت کە بۆ یەکلاکردنی کێشە و پێکدادانەکانی دەوروبەر و ناوچەکانی خۆیان هاتوونەتە ئەستەمبوولّ. لەناو ئەمانەدا ئافرەتی ئەوتۆش هەن جێی مێردەکانیان گرتووەتەوە[١٣] ئەو کوردانەی ئەم سەردانە کاتییانەی ئەستەمبوولّیان دەکرد کە دەگەڕانەوە هەرێمەکانی خۆیان چیرۆکی جیاجیایان بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە، ئەو چیرۆکە گێڕراوانە لە ناو خەڵکیدا لە بارەی ئەم شارە بەشکۆیە، مەراقێکی گەورەی دەوروژاند- لە سایەی ئەم چیرۆکە رەنگینانەدا ((مەراقی ئەستەمبوولّ)) هەمیشە لە ناو کورداندا بە زیندوویی راگیراوە. لەم دەمانەدا کۆچی مرۆڤە سادەکان بۆ ئەستەمبوولّ بەردەوام بووە. بە کورتی لە نێوانی سەدەکانی (١٥-١٨) لە کوردستانەوە لە هەموو چینێك کۆچی مرۆڤمان بۆ ئەستەمبوولّ بەرچاو دەکەوێ.

لە سەدەی (١٨)دا ژمارەی کوردەکان لە ئەستەمبوولّدا بەرەبەرە پتر دەبێ، لە ئەنجامدا، لێرە لە قەوارەیەکی گچکەدا کۆمەڵێکی کوردی پێکدێ. هەندێك لەو کوردانەمان بەرچاو دەکەون کە لە ئەستەمبوولّدا دەژیان، بەشدارییان لە یاخیبوونەکەی پاترۆنە (وەستا) خەلیل کردووە، کە ساڵی (١٧٣٠) لە ماوەی فەرمانڕەوایی سولّتان ئەحمەدی سێیەمدا بەرپا بووە[١٤]. ناوی هەندێك کوردی وەك چەلۆی کورد و چۆماری کوردمان لەسەرچاوەکاندا بەرچاو دەکەوێت کە بەشدارییان لەم راپەڕینەدا کردووە. وەکو زانراوە خەڵکی راپەڕیو هێرشیان بردووەتە سەر دامودەزگاکانی دەوڵەت و لەو ماوەیەدا زۆرێك لە پیاوانی دەوڵەت کوژراون کە لە پێش

12- İsmet Şerif Vanli, batılı Eski Seyyahların Gözüyle Kürtler ve Kürdistan, Avesta, İstanbul, 1997, s. 23.

13- Rohat Alakom, Li Kurdistanê Hêzeke Nû: Jînên Kurd, Stockholm, 1995, s. 32-33.

14- 1730 Patrona İhtilali Hakkında Bir Eser: Abdi Tarihi, yayan: Faik Reşit Unat, Ankara, 1943, s. 62. Bu Konuda Bak, Reşat Ekrem Koçu, Patrona Halil, 1968.



هەموانەوە ئیبراهیم پاشای —داماد-ی نەوشەهری بوو. لە کۆتاییەکەیدا سولّتان ئەحمەدی سێیەم ناچار بووە لە تەختی سولّتانێتی بکشێتەوە. پشت بە هەندێك سەرچاوە، رەشاد ئەکرەم کۆچو رۆمانێکی لە بارەی پاترۆنە خەلیل-ەوە نووسیوە، تێیدا لە نرخی ئەم راپەڕینە کەم دەکاتەوە و بە یاخیبوونێکی بەرامبەر دەوڵەت هەڵیدەسەنگێنێ و رەخنە لە بزووتنەوەکە دەگرێ. لە کتێبی (پاترۆنە خەلیل)ی رەشاد ئەکرەم کۆچودا کوردەکان لەگەڵ نوێنەرانی کەمایەتییەکانی دیکە دەکەونە بەر رەخنە و کورد بە: ((کوردگەلی لغاوکەری ئەسپێی خۆی)) پێناسە دەکا. بەڵام دیدی کەسانی دیکەش هەن کە بە چاوێکی دیکەوە سەیری ئەم بزووتنەوەیە بکەن کە لە ئەنجامی نارەزایی خەڵکدا بەرامبەر رژێم هاتووەتە مەیدان. کەریم کۆجان لەو کتێبەیدا کە بە ناوی پاترۆنەدا نووسیویەتی و بەم شێوەیە بەرامبەر چەلۆی کورد لە تەك یاخیبوواندا جێی خۆی دەکاتەوە و بە چەلۆی کوردی بەشداربووی یاخیبوونەکە دەڵێ:

**ئەی چەلۆی کورد**

**کارت کرد، رێزت لێ نرا؟**

**بووی بە پەلکێکی پاییزە، هەمدیسان هەر بە خۆت ژاکایت**

**لە سەرتاسەری سنوورەکاندا دەمری،**

**داخۆ ناوت، نازناوت گەیشتنە ئاسمان دەسا بپرسە، بپرسە؟**[١٥]

لە نێو ئەو یاخیبوونەدا کە لە قاوەخانەی (چارداك)ی یەنیچەرییانەوە بەرپابووە، چەلۆی کوردو مرۆڤێلێك هەبوون کە لە دەڤەری ئەرزەڕۆمەوە هاتوون. دوای کوژرانی ئیبراهیم پاشای داماد لە ساڵی (١٧٣٠)دا، ئەمجارە یاخیبووان روویان لە (بابی هومایۆن)[*٩] کردووە و داوای دەست لە کارکێشانەوەی پادشا (سولّتان) کردووە. لە ناو ئەمانەدا کوردگەلیش هەبووە کە رەشاد

15- Kerim Korcan, Patrona, İstanbul, 1983, s. 373.

(*٩) بابی هومایۆن: فەرمانگەی فەرمیی سولّتانی عوسمانی. (وەرگێڕ).

ئەکرەم کۆچو بە ((کاروانی مەگەزگەلی چۆماری کورد)) یان پێناسە دەکا. ((ئەو پادشایەی کە قەفەسی کۆشکی ئاهەنگی[*١٠] بە هەڵگرتن دابوو، پادشا بە سەرسامییەوە تەماشای ئەو پیاوانەی کرد کە گۆڕەپانی بەردەمی کۆشکەکەیان پڕکردبوو. یەکەم جار بوو یاخیبووان بە چاوی خۆی دەبینی. لەناو ئەو ئاپۆرەیەدا لە پێشان چۆماری بینی کە باڵای لە دوو مەتر پتر بوو، بینینی چۆمار بەس بوو بۆ ئەوەی سەرسام بێت ..)). دوای لەناوبردنی یاخیبوونی پاترۆنە خەلیل کەسانی ریزی پێشەوەی یاخیبوونەکە بە توندی سزا دەدرێن و هەندێکیشیان لە سێدارە دەدرێن. وەکو دیارە، بۆ تۆڵە کردنەوەی پاترۆنە خەلیل، خەڵکەکە سەر لە نوێ دەکەونە بزاوت، بەلای فایق رەشید ئونات - ی بڵاوکەرەوەی سەر لە نوێی (مێژووی عەبدی)یەوە، لەناو ئەمانەدا کوردیش هەبووە. خەڵکێك لە حەوشەی مزگەوتی بەیازت (بایەزید)دا کۆبوونەتەوە، دواتر لە (ئێت مەیدانیی ئاق سەرای) دا یەکدەگرنەوە، لێرەدا درێژە بە کارەکانیان دەدەن.

ئەم نا ئارامییە کۆمەڵایەتی و پێکدادانانە، لە سەردەمی سوڵتان مەحموودی یەکەمدا بەردەوام دەبێ. کۆمەڵانی خەڵك دەڕژێنە ناو کۆڵانەکانەوە و لە ناو ئەمانیشدا کورد هەر هەبووە. مەحموودی یەکەم دەیەوێ تەگەرە بخاتە بەردەمی ئەم کۆچبارانەی بۆ ئەستەمبووڵ دەکرا، بەڵام لەم بارەیەوە هیچی پێ ناکرێ. لە ئەنجامی زیادبوونی سەرژمێر لە شارەکەدا هەندێك تەقینەوەی کۆمەڵایەتییانە و یاخیبوون دێتە کایەوە. ئەم بابەتە تا رادەیەکی چاك مەحموودی یەکەم نارەحەت دەکا، ((مەحموودی یەکەم پەنا بۆ چارەسەرێکی نوێ دەبا، ئەمجارەیان ناچار دەبێ لەو بینایانەی لە دەوروبەری ئەستەمبووڵدا کرابوون بە تایبەتی کورد و ئەلبانییەکانی لێ دەرکەن))[١٦]. راپەرینێکی دووەم، ساڵی ١٧٤٨ لە ناوەندی (بیت بازاڕی)ی ناوچەی (بەدەستەن)دا دێتە گۆڕێ. ئەم یاخیبوونەی کەوا هەندێك کوردیشی تێدا بووە، بەر لەوەی پەرە

---

[*١٠] کۆشکی ئاهەنگ: ئەو کۆشکە (سەکۆ!)یە کە سوڵتانی عوسمانی لەوێوە سەیری ئاهەنگ و رێو رەسمی سەربازی و هی دیکە دەکرد (وەرگێڕ).

16- M. Münir Aktepe, İstanbul'un, Nüfus Mes'elesine Dâir Bazı vesikalar, İstanbul Üniversitesi Edebiyat Fakültesi Tarih Dergisi, no 13, 1958, s. 1-30. 17 age, s.25.



بستێنێ پێشی لێ دەگیرێ. مەحموودی یەکەم، بەهۆی بەشدارییانەوە لە یاخیبوونەکەدا کوردەکان بۆ شارەکانی خۆیان دوور دەخاتەوە[١٧].

لە ئەنجامی ئەم فشارانە، تا سەردەمی مستەفای سێیەم درێژە دەکێشێ، دەبێ بیر لە کەمبوونەوەیەکی کۆچی بەرەو ئەستەمبوولی کوردەکان بکەینەوە. بەڵام لە توانادا نەبووە بەر لە کۆچی کورد بگیرێ. لە سەردەمی مەحموودی دووەمدا، ساڵی (١٨٢٦) لە ئەنجامی لابردنی رێکخراوەی یەنیچەریدا، ئەو کۆڵهەڵگرە (حەماڵ)ە کوردانەی ئەستەمبووڵ کە ژمارەیان زۆر زۆر بووە دەنێررێنەوە شارەکانی خۆیان و لە جیاتیی ئەمان کۆڵهەڵگری ئەرمەنی دەهێنرێن. بەڵام کۆڵهەڵگری کورد لە سەردەمی عەبدولحەمیددا، بەتایبەتی لە ساڵی (١٨٩٦)ەوە هاتوونەتەوە ئەستەمبووڵ و دیسانەوە دەستیان بەسەر ئەم کارەدا گرتووە[١٨].

ساڵی (١٨٢٦) دوای لابردنی رێکخراوی یەنیچەری، هەزاران کرێکاری کورد و کەمایەتیی دیکە، کە لە ئەستەمبووڵ بوون، نێررانەوە شارەکانی خۆیان. زۆربەی ئەمانە لەو کەسانە پێکهاتبوون کە بە سەڵتی و بە تەنیا لە خان و ژوورەکاندا داڵدەدرابوون، ئەوانەی لە ئەنادۆڵ و کوردستانەوە هاتبوون تێرراونەتە بەندەری ئزمیت و لەوێوە بەرەو شارەکانی خۆیان. بۆ ئەوەی رەبەن (سەڵت)ەکان دووبارە نەگەڕێنەوە ئەستەمبووڵ جۆرەها بەربەستیان بۆ دانراوە. لەم دەمانەدا گرنگترینی ئەمانە، بەڵگەیەکە بە ناوی ((ئیحتیساب نیزامنامەسی- قانوونی چاودێری کردن))ەوەیە کە لە (٦٢) مادده پێکهاتووەو بە پێی ئەو زانیارییانەی لە ماددەی (٣٨)ی ئەم بەڵگەیەوە دەردەکەوێ، نزیکەی بیست هەزار مرۆڤ لە ئەستەمبووڵەوە دەرکراوە و نێرراونەتە شارەکانی خۆیان. ئەوە نازانین چەندی ئەمانە کورد بوون. لە مادده (٤٧-٥١)ی ئەم بەڵگەیەدا کە بەناوی ((ئیحتیساب نیزامنامەسی))ەوەیە باسی کوردیش کراوە. بە پێی مادده (٤٧)، مانەوەی رەبەنە ئەرناوت و کوردەکان لە ئەستەمبووڵدا و زیادبوونی ژمارەیان پەسند نەبووە: (( هیچ کاتێك نابێ رەشوڕووتی ئەرناوت و کورد لە ئەستەمبووڵ ژمارەی نیشتەجێ

---

17- age, s.25.

18- Rohat Alakom, İstanbul'daki Kürt Hamal Topluluğu, Kebikeç Dergisi, no: 5/1997.

بوونیان زیاد ببێ. یەخەی ئەوانەی ئێستا لێرەن ناگیرێ، رێ لەوانە دەگیرێ کە لەمەودوا دێن)). لە ماددەی (٥١)ی نیزامنامەوە تێدەگەین، دوو عەشیرەتی کورد، جیهانبەیلو (جیهان بەگ لو) و (عەلیشان) بە مێگەل ئاژەڵ بۆ ئەستەمبوولّ دەهێنن. هەر بە پێی ئەو ماددەیە، ئەو رەبەن (سەڵتە زەلام) انەی سەر بە عەشیرەتە کوردەکانی جگە لەم دوو عەشیرەتە، چوونە ناو ئەستەمبووڵیان بەبێ گومان قەدەغە بووە، جگە لە کوردەکانی عەشیرەتی جیهانبەگلو و عەلیشان کە لە وەرزی تایبەتدا مێگەلە مەڕ بۆ سەر بڕین دەهێننە ئەستەمبوولّ. لاوی رەبەنی گرووپی کوردان بە هیچ جۆرێك و هۆیەك نایێنە ناو ئەستەمبوولّ)) لە ماددەکانی دیکەی نیزامنامەی ئیحتیسابدا ئەو خاڵانە ریزکراون کە رەبەنەکان دەبێ پابەندیان بن.

ئەم کوردانەی هاتوونەتە ئەستەمبوولّ، لە پیشەی جیاجیادا کاریانکردووە، هەندێك لەمانە لە سەدەی نۆزدەدا، لە ئەستەمبوولّ بە خزمەتکاری گوزەرانیان دابین کردووە. بە تایبەتی ئەو خزمەکارانەی وا لە (وان) و دەوروبەرییەوە هاتوون، لە ئەرمەنییەکان و کوردەکان پێکدەهات و کاریان لە میوانخانە گەورەکاندا کردووە.(( تایبەتمەندیی ئەمانە لەشپتەوی و توانایی و بەهێزییان بوو و ئەو کارانەیان رادەپەڕاند کە پێویستی بە هێزی مرۆڤانە هەبووە))[١٩]. لە لایەکی دییەوە کوردێکی زۆر لە لای بنەماڵە دەوڵەمەند و هەبووەکاندا کاریان کردووە. بۆ نموونە شەریف عەلی حەیدەری هاشمی کە لە (چامڵیجە)دا نیشتەجێ بوو بوون، کوردێك چاودێریی کولانە مریشکەکانی کردووە[٢٠]. هەندێك لە کوردەکان لە تەرسانەدا[*١١] کاریان کردووە. لە حەوزەکانی تەرسانەدا ئاوێکی زۆر کۆ دەبووەوە، بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەم ئاوانە، سوود لە هێزی ئەو گایانە وەردەگیرا کە بە دۆڵابی (چەرخی ناعوور- وەرگێڕ) بێستانەکانەوە دەبەستران. ئەوانەی بە پەروەردە کردن و چاودێریی ئەم گایانەوە خەریکبوون کورد بوون. ئەو

19- Necdet Sakaoğlu, Ayvazlar, Dünden-Bugüne İstanbul Ansiklopedisi, Cilt: 1, s.497.

20- Philip Mansel, Dünyanın Arzuladığı Şehir: İstanbul, Çev. Şerif Erol, İstanbul, 1996, s.273.

(*١١) تەرسانە: شوێنی دروستکردنی کەشتی (وەرگێڕ).



کوردانەی بە فراوانی گوزەرانیان بە ئاژەڵداری دابین دەکرد، بەمجۆرە ئەم پیشەیەیان لە ئەستەمبوولێشدا درێژە پێ دەدا. وەکی تر، دابینکردنی گۆشتی پێویست بۆ ئەستەمبوولّ لە لایە جیاجیاکانی کوردستانەوە، لە پلەی یەکەمدا لە دیاربەکرەوە بە مێگەڵ ئاژەل دەنێررایە ئەستەمبوولّ، چاودێریی ئەمانە کوردەکان دەیانکرد. ئەو کوردانەی دەهاتنە ئەستەمبوولّ کار و پیشەی زۆر لە یەك جیاوازیان دەکرد. هاگۆپ منتزووری کە ساڵانێکی زۆر لە ئەستەمبوولّ فڕنچییەتیی کردوو لە نموونەی بیرەوەرییەکانیدا روونی دەکاتەوە، کرێکارێکی زۆر لەوانەی لە کۆگاکانی (داری هێزم)دا کاریان دەکردو دارشکێنەکان لە کوردەکان پێکدەهاتن.

زیادبوونێك لە ژمارەی ئەو کوردانەدا، بەرچاو دەکەوێ کە لە سەردەمی عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩)دا هێنراونەتە کەرتی سەرەوەی بیرۆکراسییەوە، دەتوانین ئەم هەڵوێستە بە ئەنجامێکی سیاسەت (پۆلیتیکا)ی بەرامبەر بە کوردی عەبدولحەمیدی دووەم هەڵبسەنگێنین. نوێنەرانی ئەو کۆمەڵە کوردانەی لە ئەستەمبوولّدا دەژیان، لەبەر دەرگاکانی دەوڵەتدا جێی خۆیان لە پلە هەمە جۆرەکاندا کردەوە. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، دەوڵەتێك نەبوو لەسەر بناغەی نەتەوەیی دامەزرابێ، ئەتنیکی جودا جودا، ئەگەر سنووردariش بووبێ، بە سانایی دەجوولانەوە. بۆ نموونە لەناو ئەوانەی هێزی پاراستنی پادشایان پێکدەهێنا، کوردیشی تێدا بووە و لە سەردەمی عەبدولمەجیددا لە هەموو رەگەزێکەوە مرۆڤان لەناو ئەم رێکخراوانەدا جێیان دەبووەوە: ((ئەم بیرۆکەیەی بە لاوازترین شێوەی هەڵسوکەوتییەوە پشتگیری لێ کردبوو کە بەڕێوەبەرێتیی دەوڵەتێك بتوانێ بینوێنێ. بە شێوەیەکی ئەوتۆ، کە لەو رەگەزانەی ناو ئیمپڕاتۆرییەتدا هەن —کورد، سریانی، دورزی، چەرکەس و ئەرناوت، لە هەریەکەیان دوو کەسی تێدا بن. لە کوڕانی سەرەکەکان، تاقمێکی بۆ پاراستنی خۆی پێکهێنابوو. ئەو پیاوانەی بەژن و باڵای هەریەکەیان نزیکەی دوو مەتر بوو، لە بۆنەکان و نوێژی جومعاندا یاوەریی سولّتانیان دەکرد، جلو بەرگی نەتەوەیی خۆیانیان لەبەر دەکرد))[٢١]. ساڵی (١٨٩٩) کە (کنوت هامسون)ی نووسەری نەرویجی سەری لە ئەستەمبوولّ داوە، یەکێکی لەو رێوڕەسمانەی کۆڕەوی سوڵتان عەبدولحەمیدی تێدا بەشدار بووە بینیوە. ((..کوردەکان وەك مرۆڤی لە ئاسن دروستکراو لە تابووردا ریز دەبوون، لەسەر

21- age, s.245.

کەوا (مینتان)ەکانیانەوە هێڵەکی زۆر جوانیان لەبەر کردبوو کە ژنەکانیان بۆیان دووریبوونەوە و سەرپۆشی ئاوریشمینیان بەسەریاندا پێچابوونەوە))[٢٢].

بەشێکی ئەو کوردانەی کۆچیان کردبووە ئەستەمبوڵ، لە پیاوە ئایینییە کوردەکان پێکدەهات. لە ئەستەمبوڵ کەسایەتیی بە رەسەن کوردێکی زۆر لە ناو لایەنگرانی مەولانا خالید (١٧٧٦-١٨٢٧) هەبوو کە یەکێك بووە لە دوا نوێنەرە کاریگەرەکانی رێبازی نەقشبەندی مەولانا خالید کە رێز و کاریگەریی بە گۆڕەپانێکی بەریندا بڵاوبووبووەوە، بەوەی کە یەکێك بوو لە پیاوە ئایینییە کوردەکان ناسرابوو، مەولانا خالید کە کاریگەریی لە ناو کۆمەڵەی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوڵدا دەژیان، تا دەهات گەورەتر دەبوو، لە بارەی ئەوەوە کە هاتووەتە ئەستەمبوڵ یان نەهاتووە، بیروڕای جیاواز هەن[٢٣].ئەو دیوانەی مەولانا خالید کە لە شیعرەکانییەوە هەڵبژێرراوە، ساڵی (١٨٤٤) لە ئەستەمبوڵ لەچاپ دراوە. هەندێك لەو شێخانەی لایەنگیری بوون، لە پایتەختدا دادەنیشتن. وا زانراوە عەبدولوەهاب ئەلسووسی- یەکەم نوێنەری مەولانا خالید بووە کە بۆ ئەستەمبوڵی ناردووە. بەڵام دواتر لەسەر ئەوەی سکاڵا لە بارەی ئەم زاتەوە هەر دەهات و پتر دەبوو. ئەمجارە مەولانا خالید، عەبدولفەتتاح ئەلقادری- ی ناردووە. مەولانا خالیدێك کە لە ناو کەمایەتییە موسڵمانەکاندا لایەنگرێکی زۆری هەبوو، وەکی تریش لە ناو دەزگاکانی دەوڵەتیشدا رێزێکی گەورەی بووە.

تەکیەی نەقشبەندییان کە لە ناوچە جیا جیاکانی ئەستەمبوڵدا دامەزرابوو یەك لەو کاریگەرە بنچینەییانە بوو رۆژبەرۆژ ئەم رێبازەی بەهێزتر دەکرد. تەکیەی عسمەت ئەفەندی لە ناوچەی چارشەمبەی قەزای فاتیحدا، یەك لەم تەکیانەیە. تەکیەیەکی دیکە لە ناوچەی ئەییووب، لە

22- K. Hamsun, H.c. Andersen, İstanbul'da iki İskandinav Sayyah, Çev. Banu Gürsaler Syverstem, İstanbul. 1993, s. 47.

23- Butrus Abu-Manneh, The Naqshbandiya- Mujaddidiyya in the Ottoman Lands in the early 19th Century, Die Welt des İslams, vol. XXll. 1982, s.136. Bazil Nikitin'e göre Mevlana Halid bir ara İstanbul'a gitmiş, orada kalmıştır:"… O da Dürüst bir adam olarak, hiç karşı koymadı, kalkıp İstanbul'a gitti, Başkentte hocalığıyla Öylesine başarı kazand ıki, ülema ona Arabistan'a gitmesini öğütledi" (Bazil Nikitin, Kürtler, s.377.



ناو بینای (کوللییە)ی هۆجە خوسرەو پاشادا کارەکانیان بەڕێوەبردووە. یەك لەو کوردانەی لەم تەکیەیەدا کاریان کردووە، موحەممەد شەفیق ئەرواسی (١٨٨٤-١٩٧٠)ی شێخی نەقشبەندی بووە و لە ئەستەمبوڵدا ئەرك و فرمانی سەرۆکایەتیی لیژنەی وردبوونەوە لە نووسینی قورئاندا ئەنجام دەدا، بە یەکێك لە پیاوە ئایینییە کوردە هەرە بەناوبانگەکانی ئەستەمبوڵ دەژمێررا. عەبدولحەکیمی ئەرواسی یەکێکی دیکەی ئەم ئەرواسییانە بوو، لە تەکیەیەکی دیکەی دەوروبەری ئەیییووبدا کاری دەکرد، بە لای موفید یوکسەل - ەوە گۆڕەکەی لە ئەستەمبوڵە، بە لای هەر ئەو لێکۆڵەرەوەیەوە، مەلا عابدینی کۆنە موفتیی بەیکۆز کوردێك بووە. لەو تەکیەیەی ئویسکویداردا کە ناوی (ئەڵەجە مینەرە) بوو عەبدولفەتتاح ئەفەندیی یەك لە جێنشینەکانی مەولانا خالید، ئەرکی پۆستنشینیی (شێخایەتیی تەکیە)ی خستبووە ئەستۆی خۆی. لە دەوروبەری فندقلی-دا محەممەد ئەسعەد ئەفەندیی ئەربیلی (هەولێری)، کە پۆستنشینی تەکیەی کەلامی بووە، ساڵی (١٩٠٠) نووسینێکی ئەم زاتە کراوەتە بیانوو و نێرراوەتەوە هەولێر و دوای جاڕدانی مەشرووتییەتی دووەم، سەر لە نوێ گەڕاوەتە پایتەخت و لە ساڵی (١٩٣١)دا کۆچی دوایی کردووە. خالیدییەکان پتر لە دەوروبەری فاتیح و ئەیووب و ئویسکویداردا وەك هێزێکی رێکخراویان لێ دێ. دەوروبەری فاتیحی ئەستەمبوڵ، لە کۆنەوە بە یەکێك لەو مەڵبەندانە ناسراوە کە رێزی لە چینی زانایان گرتووە.

یەك لەوانەی کە لە ئەستەمبوڵدا ماونەتەوە و پەیوەندییان بە رێبازی نەقشبەندییەوە بوو بێ، شێخ عەبدوڵڵا فەیزی - یە، ئەم کەسایەتییەی کە هەندێك شیعری نووسیوە، لە دێڕە شیعرێکیدا کە هەر بە کوردی وەها دەڵێ:

**فـەیزییێ بێچـارە چـەوا فـام بکت**

**دەردێ دەری عالی دکشەت زەمین**

بەڵێ، بە هۆی ئەو نیوە دێڕە شیعرانەوە، لە بارەی گەرم و گوڕ نەبوونی نێوانی بابی عالی و ئەو کۆمەڵە کوردەی لە ئەستەمبوڵ دەژیان هەندێك سەرەداویان لە بارەوە بە دەست دەخەین. شێخ عەبدوڵڵا فەیزی لە دەوروبەری مووش- ەوە دێتە ئەستەمبوڵ[٢٤]. قاسم کوفرالی کە لە

24- Mehmet çağlayan, şark Uleması, İstanbul, 1996, s.52.

کوردەکانی بتلیسە، لە (١٩٤٠)دا لە ئەستەمبووڵ بە ناوی (دامەزرانی نەقشبەندییەتی و بڵاوبوونەوەی)ەوە تێزێکی دوکتۆرای ئامادە کردووە کە لە (٢٠٠) لاپەڕە پێکهاتووە. قاسم کوفرالی لەم کارەیدا بە کورتی خۆی لە باسی خالیدییانی ئەستەمبووڵ دەدا. باوکی قاسم کوفرالی پێشتر بۆ ئەستەمبووڵ دوور دەخرێتەوەو وەکو خێزان، ساڵانێکی درێژ لە ناوچەی (ئەدرنە قاپوسی)ی ئەستەمبووڵدا ناچاری ژیان دەبن.

لە ئەستەمبووڵدا گرووپێکی خالیدی هەبوو، تاڕادەیەك بە گەورە دەژمێرراو لەناو خەڵکیدا ڕێزێکی سادەیان بووە. گرنگترینی ئەو هۆیانەی فشاریان بۆ سەر ئەو خالیدییانە هێنا کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان، ئەو هەست بە نزیکییەی ئەم شێخانە بووە لەگەڵ هەستی نەتەوایەتیی پەرەسەندووی کورد. ((هۆیەکی دیکەی ئەو هۆیانەی وای کرد دەوڵەت ئەو کۆمەڵەی خالیدییانی ئەستەمبووڵە بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە، چالاکیی ئەو شێخانەیە کە بە رەسەن کورد بوون لە ناو ئەم ڕێبازەدا. لە شاری وەکو سلێمانی و هەولێردا کە چڕیی سەرژمێری کوردیان تێدایە. ئەم ڕێبازەیان تێدا پێکهاتووە و گەورەتر بووە و ئەم شێخانەی لەوێوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ و تێکەڵبوونی ناویان بە ناوی هەندێك یاخیبوونی خۆرهەڵات کە بەناوی نەتەوەیی کوردەوە کراوە. فشاری سەر خالیدییانی زیاتر کردووە[٢٥]. مەولانا خالید، نەك هەر لە ناو کوردەکاندا، بەڵکو لە ناو ئەو تورکانەشدا کە لە ئەستەمبووڵدا دەژیان و لە ناو کۆمەڵە موسڵمانەکانی دیکەشدا ڕێزی هەبوو.

عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی کە بە (کویرت هۆجا- مامۆستای کورد) دەناسرا، خەڵکی خەرپووت بوو، بەم هۆیەوە بە عەبدوڕڕەحمان خەرپووتیش دەناسرا. عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی کە زۆر زانا بووە، دەچێتە بەردەمی مەحموودی دووەم کە پادشای سەردەم بووە و پادشا ڕێزێکی گەورە لە (شێخی کورد) دەنێ، مەحموودی دووەم پێی دەڵێ: (ئێوە مامۆستای منن) و لە ئویسکویداردا خانوویەکی دەداتێ و ژنێکسش بۆ دەهێنێ. عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی لە لابردنی وەجاخی یەنیچەریدا ڕۆڵێکی گەورەی دیوە.

ناوی هەندێك کوردمان بەرچاو دەکەوێ کە ئەندامی یەنیچەریش بوون لەوێدا کاریان کردووە. بۆ نموونە محەممەد ئاغای سیلاحدار کە لە بارەی ژیانی ناو سەرای سەدەی حەڤدەهەمەوە

25- Ekrem Işın, Nakşibendilik, Dünden- Bugüne İstanbul Ansiklopedisi, cilt:6.



نووسیویەتی و لە (مێژووی سیلاحدار)دا نووسیویەتی کە حەسەن ئاغای کورد لە وەجاخی یەنیچەریدا وەك سەرکردەی یەکەیەك کاری کردووە. هەر لەم سەرچاوەیەدا بە پێی ئەو زانیارییانە عەبدوڵڵا ئاغای کورد یەك لە سەرۆکەکانی ئەوانە بوون کەوا ئەو جۆرە سەگە جەنگییانەیان بەخێو دەکرد کە پێیان دەگوترا (سانسۆن)، بەمانە گوتراوە (سانسۆنچی). لەم سەردەمەدا کوردێکی زۆر هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، حوسێن پاشا کە لە (سیلاحشوور-چەکدار)انی تایبەتی بووە، هەر لەو سەردەمەدا وەك (کەتخودای دەرگاوانان) کاری کردووە.

کۆچی کورد بەرەو ئەستەمبووڵ، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەردەوام دەبێ، لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤-١٩١٨) کۆچەرێکی زۆر دەبینرێ دێنە ئەستەمبووڵ.

((نەتەوەخوازەکان بە چوونە ناو سوپایانەوە، کاتێك لە ئەستەمبووڵ دەچوونە دەرەوە، پەنابەرو بێکەسە تورك و کورد و ئەرمەنەکان لە شێوەی هێرشدا دەڕژانە ناو شار، ژمارەی تازە هاتووان ئەوەند زۆر بوو، قوتابخانە سەربازییەکان، کۆشکەکان و مزگەوتەکان بەوانەوە پڕ دەبوون. لە ئەستەمبووڵدا یانەی یارمەتیی خۆرهەڵاتی نزیك، کە دامەزراوێکی تایبەتی یارمەتیی ئەمریکایە، ڕۆژانە زگی پتر لە (١٦٠,٠٠٠) مرۆڤی تێر دەکرد))[٢٦]. بە پێی ڕاپۆرتێك کە ئەفسەرێکی ئینگلیز ئامادەی کردبوو لەم ساڵانەدا دەستکورتی بەربەست ناکرێ. ((لەسەر شۆستەی دەربەنددا هەموو چالاکییەکی کارکردن بە یەکجاری کۆتایی هاتبوو. نزیکەی سەد هەزار کورد و لاز بەبێ کار دەسووڕانەوە))[٢٧]. لەوانەیە ئەم کۆچبارە بە کۆمەڵەی کورد بۆ ئەستەمبووڵ، گەورەترین کۆچی پێش ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بوو بێ.

بەلای کارگوزاریی کۆچباری ئەستەمبووڵەوە، لەم ساڵانەدا نزیکەی (٧٠٠) هەزار کورد لە ئەنجامی ناخۆشییەکانی جەنگ و بە هۆی فشارەکانەوە بەرەو ناوچە جیاجیاکانی وڵات ناچاری کۆچکردن بوون. بارودۆخی منداڵە بێکەس و بێخاوەنەکانی ئەستەمبووڵ، سەرنجی کۆمەڵەی (تەعمیمی مەعاریف و نەشرییاتی کورد)ی ڕاکێشاوە کە چالاکیی لە ئەستەمبووڵ ئەنجام دەدا و لە ژمارە (١٠)ی گۆڤاری ژین- دا، لە پرۆگرامی کارگوزارییاندا بڵاوکراوەتەوە و ئەم بابەتە

26- Philip Mansel, Dünyanın Arzuladığı şehir: İstanbul, çev. Şerif Erol, İstanbul, 1996, s.370.
27- Philip Mansel, s.395.

به بەرچاوەوە گیراوە. ((ئەو منداڵە کوردانەی لە ئەستەمبووڵ، لە ناو دەستکورتیدا دەژین و بە بێکارەیی دەسووڕێنەوە، ئەوەندەی دەکرێ بەشێکیان لە لای بازرگانان بکرێنە خزمەتکار و بەردەستی، بۆ دابینکردنی بەردەوامیی کاری ئەمانە هەوڵی پێویست دەدرا)). لەم ساڵانەدا میدیای کورد کە لە ئەستەمبووڵدا کاریگەر بووە، بۆ سەرنجڕاکێشان بۆ ئازارەکانی ئەم کۆچەرانە، نووسینی هەمە جۆری بڵاوکردووەتەوە. لە گۆڤاری ژیندا کە ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، ئەو شیعرەی بە ناوی (نووزەی هەتیوێك)ی عەبدوڕڕەحیم ڕەحمی بڵاوکراوەتەوە، لە نیوە دێڕێکیدا ئەم ئازارەی کوردانی بە شێوەیەکی دڵتەزێن دێنێتە گۆ:

**کۆچەرم من، ئەوا کەوتوومەتە بەردەرگای ئەم و ئەو.**

## دوور خستنەوەی کورد بۆ تاراوگەی ئەستەمبووڵ

بەشێك لەو کوردانەی کە لە ئەستەمبووڵ دەژین، ئەوانەن کە بۆ ئەوێ دوور خراونەتەوە و لەگەڵ خزم و خوێشیان ئەو کۆمەڵانەیان پێکهێناوە، بەتایبەتی ئەو سەرکردە کوردانەی بەشدارییان لە شۆڕش و ڕاپەڕینە گەورەکان کردووە و بە دیلی نێرراونەتە ئەستەمبووڵ، هەندێکی وامان بەرچاو دەکەون کە ساڵانێکی دوور و درێژ لە ئەستەمبووڵ لە ژێر دەستبەسەری و چاودێریدا ماونەتەوە، نەك هەر تەنیا سیاسییەکان، هەندێك لە پێشەوا ئایینییەکان و مرۆڤگەلی سادەی دیکەش نێرراونەتە تاراوگەی ئەستەمبووڵ. ناردنی کوردان بۆ تاراوگەی ئەستەمبووڵ مێژوویەکی دێرینی هەیە. پێشتر لە بارەی هەندێك کوردەوە دواین کە دوای (فەتح کردنی) ئەستەمبووڵ بۆ ئەم شارە دوور خراونەتەوە و لەوێدا چەند گوندێکی کوردیان دروست کردووە. ساڵی (١٦٦٤) ئەو (مەهدی)یەی پەیدا بووە، ئەوسا منداڵە کوردێکی دوانزدە ساڵان بووە و لایەنگرێکی زۆری هەبووە: ((لە کۆتاییدا لەلایەن والیی مووسڵەوە دەستگیرکراوە و بڕیاری بە دیلیی تا مردنی دراوە و نێرراوەتە ئەستەمبووڵ))[٢٨]. عەبدوڵڵا ئەفەندی، بە قسەی خۆی،

28- Martin van Bruinessen, Kürdistan Üzerine yazılar, İstanbul, 1992, s. 83.



**محەممەدی** کوڕی مەهدی- یە. ئەم هەڵوێستە لە ناو مەردومی دەوروبەردا دەنگدانەوەیەکی گەورەی بەرپا کردووە. لە ئەنجامی هاتنەکایەی ئەم ڕووداوەی لە دەڤەری (ئامێدی) سەر بە مووسڵ، باب و کوڕ بەدیلی بەرەو ئەستەمبووڵ نێرراون. کوڕ و باوك کە دەهێنرێنە بەردەمی پادشا، دان بە مەهدییەتیدا نانێن و دواتر لێیان خۆش دەبن، عەبدوڵڵا ئەفەندی لە ئەستەمبووڵدا دەبێتە شێخی دەرگاه (خانەقا)یەکی ئەستەمبووڵ. **محەممەدی** کوڕی، بەلاوی ساڵی (١٦٧٠) کۆچی دوایی دەکا. ئەو کوردانەی هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، دواتر وەك دەبینین ئەمجارە بەرەو شوێنانی دیکە، بۆ تاراوگە دەنێررێن و لە مێژووی دوور خستنەوە و تاراوگەیی کورددا، بەمجۆرە، ئەم مێژووە بە گۆڕانی ناوی شار لە سەرچاوەکاندا دەبینرێن. لە سەدەی نۆزدەدا لە نێو ئەو بەگزادە و پێشەوا بەناوبانگانەدا کە بۆ تاراوگە دەنێررانە ئەستەمبووڵ، ئەم کەسایەتییانەمان بەرچاو دەکەون: میر موحەممەد، بەدرخان پاشا، عوسمان پاشا، حوسێن کەنعان پاشا، شێخ عوبەیدوڵڵا، سەید عبدولقادر، هەر یەك لەم کەسایەتییانە، وەك بارمتەیەکی ڕامیاری لە ئەستەمبووڵدا خراونەتە ژێر چاودێری و دەستبەسەری، بەمجۆرە ئەم تەگەرانە لەسەردەمێکی دیاردا دەبێ هەوڵێك بووبێ بۆ ڕێگرتن لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد. بەڵام ئەم سیاسەتەی ناردنە تاراوگەیەی دەوڵەتە، ناتوانین بڵێین بەردەوام ئامانجی پێکاوە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، دوای شکانی ڕاپەڕینی میر **محەممەدی** ڕەواندز، ساڵی (١٨٣٦) لەگەڵ کاروانێکدا دەنێردرێتە ئەستەمبووڵ: ((سوڵتان مەحموودی دووەم ئەوی لەگەڵ میوانانی شانازی (شەرەف)دا پێشوازی لێ کردو ڕێی گەڕانەوەی بۆ کوردستانی پێ دا. مەحموودی دووەم بڕیاری ڕێگەیەکی خوێنینتری دابوو بۆ ڕزگار بوون لەم پیاوە کاریگەرە پڕ مەترسییە. لە ڕێی گەڕانەوەیدا، نزیك شاری ترابزون، میر **محەممەد** کوژرا))[٢٩]. وا دیارە مەبەستی دەوڵەت سەربەستکردنی میر **محەممەد** نەبووە، بەڵکو تاکە ڕێیەك بۆ لێ ڕزگاربوون کوشتنی ئەو بووە لە شوێنێکی دەرەوەی ئەستەمبووڵ، بەدرخان پاشا (١٨٠٢-١٨٦٨)ی سەرکردەی یەك لە سەرڕاسترینی ڕاپەڕینەکانی کورد، بە پێی ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوەکاندا هەن، دوای ئەوەی لە ساڵی (١٨٤٧) دا خۆی بە دەستەوە داوە، لەگەڵ خێزانی ئاپۆە و هەندێك لە براکانی نێرراونەتە ئەستەمبووڵ. أ. هـ. لایارد- ی باڵیۆزی گەورەی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ لەم

29- Celîlê Celîl, xıx. Yüzyıl Osmanlı İmparatorluĝu’nda Kürtler, çev. Mehmet Demir, Ankara, 1992. s.114.

بارەیەوە کاریگەریی بەسەر پادشاوە هەبووە: ((بەدرخان لە سەردەمی عەبدولمەجیددا ئەنادۆڵی تێکدابوو، لەسەر ئەمە مستەر لایاردی باڵیۆزی گەورەی ئەو سەردەمەی ئینگلتەرە بووە، بە سوڵتان عەبدولمەجیدی راسپاردووە کە بانگهێشتی بەدرخان بکا بۆ ئەستەمبووڵ. بەدرخان بەم بانگهێشتنە تەڵەئامێزە هەڵخەڵەتاوە و هاتووەتە ئەستەمبووڵ، ئەم سەردانە گەڕانەوەی نەبووە. بەدرخان عەشیرەتێکی زۆری خۆرهەڵاتی (تورکیا)ی یەکخست و هێنایە گۆڕێ و سەرکردایەتیی نزیکەی (٣٠٠) هەزار سوارەی کرد کە بە چەکی نوێیی مۆدێرنەوە ئامادەکرابوون))[٣٠]. بەدرخان پاشا هێنرایە ئەستەمبووڵ و لەبەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیددا ئامادەکرا[٣١]. گفتوگۆیەکی سەیر و سەرنجڕاکێش لە نێوانیاندا بووە: ((لە وەڵامی ئەو پرسیارەی سوڵتان کە لە هۆی یاخیبوونی دەپرسێ، بەدرخان چوارینەیەکی بەناوبانگی عومەر خەییامی بۆ دەخوێنێتەوە کە واتاکەی بەمجۆرەیە: بەرامبەر هەڵسوکەوتی بەدکارانەی من، تۆش ئەگەر هەر بەدکاریم لەگەڵدا بکەی، جیاوازیمان چی دەبێ؟![*١٢] سوڵتان ئەم وەڵامە زیرەکانەیەی پێ خۆش دەبێ. مەردی و دروستیی دەبێتە هۆی پشتپێبەستن، دەبەخشرێ و بەرامبەر ماڵ و سامانێك کە لە دەڤەری خۆیدا بەجێی هێشتوون، دوو سەد زێڕی مووچەی

---

30- Sir Henry F. Woods, Türkiye Anıları. 1976, s. 314.

31- Osman Nuri Ergin, İstanbul Şehreminleri, İstanbul, 1996, s.180.

(*١٢) شیعرە فارسییەکەی عومەری خەیام ئەمەیە کە دەڵێ:

**نـاکـردە گنـاه در جهان کیست بگو**

**وان کس کـە نکـرد چون زیست بگو**

**مـن بـدکنم و توبد مکافـات دهی**

**بس فرق میان من و تو چیست بگو**

واتە: کێیە لە جیهاندا گوناهی نەکردبێ، بڵێ .. کەسێك گوناهی نەکردبێ، ئەی چۆن ژیاوە، بڵێ .. من بەدکاری بکەم، تۆ پاداشتی بەدم بدەیتەوە، ئەدی جیاوازیی من و تۆ چییە؟ بڵێ!. (وەرگێڕ).



زەوییانەی دەدرێتێ. لەگەڵ خێزانی پێکەوە دەنێردرێتە شاری قەندییەی دوڕگەی کریت))[٣٢]. بەدرخان پاشا کە نێردراوەتە کریت وەکو تاراوگە، دوای دە ساڵ کە لەوێ ماوەتەوە و سوڵتان عەبدولعەزیز لێی خۆش دەبێتەوە و بە کەشتییەکی تایبەتی، دەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ، دواتر بۆ دووەم جار دەچێتەوە کریت. ئەمجارە هەشت ساڵ لە کریتدا دەبێ، واتە بەدرخان پاشا بەسەریەکەوە، هەژدە ساڵ لە کریت بووە. دیسان دێتەوە ئەستەمبووڵ و حەوت ساڵی تێدا دەژی: ((بەدرخان، جاری یەکەم دە ساڵ لە کریت ماوەتەوە، لە کۆتاییەکانی سەردەمی عەبدولەجیددا بە لێخۆشبوونەوە رێی دەدرێتێ بێتە ئەستەمبووڵ. لەبەر ئەو کارانەی لە بەرژەوەندیی دەوڵەت ئەنجامی دابوون خەڵات کراوە و پایەی میری میران و ناوونیشانی (پاشا)یەتیی دراوەتێ. دواتر دیسانەوە کە گەڕاوەتەوە کریت، هەشت ساڵی دیکەشی لێ ماوەتەوە و لە سەردەمی عەبدولعەزیزدا هاتووەتە ئەستەمبووڵ و ئەو بینایەی ئێستا (داروششەفەقە)یەی پێ دراوە و حەوت ساڵ لەوێ دانیشتووە. بەر لە مردنی بە دوو ساڵ، چووەتە شام و لەوێ مردووە و لە ساڵحییە نێژراوە))[٣٣]. لەبەر ئەوەی کەشوهەوا بۆ تەندروستیی بەدرخان پاشا باش نەبووە، لەسەر راسپاردەی پزیشکان ئەستەمبوولی جێهێشتووە و لە شام نیشتەجێ بووە. ئەو خانووەی لە ئەستەمبووڵ بەدرخان پاشای لێ دادەنیشت، بەلای ئیبراهیم عەلائەدیین گۆیڤسا- وە ئەو بینای ئامادەیی داروششەفەقەیەیە کە بەدرێژایی ساڵانێك وەك قوتابخانە بەکارهاتووە. ئامادەیی داروششەفەقە، پێش چەند ساڵێك، لەم بینا کۆنەی ناوچەی فاتیحەوە گوێزرایەوە بۆ ئەو بینایەی لە ئەیاز ئاغادا بنیاتنراو لەوێ دەست بە

---

32- İbrahim Alaettin Gövsa, Türk Meşhurlari Ansiklopedisi, 1945, s.67. Bedirhan'ın sultan'a söylediği rubainin bütünü şöyledir:

Dünyada bir günah işlememiş olan kimdir, söyle?

Günah işlemeyen kimse nasıl yaşar, söyle,

Ben kötülük edeyim, sende bana kötülükle Mukabele et;

Öyle ise benimle senin arandaki fark nedir söyle? (Osman Nuri Ergin, İstanbul şehreminleri, İstanbul, 1996, s.180.

33- İbrahim Alaettin Gövsa, Türk Meşhurlari Ansiklopedisi, s.67.

پەروەردە و فێرکردن کرا. ساڵی (١٩٩٧) کە سەرم لەم ناوە دا، بینیم، ئەم بینا مێژووییە وەك داروشفەقە بەکار نایێت، هەر بە بەتاڵی ماوەتەوە.

دوای مردنی بەدرخان پاشا، هەندێك لە منداڵانی لە ئەستەمبوڵدا نیشتەجێ دەبن و بەرەبەرە لە پلە دەوڵەتییە جیا جیاکاندا لە فرمانی بە بایەخدا دادەمەزرێن. هەندێك لە دەوروبەر و نزیکانی بنەماڵەی بەدرخان، پێشەوایەتیی ئەو بزووتنەوە نەتەوەییە کوردییەیان کردووە کە دواتر پەرەی سەندووە و ئەستەمبوڵیان کردووەتە مەڵبەندێکی گرنگی نەتەوایەتیی مۆدێرنی کوردایەتی. لەمانە: عوسمان پاشاو حوسێن کەنعان پاشا، بوونە ئەفسەر و لە لەشکری عوسمانیدا کاریان دەکرد. دواتر لە جەنگی (١٨٧٧-١٨٧٨)دا بە هەڵی دەزانن و لە دەڤەری بۆتاندا رادەپەڕن. لە کۆتاییدا دەگیرێن و بۆ ئەستەمبوڵ دوور دەخرێنەوە[٣٤]. ئەمین عالی بەدرخان و منداڵەکانی، سورەییا، جەلادەت و کامەران بەدرخان، بەشدارییەکی گەورەی بزووتنەوەی رۆشنبیریی کوردی دەکەن لە ئەستەمبوڵ. دواتریش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا، دەرکەوتووە کە بەدرخان پاشا کۆشکێکی گەورەی لە (بویوك ئەدا- دورگەی گەورەی میر)دا هەبووە. پارس توغلاجی - ی لێکۆڵەرەوە، لە چیرۆکی ئەم کۆشکەدا دەڵێ: ((لەسەر رێی گەورەی توور-(نیزام)، کۆشکی لە تەختە دروستکراوی باخچە فراوانی ژمارە (١/٣,٣) کە لە ناو گۆڕەپانێکی (زەوییەکی) (١٠٤٦٨,٧٥)م[٢] دا دروست کراوە، خاوەنی یەکەمی بەدرخان پاشا بووە و دوای خۆی زەریفەی کچی و میراتگرانی دیکەی ئەحمەد شەمسەددین بەگی کوڕی محەممەد عارف بەگ، یەحیا بەگی کوڕی محەممەد عارف، شەریفە لەیلا خانمی کچی خەلیل شەریف پاشا، لە مارتی (١٩٠٣) دا فرۆشراوەتە محەممەد محێددین و عومەر فەوزی بەگی کوڕانی محەممەد عارف بەگ و لەمانیشەوە فرۆشراوەتە د.مووسا کازم بەگی کوڕی خورشید بەگ (ئەیلوولی ١٩٢٨)، دوای مردنی ئەمیش بووەتە هی فاتمە عولوییە ئەلدەمیر (٢٩/ی ك ١٩٣٩/٢) دوای ئەوەش دابەش (ئیفراز) کراوە و فرۆشراوەتە دوو سێ لایەن.

34- Celîlê Celîl, 1880 Kürt Ayaklanması, Çev yaşar Abdülselam Oğlu, Stockholm, 1992, s.50.



شێخ عوبەیدوڵڵا، سەرکردەی گەورەترین شۆڕشی کورد کە ساڵی (١٨٨٠) بەرپا بووە، وەك بەدرخان پاشا هەڵدەخەڵەتێنرێ و دەچێتە بینینی سوڵتان لە ئەستەمبوڵ: ((سوڵتان بە داب و نەریتی رێزلێنانەوە پێشوازی لە میوانەکەی ناکا. هەموو کەسایەتییە رەسمییەکانی پلەی پێشەوەی شار چووبوونە پێشوازیی شێخ. کۆڵانەکان پڕ بوو بوون لە خەڵك و جۆشیان سەندبوو. لەو دەمەدا کە عوبەیدوڵڵا چووبووە ناو ئەستەمبوڵەوە تۆپی رێزلێنانی بۆ تەقێنرابوو، بەڵام وەکو ویلسۆن نووسیویەتی، زۆری نەخایاند و نەکرایە میوانی سەرای سوڵتان، بەڵکو دەرکەوت کە ئەو دیلە))[٣٥]. دواتر شێخ عوبەیدوڵڵا کاتێکی شیاوی هەڵبژارد و لە شێوەی بازرگانێکدا، توانی لە ئەستەمبوڵەوە دەربازبێ، عوبەیدوڵڵا بە پەساپۆرتێکی نهێنی لە تورکیاوە هەڵات، بە کەشتییەکی فەرەنسی، لە پێشان گەیشتە شاری (پۆتی) و دواتر گەیشتەوە کوردستان[٣٦]. کاتێك محەممەد سادقی کوڕیشی گیرا، نێردرایە ئەستەمبوڵ. شێخ عوبەیدوڵڵا کە بۆ دووەم جار گیرایەوە، بۆ شارێکی دیکە، بۆ مەککە دوور خرایەوە. جەلیلی جەلیل یەکێکە لەوانەی بە فراوانی لە بابەتەکەی کۆڵیوەتەوە، وای بۆ دەچێ سەرکردەیەکی زۆری کورد کە پێشتر پشتگیریی شۆڕشەکەیان کردووە، لەلایەن (سەرا)وە کڕرابوون[٣٧].

میر موحەممەد کە سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە بە بایەخەی دەکرد وا لە سەدەی نۆزدەدا سەری هەڵدابوو، وەك بەدرخان پاشاو شێخ عوبەیدوڵڵا، کە سەرکردەی ناسراوی کورد بوون، هەڵخەڵەتێنراو برایە ئەستەمبوڵ. ئەم نیازەی دەستبەسەرکردن و لە ژێر چاودێریدا راگرتن و ناردنیان بۆ تاراوگە، ئەو سیاسەتە دەردەخا کە لە سەدەی نۆزدەدا سەرای سوڵتانی عوسمانی گرتبوویەبەر و پەیوەندیی بە کوردانەوە هەیە کە رێی هەڵخەڵەتاندن و دوورخستنەوەی گرتبووە بەر. لەبەر ئەوەی ئەو کوردانەی بۆ ئەستەمبوڵ دوور دەخرانەوە، هێزێکیان پێکدەهێنا و لە گۆشەنیگای پایتەختەوە شێوەی هەڕەشەیەکیان دەنواند، بۆیە ئێمە وای بۆ دەچین ئەمە هۆی دوور خستنەوەیان بووبێ لە ئەستەمبوڵەوە بۆ گۆشە پەنای زۆر دووری وەك کریت و مەککەی سەر بە ئیمپراتۆرییەت.

35- age, s.88.
36- age, s. 89.
37- age, s.93.

## عەبدولحەمیدی دووەم و كورد و ئەستەمبووڵ

ساڵانی (١٨٧٦-١٩٠٩)ی سەردەمی عەبدولحەمیدی دووەم، ساڵانی شاڵاوبردنی كوردانە بۆ سەر ئەستەمبووڵ، لەم ساڵانەدا دەبینین، سوڵتان پێوەندی بە سەرانی كوردەوە دەكاو بۆ پایتەختیان بانگهێشت دەكا، دەیانخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە. ئەمە بە كردەوە بەجێ دەهێنراو وەكو بۆچوون رەخنەی لێ دەگیرا، لە مێشكی عەبدولحەمیددا بەمجۆرە وەڵام دەدرانەوە: ((دەزانم بەهۆی ئەوەوە كە هەندێك لە منداڵە ئاغای كوردم هێناوەتە ئەستەمبووڵ و نیشتەجێیانم كردووە رەخنەم لێ دەگیرێ، ساڵانێكە ئەرمەنییە دیانەكان پایەی وەزیرییان وەرگرتووە. لەمەو پاشیش دەبێ چ زیانێك لە نزیك خستنەوەی كوردە هاو ئایینەكانی خۆمان هەبێ؟)).

عەبدولحەمیدێك كە لایەنگیریی كوردەكانی دەنواند، لە لایەكی دیكەوە هەمیشە لە بەرەنگاریی ویستە ئەتنیكییەكانی كورددا دەوەستا، رامیاریی عەبدولحەمید بەرامبەر بە كورد، لە بنچینەدا رێیەكی درێژخایەنی بیندرێژ بوو دژ بە ئۆپۆزسیۆنە نەتەوەییەكانی كورد. عەبدولحەمید كە بەردەوام خۆی بە لایەنگری كورد پیشان دەدا، لە لایەكی دیكەوە هەمیشە بەرەنگاری داواكارییە ئەتنیكییەكانی كورد دەبووەوە. سیاسەتی عەبدولحەمید بەرامبەر بە كورد لە بنچینەدا رێ لە ئۆپۆزسیۆنی كورد گرتنێكی درێژخایەن بوو، ئەو فشارەی بەرامبەر رۆشنبیرە كوردەكان درێژەی پێدابوو بە ئاماژەیەكی ئاشكرای ئەم سیاسەتە پڕ مەترسییە دادەنرێ. هەر بۆیە هەوڵیبەرەو خۆكێشكردنی هێزە كەلەپوورییە (تەقلیدی)یەكانی دەدا، لەلایەكی كەوە، هەوڵێك بوو بۆ دەمكوت كردنی رۆشنبیران و نەتەوەپەرستە كوردەكان، بەتایبەتی بەرامبەر بە خۆی: سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بۆ ئەوەی بتوانێ یەكیەتیی كۆمەڵگای ناو ئیمپراتۆرییەت رابگرێ، رامیارییەكی تایبەت بە خۆی هەبوو. بە هەر شێوەیەك بێ، ئەو كەسایەتییانەی كاریگەرییان بەسەر خەڵكەوە هەبوو لە ئەرناوت (ئەڵبانیا) و كوردستان و عەرەبستانەوە دەیهێنانە ئەستەمبووڵ، رێی چاوپێكەوتنیانی دەدا، ئاوڕی لێ دەدانەوەو پاداشت و یارمەتیی دەدان، ئەگەر بە خاڵێكی ناو زگی پیتی جیمیشی زانیبا[*١٣]، ئەوا لە شوورای دەوڵەتدا لە جەمعییەتی روزوومییەدا[*١٤] بە ئەندامی دادەمەزراند، مووچەی دەدایێ. بەڵام نەدەبوو ئەستەمبووڵ بەجێ بهێڵێ، بەتایبەتی دەبوایە لە ژێر چاودێریی خۆیدا بێت. لەو سەردەمەشدا لەوەدا نەبوو بتوانرێ ئەستەمبووڵ بەجێ بهێڵن و برۆن، ئەوانەی دەهاتنە ئەستەمبووڵ، جێنشینیان لە ناوەندی شاردا بوو، كە بیناكانی (بوغازئیچی) و كۆشكەكانی (گوێز تەپە) و (ئەرەنكوێی) یان دەبینی، جارێكی دیكە، گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیانیان بەبیر و خەیاڵیشدا نەدەهێنایەوە. لە ناو خۆشیدا دەژیان و سەرەمانگان (كەهیە)ی خۆیان دەنارد و مووچەی خۆیان وەردەگرت و ئەوەیان بەس بوو. لەم سایەیەدا، لەم جۆرە ویلایەتانەدا ئومێدی سەربەخۆیی و هی دیكە پێشی لێ دەگیرا[٣٨].

سوڵتان عەبدولحەمید، شێخ سەعیدی باوكی شێخ مەحموودی سەركردەی كورد، كە لە (١٩٢٠)دا، لە عیراق بەرامبەر ئینگلیز دەجەنگا، بانگ كردە ئەستەمبووڵ، لەگەڵیدا یەكدییان ناسی، رێزە دەستكەوتێكی بۆ دابین كرد، تەنانەت شیفرەی نهێنیی پێوەندی بەخۆیەوە كردنی دا پێی. لەو دەمانەدا كە باوكی شێخ مەحموود چووەتە ئەستەمبووڵ، شێخ مەحموودی كوڕی دەخاتە تەك خۆی: ((بەم شێوەیە، شێخ مەحوود هێشتا منداڵ بووە، بووەتە میوانی پادشای عوسمانی)). باوكی سمكۆش كە یەكێكە لە سەرانی كورد، ماوەیەك لە ئەستەمبووڵ بووە، ساڵی (١٩٠٦) بەدرخانییان كە دوور خرانەوە، ئەمیش تێكەڵ بەم كاروانە دەكرێ و بەرە و تاراوگە بەڕێ دەخرێ، دواتر لە تاراوگەدا دەمرێ[٣٩]. بەپێی سەچاوەكان، عەبدولحەكیم ئەفەندیی مامۆستای عەبدولحەمیدی دووەم كورد بووە[٤٠].

هێزەكانی حەمیدییە كە ساڵی (١٨٩١) دامەزراوە. لە عەشیرەتە كوردەكان پێكهاتوون. سەركردەكانی عەشیرەتەكان، هەموو ساڵێك دەبوو بچنە ئەستەمبووڵ و پەیوەندیی خۆیان بسەلمێنن. بەمجۆرە، ساڵی (١٨٩١) هەندێك لە سەرانی عەشیرەتەكان لە (ترابزون) كۆ دەبنەوە

---

(*١٣) زیادەڕۆییەكی زمانییە، بۆ ئەو كەسانەی مەترسیی تۆزقاڵێكی بەرامبەر سوڵتانیان لێ دەكرا، سوڵتان بۆ لای خۆیانی رادەكێشا جا بەهەر جۆرێك بووایە. (وەرگێڕ)

(*١٤) روزوومیە: واتای ئەم وشەیەم بۆ ساغ نەبووەوەو نەمزانی چییە (وەرگێڕ).

38- Refi Cevad Ulunay, Eski İstanbul Kabadayları- Sayılı Fırtınalar, İstanbul, 1995, s.202.

39- Refik Hilmi, Anılar, İstanbul, 1995. s.15. Celîlê Celîl, Jîyana Rewşenbirî û Siyasî ya Kurdan, Stokholm, 1985, s. 124.

40- Musa Anter, Hatırlarım, ikinci basım, Stockholm, 1991, s.72.

و لەوێوە بەرەو ئەستەمبووڵ دەکەونەڕێ و چوار هەفتە لە پایتەختدا دەمێننەوە[٤١]. دوای دوو ساڵ، لە (١٨٩٣) دا سەرەك عەشیرەتەکان لە ئەرزنجان یەك دەگرنەوە، لەوێوە دەچنە ئەستەمبوڵ: ((ئەم-لیوا- و قایمقامانەی عەشیرەتەکان، ساڵی (١٨٩٣) لە ئەرزنجان، لەلای موشیر محەمەد زەکی پاشا کۆ دەبنەوە و دەچنە لای سوڵتان عەبدولحەمید لە ئەستەمبوڵ، سوڵتان عەبدولحەمید، ئاوڕی لەمانە داوەتەوە و مێداڵیا و نیشانی پایە و پلەی بە بەرۆکەوە کردوون و بەوانەیان کە شایستەن، شمشێر و پارەی چاکی بەخشیوە و پێی گوتوون: ((لەبیر نەکەن، من باوکی کوردانم، بەم جۆرە رووخۆشیی لەگەڵیاندا نوواندووە))[٤٢]. هەندێك لەم تیپانە بە نموونە، سێ تیپی عەشیرەتی میللی (ملی)، هاتوونەتە قشڵەی سەلیمییەی ئەستەمبوڵ بە خۆویست بەشداریی جەنگەکانی بەڵکان (بەلقان) بوون[٤٣]. گەیشتنی تیپە کوردییەکان بە ئەستەمبوڵ سەرنجی خەڵکی ئەوێ و بێگانەکانی زۆر راکێشاوە[٤٤].

یەك لە ماکە گرنگەکانی ئەم سیاسەتەی بەرامبەر عەشیرەتەکان، ئەو (قوتابخانەی عەشایەری)یەیە کە ساڵی (١٨٩٢) لە ئەستەمبوڵ کراوەتەوە. ئەم قوتابخانەیەی منداڵانی هەندێك لە عەشیرەتەکانی عەرەب و ئەرناوت و کوردی تەمەن (١٢-١٦) ساڵانیان تێدا وەردەگیرا، ماوەی پەروەردەییی قوتابخانەکە پێنج ساڵ بووە. ئەوانەی ئەمەیان تەواو دەکرد، لە پۆلە تایبەتییەکانی قوتابخانە سەربازی و موڵکییەکاندا وەردەگیران. دواتر لە ناوچەکانی خۆیاندا، لە کارە جیا جیاکاندا دادەمەزران. نادر ئاغا کە ئاغایەکی (حەرەم)[*١٥] بووە، لەو بیرەوەرییەدا کە لە گۆڤاری مێژووی کۆمەڵایەتیی (١٩٩٨/٥٠) دا بڵاوکراوەتەوە، وای بۆ

---

41- Avyarov, Osmanlı- Rus ve İran Savaşları'nda kürtler, çev. Muhammed varlı, İstanbul, 1995, s.134.

42- M. Şerif fırat, Doğu illri ve varto Tarihi, Ankara, 1983, s.125.

43- Bayram Kodaman, Sultan II. Abdulhamid Devri Doğu Anadolu Politikası, Ankara, 1987, s.62.

44- Philip von Schwerin, I fält med turkarne- Minnen frân Balkankriget, Stockholm, 1913, s.161-163.

(*١٥) حەرەم: ئەو شوێنەی رێ بە هەموو کەس نادرێ بچێتە ژوورەوە. (وەرگێڕ)



دەچێ کە، منداڵانی عەشیرەتە کوردەکان وەك بارمتەی دەستبەسەر لێرە دانرابوون. بەڵای گۆڤارێکی ئەرمەنییەوە کە بەناوی (Kxa) وە لە لەندەن بڵاو دەکرێتەوە، ئەو منداڵە کوردانەی لەم قوتابخانەیەدا دەیانخوێند، پێوەندییان بە بزووتنەوە ئازادیخوازییەکانی دژ بە سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەبوو لە ئەستەمبوڵ، بەم هۆیەوە قوتابخانەکە ساڵی (١٩٠٧) داخرا[٤٥]. بۆ نموونە خالید بەگی جبرانلی-ی سەرۆکی کۆمەڵەی ئازادی، کە پێشەوایەتیی شۆڕشی شێخ سەعیدی ساڵی (١٩٢٥) ی دەکرد، دەرچووی ئەم قوتابخانەیەیە.

قوتابخانەی عەشایەر ساڵی (١٨٩٢) لە یەکێك لەو بینایانەی ناوچەی بێشکتاشدا دەکرێتەوە. دواتر ساڵی (١٨٩٤) دەگوێزرێتەوە ئەو بینایەی (ئەسما سوڵتان) کە لە (کەباتاش) دایە. (١٩٠٧) کە قوتابخانەی عەشایەر دادەخرێ، هەر ئەو بینایە دەکرێتە ئامادەیی (کەباتاش)ی کوڕان، دواتر ئامادەیی کەباتاش گوێزرایەوە ئەو بینایەی کە ئێستا لێیەتی. بەڵای عەلیشان ئاکپنارەوە کە لێکۆڵینەوەیەکی لە بارەی قوتابخانەی عەشایەرەوە نووسیوە. ئەو بینایەی ئەسما سوڵتان کە قوتابخانەی عەشایەری تێدابووە، دواتر رووخاوە[٤٦]. لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی دیکە لە بارەی قوتابخانەی عەشایەرەوە نووسراوە، لەلایەن (یۆجین. ل. رۆگان)ەوە بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە[٤٧]. ئەمڕۆ لە سایەی بەری کاری ئەم دوو لێکۆڵەرەوەیەدا، لە بارەی ئەو قوتابخانەی عەشایەرەوە کە ساڵی (١٨٩٢) لە ئەستەمبوڵ کراوەتەوە، خاوەن زانیارییەکی زۆرترین. وێنەی فۆتۆگرافیی هەندێك لەو قوتابییە کوردانەی لە قوتابخانەی عەشایەردا دەیانخوێند کە لە ساڵانی ئەو دەمەدا گیراون، کراونەتە پۆسکارت (کارتپۆستاڵ)[٤٨].

---

45- Celîlê Celîl, Jîyana Rewşenbîrî û Sîyasî ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.26.

46- Alişan Akpınar, Osmanlı Devletinde Aşiret Mektebi, İstanbul, 1997, s.37.

47- Eugene L Rogan, Aşiret Mektebi: Abdülhamid ll's School for Tribes (1892-1907), International Journal of Middle Eastern studies, no28, 1996, s.83-107.

48- Imperial self- Potrait, Journal of Turkish Studies, Vol.12, 1998.

پرۆژەی وێنەگرتنی ئەو شوێن و دامەزراوانەی لەسەر خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا شایەنی بینینن، لەسەر خواستی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەدی هاتووە و هەزاران وێنەگیراون. بەشێکی ئەو فۆتۆگرافانەی لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە رێکخرابوون، ساڵانی (١٨٩٣) و (١٨٩٤) بە دیاری بۆ (کتێبخانەی

دوای پێکهێنانی تیپەکانی حەمیدییە (١٨٩١) و قوتابخانەی عەشایەر (١٨٩٢)، لە ساڵی (١٨٩٤) دا ئەو فەرهەنگە (کوردی-عەرەبی)یەی یووسف زیائەددین پاشا لە ئەستەمبوڵ بڵاو دەکرێتەوەو پێشکەشی عەبدولحەمیدی دووەم دەکرێت. ئەم فەرهەنگەی کە بەناوی (دیاریی حەمیدییە لە زمانی کوردیدا- ئەلهەدییەلحەمیدییە، فیللوغات ئەلکوردییە-الهدية الحميدية في اللغة الكردية-)ـەوەیە بایەخی مێژوویی گەورەی هەیە، بەجۆرە، بۆ یەکەمجار بڵاوکردنەوەی فەرهەنگێکی کوردی لە ئەستەمبوڵی پایتەختدا بەرچاو دەکەوێ. لایەکی سەرنجڕاکێشی کتێبەکە ئەوەیە، ئەو نامیلکەیەی ئەحمەدی خانی - ی نووسەری گەورەی کوردە کە بەناوی (نوبارا بچووکان)ەوەیە، وەك پاشکۆیەك لە کۆتایی ئەم فەرهەنگەدا جێی کراوەتەوە. فەرهەنگ بە بایەخەوە پێشوازیی لێدەکرێ[٤٩].

ئەم سیاسەتەی عەبدولحەمید، بۆ دابینکردنی لایەنگیریی شێخ و ئاغاو بەگزادە کوردەکان هەمیشە هەر بۆی نەچووەتە سەر. نەتەوەخوازیی کورد بەردەمی ناگیرێ. ئەمجۆرە بیرە

---

کۆنگرس) و (مۆزەخانەی بەریتانی) نێرراون. وێنەی فۆتۆگرافیی هەندێك لەو لاوە کوردانەی لە قوتابخانەی عەشیرەت دەیانخوێند لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا خراوە. هەندێك لەو فۆتۆگرافانەی لەم ساڵانەدا بۆ ئەو قوتابییە کوردانە گیراوە کە لە قوتابخانەی عەشیرەتدا دەیانخوێند، دواتر کراونەتە پۆستکارت و لە ئەستەمبوڵ فرۆشراون. لە مووزەخانەیەکی سوێد، یەك لەو پۆستکارتانەم بەرچاو کەوت کە منداڵە کوردێکی تێدا بە شێوە جلوبەرگی نەتەوەییە دەرکەوتووە. لە ژێر پۆستکارتەکەدا دەستەواژەی (Costume Kurden) واتە (جلوبەرگی کوردی) نووسراوە. ئەم پۆستکارتەی لە لایەن سوێدییەکەوە ساڵی ١٩٠٤ لە ئەستەمبووڵەوە نێرراوەتە سوێد. هەروەها وێنەیەکی بە کۆمەڵی سیانزە قوتابیی کورد کە لە قوتابخانەی عەشیرەتدا بوون لە ژمارە (٣٩٠)ی ساڵی (١٨٩٨)ی گۆڤاری (سەروەتی فونوون)دا بڵاوکراوەتەوە، ئەو قوتابییانەی لێرە دیارن، یان لە پۆلی جەنگی (حەربی)دا یانیش لە پۆلە تایبەتییەکانی مولکییەدا دەوامیان کردووە. وێنەیەکی ئەم فۆتۆگرافانەم لە ڕێی بەڕێز فەخری ئەراڵ-ی بەڕێوەبەری گۆڤاری مێژوو و کۆمەڵەوە دەستخست. سوپاسمانی پێشکەش دەکەین.

49- Yusuf Ziyaeddin Paşa, Kürtçe- Türkçe Sözlük, yeniden düzenleyen: Mehmet Emin Bozarslan, İstanbul, 1978. Sözlük konusunda yayımlanan bir tanıtma yazısı için bak. Journal Asiatique, ıx serie, t.2, s.545-549, 1893.



ئازادیخوازانە تەنیا هی کورد نییە، تەواوی گرووپە ئەتنیکییەکانی دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. لە لایەکی دیکەشەوە ئەو سیاسەتەی سوڵتان عەبدولحەمید کە لە کوردستاندا پیادەی کردبوو دەمنادەمێ ڕووبەڕووی تەگەرە و زەحمەتی دەبووەوە. ئەو نا ئارامییانەی هەندێك لە شێخ و بەگزادەی کورد تووشی خەڵکیان دەکرد، عەبدولحەمیدی دەخستە هەڵوێستی دژوارەوە. وەکو لە پێکهێنان و هەڵسوکەوتی تیپەکانی حەمیدییەدا بووە، لە لایەن خەڵك و نوێنەرانی کەمایەتییەکانی دیکەوە ریزە سکاڵاو ناڕەزاییەکی بۆ چووە. یەك لە دیارترینی ئەو ڕووداوانەی عەبدولحەمیدی خستبێتە هەڵوێستێکی دژوارەوە و سەرێشەی تووش کردبێ (ڕووداوەکەی مووسا بەگ)ە کە ساڵی (١٨٨٩) هاتووەتە گۆڕێ، چاوی رای گشتیی ئەوروپا و میدیاکان دەخرێتە سەر ئەو کردەوانەی مووسا بەگی خانەنشین (موتەقاعید)، ئەو دەمانە لە ئەستەمبوڵ ئەنجامی داون. مووسا بەگ کە لە ناوچەی مووشدا سەنگێکی خۆی هەبووە، دەستدرێژی لە کچە ئەرمەنییەکی بەتەمەن لە خۆی گچکەتری (گوڵێزار) ناوێك دەکا .. دواتر دەیەوێ بە زۆر شووی بە براکەی پێ بکا. ئەم کچە ئەرمەنییەی دڵسۆزی داب و نەریتی ئایینی خۆیان بووە، شوو بە موسڵمان کردن پەسند ناکات. دوای ئەوەی گوڵێزار ڕووبەڕووی کۆمەڵێك زۆر و زۆرداری دەبێ، دواتر چاوێکیشی سەقەت دەکرێ، لەسەر بیستن و بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی ڕووداوەکە، نزیکەکانی گوڵێزار و ئەرمەنییە نیشتمانپەروەرەکان، واز لەم زۆرکارییە ناهێنن. ڕووداوەکە سەرنجی رای گشتیی نێونەتەوەیی و مێدیاکان رادەکێشێ. عەبدولحەمید کە لە هەڵوێستێکی دژوار و زەحمەتدا دەبێ. مووسا بەگ دەهێنرێتە ئەستەمبوڵ و داوای دادگاییکردنی دەکرێ. (١٨٨٩) نوێنەرە بیانییەکان و ڕۆژنامەنووسان کە بە مەراقەوە چاودێریی بەڕێوەچوونی دادگایی کردنەکەیان دەکرد و بە درێژایی دادگاییە کە لە ئەستەمبووڵدا ناوی کورد بە خراپە دەبرا. مووسا بەگ پاش ماوەیەك گیران، بڕیاری بێ تاوانیی دەردەچێ. زۆرداریی ئەم مووسا بەگە بەناو گۆرانیی میللی و فۆلکلۆری کوردیدا بڵاو دەبێتەوە. لەم گۆرانییانەدا خەڵك لایەنگریی گوڵێزار دەکەن و مووسا بەگیش تاوانبار دەکەن[٥٠].

---

50- Arménouhie kévonian, les Noces Noires de Gulizar, 1993. Michel de Greece. Il. Abdulhamid-Yıldız Sürgünü, İstanbul, 1995, s.201-204. sir Henry F. woods, Türkiye Anıları, 1976, s.223-224. Naci Kutlay, Hecî Musa Beg û Guloya Ermenî, Wan, no. 4, 1992.

له سەردەمی عەبدولحەمیددا، لا لێکردنەوەی تایبەتی لە هەندێك لە بەگزادە و پیاوە گەورەکانی کورد، لە لایەن چینی جیاجیاوە بوونە هۆی رەخنە لێ گرتن. بۆ نزیکبوونەوە لە (سەرا)، هەندێك لە بەگزادە کوردەکان هەوڵ دەدەن بۆ درێژەپێدان و زیندوو راگرتنی ئەو پێوەندییانەیان کە بە ئەستەمبوولەوە هەیە کار دەکەن. جۆرێکی دیکەی ئەم بابەتانە بەسەرهاتی جەمال پاشای کوردە کە دواتری دەبێتە بابەتی ئەو چیرۆکەی (عەزیز نەسین) کە بە ناوی (ئەز کورمانجم)ەوە نووسیویەتی. جەمال پاشای کورد کە بە پاشایەتی لە قشڵەی سەلیمییەدا دادەمەزرێ، هەموو لایەکی بە میداڵیا داپۆشراوە: ((جەمال پاشای کورد ئەو جلکانەی لەبەر دەکرد کە نوقمی سورمە و گوڵنگە و قۆپچەی بریقەدار و زرێی سوور بوون و میداڵیاکانی بە بەرۆکی خۆیەوە دەکرد و دەیانیگونجاند، سمێڵە درێژەکەی کە دەگەییە بناگوێی بادەداو دەستێکی بە ردێنە سپییەکەیدا دەهانی و لە ناو قشڵەی سەلیمییەدا وەك قەلەموونێکی هەڵئاوساو هاتوچووی دەکرد. ئەو میداڵیایانەی سەرسنگی، وەك گوانە بزنە (ماڵتا)ییە پڕ لە شیرەکان، زرنگەیان دەهات و لەو سەری راڕەوی ئەو لاوە دەبیسترا))[٥١].

## سزادانی بە کۆمەڵی بەدرخانییان (١٩٠٦)

ناوەندەکانی سەرا، کوژرانی (ڕیدوان پاشا)ی سەرۆکی شارەوانیی ئەستەمبوولی ساڵی (١٩٠٦) یان کردە بیانوو. ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولْ دەژیان، بە تایبەتی ئەو بەدرخانییانەی ژمارەیان ئێجگار زۆر بوو بەرەو تاراوگەیان دەنێرن. ئەم کوردانەی ساڵانێکە لە کار و فرمانی هەمەجۆردا کار دەکەن، بە خاو و خێزانیانەوە سزا دەدرێن، لە لایە دوورەکانی ئیمپراتۆرییەتدا ناچاری ژیان دەبن، تەنیا ژمارەی ئەو کوردانەی فەرمانبەربوون و کاریان دەکرد و دوور خراونەتەوە، ژمارەیان دەگەیشتە (١٠٧) کەس[٥٢]. عەبدوڕڕەززاق بەگ لە بیرەوەرییەکانیدا روونی دەکاتەوە، ئەوانەی دەرەوەی خزمانی بوون، نزیکەی سێ هەزار کورد سزا دراون[٥٣]. ژمارەی ئەو کوردانەی تێکەڵی ئەم رووداوانە بوون (٣-٤) کەس بووە. کەچی ژمارەی ئەوانەی دوور خراونەتەوە هەزارانی رەت کردووە. لە لایەکی دیکەوە، ئەو کوردانەی ریدوان پاشایان

51- Aziz Nesin, bay Düdük, İstanbul, 1984, s.27-32.

52- Osman Nuri Ergin, İstanbul Şehreminleri, İstanbul, 1996, s.181.

53- Celîlê Celîl, Jîyana Rewşenbîrî û Sîyasî ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.121.



کوشتووە، بڕیاری خندکاندنیان دەدرێ، کەچی بە دارەوە ناکرێن. لە سەردەمی عەبدولحەمیددا، مەحموود پاشا کە بە شاعیر ناسراوە و سیانزە ساڵ وەزیری ناوخۆ بووە، وەکو گاڵتە لەگەڵ ئەو کوردانە بکا کە دوور خراونەتەوە. ئەم دێڕە شیعرە دەنووسێ:

**بی نقاط ایلـه حساب شاهی جیهان بویروغونو**

**((گیتدی کورتلر طوطاراق بیربیرینین قویروغونو))**[٥٤][*١٦].

سزادانی بەم شێوەیەی کۆمەڵەی کوردان، ناهەقییەکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا، لە بیرەوەریی (خانووی بەهێشووە وەنەوشەییەکان)ی خالیدە ئەدیب ئادیوار- دا ناوەناوە رووبەڕووی ئەم ناهەقییانە دەبینەوە. عەلی شامیل پاشای زڕباوکی نووسەری ناسراو، سەر بە بنەماڵەی

54- Çankırılı Hacışeyhoğlu Ahmed Kemal, Görüp, İşittiklerim, Göçek, Tef ve zil (Bir dergide yayımlandığı anlaşılan bu yazının bir fotokopisini bana gönderen Fahri Aral. Yazının nereden alındığını belirtmemiş).

[*١٦] لە راستیدا ئەم دێرەم لە دەقەکەدا بۆ هەندێك ئاسانکاری، من خۆم بەو شێوەیەم نوسییەوە کە دەیبینن. بۆ ژماردنی بەها (بایی) ئەبجەدیی پیتی دێڕەکە دەبێ بە رێنووسی عوسمانی بنووسرێتەوە کە بەو جۆرەیە لەم پەراوێزەدا دەینووسمەوە، لەگەڵ تێبینیی ئەوەی کە دوا پیتی وشەی (بربرینك) کە بە (ن) دەخوێنرێتەوە و بە (ك) دەنووسرا، هی دانە پاڵ شتێکە واتە (نسبە)، لە ژماردندا دەبێ هەر بە (ن) دابنرێ:

**بێ نقــاط ایـلـه حســاب شــاه جهـــان بویروغونو**

**((گیتدی کوردلر طوطاراق بربرینك قویروغونو)).**

واتە:

پیتە بێ خاڵەکانی فەرموودەی شای جیهان بژمێرە، کوردگەل کلکی یەکدییان گرت (یەك بە دوای یەکدا) رۆیشتن.. نیوە دێڕی دووەم بە ژمارەی ئەبجەدی (بێ نقاط) واتە بێ ئەوەی پیتە خاڵدارەکان بژمێررێن، دەکاتە (١٣٢٤)ی کۆچی - ی ساڵی ئەو رووداوەیە کە دەکاتە ساڵی (١٩٠٦)ی.ز (وەرگێڕ).

بەدرخانییەو[٥٥] دواتر ئەویش دوور دەخرێتەوە، ئەم جۆرە پێشڕەوییە توندەی عەبدولحەمید پەنای بۆ بردووە، دەبێ هۆیەکی بوو بێ. دوور نییە عەبدولحەمید، بۆ لەخۆ دوور خستنەوەی ئەو تاوانبار کردنانەی ئاراستەی ئەو شێوە روخسارەی ((کورد پارێزە))ی دەکرا، پەنای بردبێتە بەر بەم ئاراستەیە رێکردنە. لێکۆڵەرەوەیەك ئەم ناحەقییەی کورد تووشی هاتووە، بەمجۆرە دێنێتە گۆ: ((سوڵتان، لە جیاتی ئەوەی پێویستییە یاساییەکان جێ بەجێ بکا، لە ناو دیدی پڕ لە سەرسامیی حکومەتەکەیدا، بە دوور خستنەوەی بنەماڵەی بەدرخان بۆ تاراوگە، ئاوی خواردەوە))[٥٦]. لە نێوانی ریدوان پاشای سەرۆکی شارەوانی و عەبدوڕڕەززاق بەگی بەدرخانی لە ئەنجامی کێشەی نێوانیان لەسەر چاککردنەوەی رێگایەك ساڵی (١٩٠٦) ریدوان پاشا لە رێی چوونەوەیدا بۆ ماڵی خۆی کە لە (گوێزتەپە) دا بووە لە ئەنجامی هێرشێکی چەکدارانە دەکوژرێ. لە لێپرسینەوەدا دەردەکەوێت کە ئەوانەی تاوانەکانیان کردووە، ئەمانەن:

- عەبدوڵڵای کوڕی محەممەدی بتلیسی، تەمەن بیست و دوو ساڵ.
- محەممەد ئەسعەدی کوڕی سەعدوڵڵای وانلی، تەمەن بیست و دوو ساڵ.
- ئەمین عەبدوڵڵای کوڕی تاتاری حەکاری، تەمەن سی و پێنج ساڵ
- ئەحمەدی کوڕی محەممەد، تەمەن سی و پێنج ساڵ.

تاوانی رێکخستنی ئەم هێرشە ئاراستەی عەبدوڕڕەززاق بەگ و عەلی شامیل پاشای بەدرخان کرا. لە رۆمانی (وەك برینی شمشێر)ی ئەحمەد ئالتاندا کە سەردەمەکە دەردەخا، ئەوە روون دەکاتەوە کە بەر لە کوژرانی ریدوان پاشا، پیاوانی لە کوڕێکی عەبدوڕڕەززاق بەگ دەدەن. لە کاتێکدا ژمارەی ئەوانەی پێویست بوو سزا بدرێن دیار بوون، کەچی تەواوی ئەو بەدرخانییانەی لە ئەستەمبووڵ بوون. تەنانەت هەندێك لە دۆستە نزیکەکانیشیان رەوانەی تاراوگە کران.

یەك لەبەرچاوترینی ئەو کەسایەتییانەی بەدرخانییان کە لە ئەستەمبووڵ بوون، عەبدوڕڕەززاق بەدرخان بوو (١٨٤٦-١٩١٨). عەبدوڕڕەززاق بەگ لە غەڵەتە سەرایدا دەخوێنێ و لە سەرادا

55- Halide Edib Adıvar, Mor Salkımlı Ev, İstanbul, 1992, s.112.
56- Philip Mansel, Dünyanın Arzuladığı şehir: İstanbul, çev. Şerif Erol, İstanbul, 1996, s.316.



بە وەرگێڕی مابەین دادەمەزرێ، ئینجا دەبێتە (سێیەم تەشریفاتچیی مابەین)[*١٧]. فرەنسی بە چاکی فێر دەبێ و ماوەیەکیش لە کۆنسوڵێتیی عوسمانی لە پترسبۆرگدا وەك سکرتێری سێیەم کار دەکا. دوای رووداوی ریدوان پاشا، بەرەو تەرابولسی غەرب[*١٨] دوور دەخرێتەوە و ساڵی (١٩٠٨) دوای جاڕدانی مەشرووتییەت دێتەوە ئەستەمبووڵ، ماوەیەکی لێ دەمێنێتەوە، لەوێوە، پێشتر دەچێتە رووسیاو لەوێشەوە دەپەڕێتەوە بۆ کوردستان، عەبدوڕڕەززاق بەگ ساڵی (١٩١٨) لە ئەنجامی پیلانێکدا کە والیی مووسڵ رێکیخستووە لە عیراقدا دەکوژرێ. عەبدوڕڕەززاق بەدرخان بەر لە کوژرانی، چەند وڵاتێك گەڕاوە، پەیوەندی لەگەڵ ناوچە جیاجیاکانی کورددا دەبەستێ، ئەم تێکۆشانە ئەکتیفەی عەبدوڕڕەززاق لە ئەستەمبووڵ بووە هۆی ناڕەحەتییەکی زۆر[٥٧]، (سێرهێنری. ئی. وودس)ی ئەفسەری ئینگلیز کە نزیکەی چل ساڵ لە هێزی دەریایی عوسمانیدا کاری کردووە، لە بیرەوەرییەکانیدا بە پێدا هەڵدانەوە لە بارەی عەبدوڕڕەززاق بەگەوە دەدوێ. گەلێك جار دوای نانخواردن یاریی (بریج)[*١٩]ی لەگەڵدا کردووەو گاڵتەیان پێکەوە کردووە. ئی. وودس ئەوەش باس دەکا کە عەبدوڕڕەززاق لە کاتی نانخواردندا باسی خانمێکی کردووە کە یەکیناناسیوە، خانمەکە قسەی نابەجێی لە بارەی کوردەوە کردووە و عەبدوڕڕەززاق بەرپەرچی داوەتەوە. لەم بارەیەوە دەڵێ: ((سەر لە ئێوارەیەك بە خانمێکیان ناساندووە، ژنەکە کە زانیویەتی کوردە، بە سەرسووڕمانەوە لێی روانیوە، ئەم خانمە ئەوەندەی لە بارەی دزییەتیی کوردەوە قسەی بیستووە. سڵی لەوە نەکردووەتەوە راستەوخۆ بەو کەسە بڵێ کە بەر لە سەعاتێك یەکدییان ناسیوە: ((ئایا تۆ لەو کوردانەی کە وەکو دەزانین دزی

[*١٧] سێیەم تەشریفاتچیی مابەین: سێیەم کەس لە فەرمانگەی سەرپەرشتیکردنی پلە و پایە و بەخشینی مێداڵیا و .. بە پێی سەرەی پایە و پلە ئامادەبوونی ئەو کەسانە لە رێوڕەسمەکاندا ... مابەین: ئەو فەرمانگەیەی نێوانی میوانخانە و حەرەمدا بووە، نزیك و دەوروبەرەکانی سوڵتانی عوسمانیی لێ دەبوو .. (وەرگێڕ).

[*١٨] تەرابولسی غەرب (تەرابولسی خۆراوا): مەبەست وڵاتی لیبیای ئێستا بووە، بۆ جیاکردنەوەی لە شاری (تەرابولس)ی شام بە خۆراواییان ناساندووە. (وەرگێڕ).

57- Celîlê Celîl, Jîyana Rewşenbirî û Sîyasi ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.126.

[*١٩] بریج (Bridge): یارییەکی چوار قۆڵییە بە کاغەزی قومار لەسەر مێز دەکرێ. (وەرگێڕ).

گەورەن)). کوردەکەی بەرامبەری، لەبەردەمی خانمدا دەچەمێتەوە و دەڵێ: ((گەر بتەوێ یاخی بوومان پێ دەڵێی، بەڵام دز .. هەرگیز)). بەمجۆرە بە پێی تێگەیشتنی خۆی لێکدانەوەیەکی چاکی ئەنجام داوە(58). ئەم ئەفسەرە ئینگلیزە دەڵێ، لەو دەمانەدا کە یەکدییان ناسیوە، عەبدوڕڕەززاق (باش مابەینجی)(*20) بووە.

ئەوەی بەوە ناسێنراوە کە دەوری سەرەکیی لە رووداوەکانی رێدوان پاشادا بینیوە، عەلی شامیل پاشایە (١٨٥٥-١٩٠٨). عەلی شامیل پاشا لە شاری جزیرە لە دایك بووە. لە سەردەمی جەنگی عوسمانی-ڕووس-دا کە ساڵی (١٨٧٧) دەستی پێکردووە، لە ئەستەمبوڵ نزیکەی سێ هەزار کوردی خۆویستی کۆکردووەتەوە، بەشداریی لە جەنگەکەدا کردووە و لە بیست و پێنج جێوە بریندار بووە. خالیدە ئەدیب ئادیوار - ی نووسەری ناوداری تورك لە بارەی عەلی شامیل پاشاوە کە زڕبابی بووە، لە یادەوەرییدا  کە بە ناوی (خانووە بەهێشووە وەنەوشەییەکە)یدا درێژە بە هەندێك روونکردنەوە دەداو دەڵێ: ((عەلی شامیل پاشاش لەم رۆژانەدا لە ئویسکویدار، بووە سەرکردە (کۆموتان) و زوو زوو سەری لێ دەدایین، لە خانوویەکی گەورەی (کادی کوێی)دا دادەنیشت. دوو ژنی، یەکیان سوورو سپی و ئەوی دییان زنجی (ڕەشپێست) و هەردووکیشیان منداڵی رەنگاو رەنگیان هەبوو، چیرۆکی هێنانی ئەو خانمە رەشپێستەی زۆر خۆشە(59)، خالیدە ئەدیب ئادیوار لە بەشێکی بیرەوەرییەکانیدا لە بارەی چۆنیەتیی رابواردنی عەلی پاشاوە لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا دەڵێ: ((ئێواران زۆر کەیفخۆش بوو، جلی کوردیی بە کوڕەکانی لەبەر دەکرد، تاتە(*21) مەخمووره ئاوازێکی کوردیی دەژەند، لە پێش هەمووانەوە پاشا، کە هەڵپەڕکێیەکی کوردییان دادەمەزراند، بە فیکە ئاوازەکەی دووبارە دەکردەوە، هەر لەو کاتەشدا دەستی منی دەگرت و دیخستمە ناوهەڵپەڕکێکەوە. هەر هەموومان پێکەوە دەست و باسکمان دەجووڵاندەوەو ((هەی زەینۆ، هەی زەینۆ))مان دەگوت و ئاوێزە (چلچرا)کانی میچمان دەخستە لەرزە و خرمە خرم. پێمان بە زەویدا دەدا و

58- Sir Henry F. Woods, Türkiye Anıları, 1976, s.314.

(*20) باش مابەینجی: یاوەری سوڵتانی عوسمانی. (وەرگێڕ).

59- Halide Edib Adıvar, Mor Salkımlı Ev, İstanbul, 1992, s.97.

(*21) تاتە: تاتا: خوشکی گەورە (وەرگێڕ).



دەسووڕاینەوە و هەڵدەبەزیین، خانمە رەشپێستەکە لەسەرمندەرێکدا(*22) لەسەر زەوی دادەنیشت، خانمە سوور و سپییەکە هەر کە لە ژوورەوە دەردەکەوت، پاشا بەرەو پیرییەوە رای دەکرد، دەستی لە کوڵمەکانی دەدا و دەیگوت: ((خالیدە، ئەمە ژنە رەنگ تایبەتییەکەمە، دەست بە کوڵمەکانیدا بسوو بزانە قەت رەنگی دەچێتەوە؟))(60).

خانووەکەی عەلی شامیل پاشا، لە ناوچەی (خونکار ئیمام)ی گەڕەکی (ئاجی بادام)ی (کادی کوێی).. بە بۆچوونی (عەدنان ئیز)، دواتر کراوەتە قوتابخانەی نموونەیی عوسمانغازی، عەدنان ئیز لە کتێبی (کادی کوێیی سەردەمانی زوو)دا، ئەوەشی روون کردووەتەوە کە عەلی شامیل پاشا، سەرکردەی قشڵەی سەلیمییەی ئویسکویدار بووە و کاری کردووە. جگە لەوەی عەدنان ئیز لە بارەی ئەوەوە کە فەرید پاشای ئەڤلۆنیایی سەدر ئەعزەمی ئەو سەردەمە، لە بابەتی ئەو تەگەرە پێویستانەی خرانەبەر رێی بنەماڵەی بەدرخان پاشاوە ئەوە دەردەخا کە کاریگەریی زۆری بەسەر (پادشا)وە هەبووە. مێژوونووسان دەڵێن عەلی شامیل پاشا کە لە کادی کوێیدا بووە لەبەری ئەنادۆڵی ئەستەمبوڵدا، بە دادەوەری ناوبانگی دەرکردووە، بە تایبەتی ئەو بازرگانانەی لەو ناوەدا بوونە، خۆیان لە کاری نابەجێ پاراستووە، چونکە زۆر لە عەلی شامیل پاشا دەترسان. لەو لێکۆڵینەوەیەی عوسمان نووری ئەرگین - دا کە بەناوی (سەرەك شارەوانییەکانی ئەستەمبوڵ)(١٩٩٦) ئەم روونکردنەوەیە لە بارەی عەلی شامیل پاشاوە دەخاتەڕوو ((.. بەدبەخت، بەڵام زیرەك، ئازا، رای خۆ پەسەند، لەگەڵ سوڵتاندا راستگۆ، بەڵام ئەو وەزیرانەی بە بەدناوی ناسرابوون و ئەو پیاوانەی بە توندوتیژ دانرابوون، ئەم لە روویاندا دەوەستاو بە گژیاندا دەچوو. بەرامبەر خەڵکی هەژاریش بە مەرد و دەستکراوە ناسرابوو)).

عەبدوڕڕەززاق بەگ و عەلی پاشا کە بە بەرپرسی رووداوی (ڕێدوان پاشا) دانران، بە دوو نوێنەری گرنگی بەدرخانییانی ئەستەمبوڵ دادەنران، وەك دوو کەسایەتی دادەنرێن کە قسەیان لە ناو کوردانی پایتەختدا دەڕۆی، ئەم دوو کوردەی بە ئازایەتی ناسراون و لە لایەکی دیکەوە پەیوەندیی پتەویان بە (سەرا)وە داین دەکرد. دەبێ لەبەر ئەم رێو شوێنە بەهێزەیانەوە بێ کە ئەم دوو بەدرخانییە ناویان لە ناو شەقاوەکانی ناو رۆمانی (ئەو زریانانەی بە شەقاوەکانی

(*22) مندەر: دۆشەکی گچکەی دانیشتنی یەك کەسی. (وەرگێڕ).

60- age. S.98.

ئەستەمبوولی کۆن دەژمێران)ی (ڕەفیع جەواد ئەلۆنای)دا دانراون: ((ئەوسا پیاوە دەستڕۆیکانی ناو بەڕێوەبەرایەتیی دەوڵەت، لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیان بە گرووپی جودا جودا دادەنران، ئەمانە کە سەرەکۆزەری بێژنگ دەژمێران، عەلی شامیل پاشای پارێزگاری ئویسکویدار بوو. لەناو دەستوپێوەندی ئەمدا کورد هەبوون. تاهیر پاشای سەرکردەی چەکدارە ئەرناوت (ئەلبانی)یەکان و چەکدارەکانی، باڵێکی دیکە بوون))[٦١]. لە کتێبی (سەرەك شارەوانییەکانی ئەستەمبووڵ)ی (عوسمان نووری ئەرگین)دا عەلی شامیل پاشا لەگەڵ فەهیم پاشا بەراورد کراوە: ((لەو سەردەمەدا لە ناوچەی غەلەتە (گەڵەتە سەرای) و (بەیۆغلۆ) و (شیشلی)دا فەهیم پاشا هەرچییەك بووبێ، عەلی شامیل پاشاش لە ناوچەی ئویسکویدار و کادی کویی - یدا تاکە فەرمانڕەوای سەربازی و سویل و شارەوانی بووە، ڕێوشوێنی بەهێزی ئەم کەسایەتییە کوردانە، دەبێ کاری لە کۆکردنەوەی کۆمەڵە کوردێکی دیاری ئویسکویدار و کادیکویی کردبێ، وەکو پێشتریش گوتمان، ئەمین عالی بەدرخان و منداڵەکانی کە لە ریزی پێشەوەی بەدرخانییاندا بوون، لە کادیکوییی بەری ئاسیای ئەستەمبووڵدا بوون.

دواتر ڕووداوی ریدوان پاشا لە ڕۆمانی (وەك برینی شمشێر)ی ئەحمەد ئەلتاندا کاری لەسەر کراوە. مەهپارەخان کە یەکێکە لە پاڵەوانانی ڕۆمانەکە، دراوسێی عەبدوڕڕەززاق بەدرخان بووە کە لە (شیشلی) دادەنیشت، لە ئەنجامی ئەو پێکدادانەی لە رووی نووژەنکردنەوەی ئەو ڕێیەوە رووی دا کە دەچووە لای کۆشکی عەبدوڕڕەززاق بەگ، کوڕی عەبدوڕەڕەززاق بەگ دەکوژرێ، لە سەر ئەو ڕووداوە عەلی شامیل پاشای بەدرخانی سەرکردەی ئویسکویدار بەخۆ دەکەوێ و لە ئەنجامدا لە لایەن پیاوەکانییەوە ریدوان پاشای سەرۆکی شارەوانیی ئەستەمبووڵ دەکوژرێت. لە ئەنجامی ئەم ڕووداوەی کە ناکۆکیی نێوان بەدرخانییان و سەرا پتر دەکا، تەواوی ئەو بەدرخانییانەی لە ئەستەمبووڵ بوون بۆ وڵاتانی دیکە دوور دەخرێنەوە. لە ڕۆمانی نیمچە مێژوویی (وەك برینی شمشێر)دا، ئەحمەد ئەلتان تۆماری کردووە، ئەم چەند بڕگەیەی لە بارەی کارەساتی کوردانەوە لێ دەگوێزینەوە: ((ڕێك دوو هەزار کەس لە نەوەی میر بەدرخانی بەگزادەی کوردی بەناوبانگ، پەیوەندییان بە تاوانەکەوە بووبێ یان نەبووبێ لە ماڵەکانیانەوە کۆکرانەوە و خرانە ناو کەشتییانەوە و ڕەوانەی تاراوگە کران. زۆریان تووشی پەرێشانی هاتن،

61- refi Cevad Ulunay, Eski İstanbul Kabadayları, 1995, s.167.



خێزانیان پەرت و بڵاوبوونەوە، ژنان لە مێرد، منداڵ لە باوکان دوور خرانەوە، زۆرێکیان یەکدییان نەدیتەوە، لە ناو هەناسە ساردیدا، لە دەشت و دەردا، لە ڕەشماڵی ڕەوەنداندا ژیان، ئەوانەی توانییان هەڵبێن، لە ئەورووپا، لە ژووری بێ خۆرەتاوی پەنسیۆنەکاندا دەژیان، بێ ئەوەی دۆستێك هەبێ قومە ئاوێکیان بداتە دەست، یان خزم و خوێشێکیان لە تەك بێ گەردنئازادییان لەگەڵدا بکەن، خۆشەویستێك نەبوو کە لە دنیایەکەوە دەپەڕینەوە دنیایەکی دیکە، دەستیان بگرێت و سەرسامیی دواساتەکانی ژیانیان لێ سووك بکاتەوە و ... کۆچیان کرد و ڕۆیشتن)).

## هەندێک لەو شوێنانەی کوردیان لێ بووە

دەستنیشانکردنی هەموو ئەو شوێنانەی کورد لە ئەستەمبووڵدا بە شێوەیەکی کۆمەڵ کۆمەڵ تێیدا بوون و دەژیان زەحمەتە. کوردەکان لە کوێ ژیاون و لە چ جۆرە کارێکدا کاریان کردووە و کاتی دەستبەتاڵییان بەچی و لە کوێ بەسەر بردووە، هەوڵمان داوە وەڵامی ئەمجۆرە پرسیارانە، با بەشێوەیەکی سنوورداریش بێ لە بەشە جیاجیاکانی ئەم کتێبەدا روون بکەینەوە.

کاتێك ئەو جێیانە دەستنیشان دەکرێن کە کەسایەتییە دیارەکان و بەتایبەتی تاك تاکەی کەسەکان کاریان تێدا کردووە و لێی مردوون و ئەو گۆڕستانانەی لە ئەستەمبووڵدا لێی نێژراون، سوودمان لە سەرچاوە جیاجیاکان وەرگرتووە. بۆ نموونە ئەو رابەرانەی تەلەفۆن، کە لەو ساڵانەدا بڵاوکراونەتەوە. ژمارەی تەلەفۆنی هەندێك کەسایەتیی کورد و ناونیشانی جێی کارکردنیان تێدایە.

ناوی هەندێك شەقام و کۆڵان لە هەردوو بەری ئەستەمبووڵدا ناوی کەسایەتییە کوردە جیاجیاکان و ناوی هەنێ لە ناوچەکانی کوردستانیان لێ نراوە، هەندێك لەم ناوانە لە دەمانێکی زۆر کۆندا و هەندێکی دیکەیان لەم ساڵانەی دواییدا لەو شوێنانە نراون. ناوی هەندێك لەم شەقام و کۆڵانانەی وا لە ئەستەمبووڵدان، لە خوارەوە بەڕیزبەندیی ئەلف و بێ ریزکراون.

ناوی ئەو جێیانەی ئەستەمبووڵ، ئەوە دەردەخەن کە بە چڕی کوردیان تێدا ژیاوە. ئەم ناوانە سەرەداوی وا گرنگمان بە دەستەوە دەدەن، ئەو ژمارانەی بەرامبەر ئەم ناوانەی شەقام و

کۆڵانانە، ژمارەی ئەو شەقام و کۆڵانانە پیشان دەدەن کە ئەو شەقام و کۆڵانانەی بەری ئەنادۆڵ هەر بەو ناوانەوە ناسراون[٦٢]:

**بەری ئەوروپا:**

شەقامی ئەبو سعوود — ئەمینوێنو

کۆڵانی ئەرزنجان — شیشلی

کۆڵانی شوکری پاشای ئەرزەڕۆمی — بێشکتاش

کۆڵانی خەرپووت — شیشلی

کۆڵانی ئیدریس — ئەییووب

شەقامی ئیدریس کوێشکی — ئەییووب

کۆڵانی مزگەوتی کورد چەلەبی — بەیۆغلۆ

کۆڵانی کوردان — فاتیح (ناوە تازەکەی کۆڵانی گایە- یە)

کۆڵانی مەلازگرد — بێشکتاش

شەقامی مەلا گۆرانی — فاتیح

کۆڵانی سولەیمان نەزیف — شیشلی

کۆڵانی نابی - ی شاعیر — فاتیح

کۆڵانی نابی - ی شاعیر — بێشکتاش

62- İstanbul şehir Rehberi, 1934 ve İstanbul-Anadolu yakası, 1998 adlı Kaynaklardan yararlanılmıştır.



**بەری ئەنادۆڵ (ئاسیا):**

شەقامی دیجلە — (٨)

کۆڵانی دیاربەکر — کەرتاڵ

شەقامی ئەرزنجان — عومرانییە

شەقامی ئەرزەرۆم — عومرانییە

شەقامی ئەرزەرۆم — (٥)

شەقامی فرات — سوڵتانییە

شەقامی فرات — عومرانییە

شەقامی فرات — (١٥)

کۆڵانی خەرپووت — (٣)

کۆڵانی قارس — (٣)

کۆڵانی مەلا گۆرانی — پەندیك

کۆڵانی مەلا گۆرانی — عومرانییە

شەقامی مەلاتییە — عومرانییە

شەقامی مەلاتییە — (٣)

کۆڵانی مەلاتییەییان — سەماندرا

شەقامی مەلازگرد — (٧)

کۆڵانی مەراش — (٣)

کۆڵانی سیلڤان — پەندیك

کۆڵانی سیلڤان — ئویسکویدار

کۆڵانی سیڤەرەك — كەرتاڵ

شەقامی شانڵی ئورفە — (٣)

کۆڵانی تونجێلی — (٣)

کۆڵانی وان — پەندیك

کۆڵانی وان — سوڵتانبەگی

کۆڵانی وانیکوێی — ئویسکویدار

شەقامی زیا گوێگ ئالْپ — (٢)

کۆڵانی زیا گوێگ ئالْپ — (٣)

نەك هەر ناوی شەقام و كۆڵان، ناوی هەندێك شوێنی دیكەش لە ئەستەمبوڵ سەرنجڕاكێشە. یەك لە مانەش لە بەری ئاسیای بوغازدا ئەو ناوچەیەیە كە ناوی (وانیكوێی)ە لەبەر ئەوەی محەممەد ئەفەندی خەڵكی وان بووە، ناوچەكە بەم ناوەوە ناسراوە. دوای نێشتەجێ بوونی لە ئەستەمبوڵ، محەممەد ئەفەندیی وانی لە گەڵێك كاردا دامەزراوە و شەیخولئیسلامەتییشی كردووە و ساڵی (١٦٨١) كۆچی دواییی كردووە. رەشاد ئەكرەم كۆچو كە پشتی بە مێژووی (سیلاحدار) بەستووە، باسی ئەوە دەكا كە شێخێكی كورد بە ناوی عەبدوڵڵا ئەفەندییەوە لەو سەردەمانەدا چووەتە ئەستەمبوڵ و لەگەڵ محەممەد ئەفەندیی وانیدا دەمێك بە كوردی و دەمێك بە عەرەبی قسەیان كردووە.

بە پێی هەندێك قسە، نەوەی محەممەد ئەفەندیی وانی، تا ئەمڕۆش لە ئەستەمبوڵدا ماون. بە پێی هەندێك تێبینی كە لە ئەنسكلۆپیدیای ئەولیاكاندا هەیە، بۆ نموونە ئەحمەد ئەفەندیی وانی كە لە شێخانی تەكیەی وان بووە، ساڵی (١٨٠١) لە ئەستەمبوڵ مردووە: (نزیكی نوێژگەی كەمال زەهگیرجی لە (سیلیڤری كاپی)ی فاتیحدا ئەو تەكیەیەی لەو سەردەمانەدا رووخاوە، نەوەكانی، زەوییەكەی وەك شوێنێكی دار فرۆشتن بەكار هێناوە)). نازانین لە نێوانی ئەم دوو وانییانەدا خزمایەتی هەیە یان نا.



یەك لەو شوێنانە لە ئەستەمبوڵدا لە كۆنەوە جێی كوردەكان بووە، ئەو قاوەخانەیەیە كە كوردی لێ دانیشتوون. لەو لێكۆڵینەوەیەی سەلاح بیرسەل-دا كە بە ناوی (كتێبی قاوەخانەكان)ەوەی نووسیوە، لە بارەی قاوەخانە كۆنەكانی كوردانەوە هەندێك زانیاری روون دەكاتەوە، لە ریزی پێشەوەی ئەم قاوەخانانەدا ئەمانەن:

- قاوەخانەی محەممەدی كورد - لە نێوان عەزاب قاپی و كوورەچی قاپی - دا.

- قاوەخانەی یووسفی كورد - ئەم قاوەخانەیە، كە لە ئیمراهۆردا بووە بە یەك لە قاوەخانە بەناوبانگەكانی ئویسكویدار دەژمێررێ: ((قاوەخانەی یووسفی كورد، قاوەخانەی گەڕەك نەبوو، یانەیەك بوو بۆ خۆی، پیاوە قسەزان و قسە خۆشەكانی گەڕەك دەهاتنە ئەوێ، قسەی خۆشیان دەكرد، دۆستایەتییان دەكرد. لە سەرووی ئەمانەوە مەلایەك هەبوو لە ئیمراهۆردا لەو ماڵە دادەنیشت كە بە تەنیشت تەكیەی مەولەویدا بوو. ریش زەرد، شێوەی جلوبەرگ پاك و خاوێن، جوانی پیاوانە، مەلا بەگێكی سەر بەمێزەر بوو. لە لایەكی دیكەوە لاوان لە یانەی وەرزشی ئەنادۆڵەوە عاتف - ی خودا لێخۆشبوو، هودایی برای بورهان فەلەك - ی خودا لێخۆشبوو و شەمسی و ماجید، هەموویان لەم قاوەخانەیەدا كۆ دەبوونەوە، پێدەكەنین و كاتیان بەسەر دەبرد. ئەو لاسایی كردنە بێ وێنەیەی بورهان فەلەكی عەجەمەكان، ئێمەی لە پێكەنین دەكوشت. ماوەیەك تۆفیق نەیزەن - یش فێرە قاوەخانەی یووسفی كورد بوو بوو. لە گیرفانی ناوەوەی نیو قاپەكەی دەردەهێناو بە بەژنیدا هەڵدەدا و گۆرانیی دەگوت:

**خانم ئەم نازە باوێ**

**بێرە لامان تاو تاوێ**[*٢٣]

ئەوەشی لە بیرنەدەكرد جارجارێ مەتارەكەی بە دەمەوە بنێ و مژ لە ئارەقەكەی بدا)).

(*٢٣) ئەمەم وەك وەرگێڕانی ئەو دوو نیوە دێڕە داناوە كە توركییەكەی ناو دەقەكە، ئەمەیە:

**Hanım etme bu nazı**

**Gel bize bazı bazı**

- قاوەخانەی محەممەد ئەفەندیی خەرپووتی: لە (دیرەکلەر ئاراسی)دا بوو، بە چایخانەی محەممەد ئەفەندیی خەرپووتیش ناسرابوو.

- قاوەخانەی دیار بەکر: کە چەمبەرلی تاش - ت ڕەت دەکرد بەلای چەپدا لە گۆشەی (سەرسووچی) کۆڵانی قەرەبابا (ناوە تازەکەی کۆڵانی دوێنەم) دا بوو. لە سەرەتای سەدەماندا (سەدەی بیستەم) ئەو ڕووناکبیرە کوردانەی لە ئەستەمبوول بوون زوو زوو سەریان لەم قاوەخانەیە دەدا کە سەلاح بیرسەل لە بارەیەوە دەڵێ: ((تانپینار بە زۆری لەگەڵ حیلمی زیا ئویلکەردا دەهاتە قاوەخانەی نوێی خۆرهەلات. هەندێ جاریش ئەتاچ موکریمین خەلیل، عوسمان جەمال قایغیلی - ش لێرە یەکیان دەبینی. لە ساڵانی دواتردا لە (دیوان یۆڵو)دا، کە چەمبەرلی تاشت ڕەت دەکرد بە دەستە چەپدا لە گۆشەی کۆڵانی قەرەبابادا قاوەخانەی دیار بەکریش ڕووناکبیرانی بۆ خۆی کێش دەکرد. ئیحسان حەمیمزادە، رفعەتی کلیس - ی سەر بە ئێرەدا دەکەن، شاکیر ئویلکو قەشاریش کە ئەندامێکی دامەزراوەی زمانی تورکی بوو (کۆڕی زانیاریی زمانی تورکی) زوو زوو دەهاتە ئێرە، ماوەیەکیش سوعاد کەمال یەتکین - یش فێری ئێرە بوو بوو. دواتریش شەوکەت رادۆش هاتوچووی دەکرد)).

- قاوەخانەی جەعفەر ئەفەندیی نەوەی زارۆ ئاغا: ئەم قاوەخانەیەی لە (دۆغرویۆڵ) دا بوو، کۆڵهەڵگر (حەماڵ)ەکانی لێ دادەنیشتن.

- قاوەخانەی حاجی - کە ئەحمەد نەعیم - ی بابانزادەی یەك لە کوردەکانی بابان لەوێ دادەنیشت. سولەیمان نەزیفی دیاربەکری کە لە مۆدە دادەنیشت و دواتریش لە کۆڵانەکانی پشت نیشانتاشی- دا لە ژوورە گچکەکەیدا بە مردوویی دیتراوەتەوە، ئەو قاوەخانانەی لە (توربە)[*٢٤] ، لێیان دادەنیشت وەك (قاوەخانەی خۆرهەلاتی نوێ) پێویستی بە یادکردنەوەیە.

لە قاوەخانەی خانی یۆڵگێچەن - ی گەڕەکی پەرماق قاپی کە لە نێوان بایەزید (بێیازت) و (چەمبەرلی تاش) دایە، شوکری ئەفەندیی مەدداح لاسایی کەمینە ئەتنییە جیاجیاکانی

(*٢٤) توربە: وشەیەکی عەرەبییە لە (توراب- تراب)ەوە وەرگیراوە، واتە: خۆڵ، گڵ .. وشەکە واتای (گڵکۆ) دەگەیەنێ. لە هەندێك شوێندا بە واتای (گۆڕ) بەکاردەبرێ (وەرگێڕ).



دەکرد و ژیانی ڕابواردنی ئەستەمبوولی ڕەنگین دەکرد: ((بە کورسییەك و مێزێکی گچکەوە، لەسەر بەنداوەکەدا ئامادەیە، دوای ئەوەی لەسەر کورسییەکە دادەنیشێ تێلای دەستی ڕاستی دەخاتە سەر مێزەکەو زەمبیلی دەستی چەپی لە لای کورسییەکە دادەنێ. زەمبیلەکە شەپقە و سەرپۆشی جۆرا و جۆری تێدایە. بۆ لاسایی کردنەوەی عەرەب، کووفییە (چەفیە-مەندیل)، بۆ لاسایی کردنەوەی (کەرەمان)ی فێسێکی زل و بۆ ئەرمەنییان (تاککە)، بۆ ئەرناوت (فێسی سپیی ڕۆندار (دەبێ بریقەدار بێ!)، بۆ چەرکەس قاڵپاخ و بۆ کورد کڵاوی لباد...ی لە بیر نەدەکرد. شوکری ئەفەندی جلوبەرگی کورد نا، .. کەمایەتییەکانی دیکەش کە لە ئەستەمبوول دەژین، ڕەنگی دیکەیان تایبەت بەو کەسانەی لاساییانی دەکرد لەبەر دەکرد و بە جووڵە دەکەوت[٦٣].

کورد، یەك لە نموونە سەرەکییەکانی فۆلکلۆری ئەستەمبوولی پێکدەهێنا، تەنیا بە فۆلکلۆری ئەستەمبوول تێکەڵ کردووە، لە (تەماشای تورك-شانۆی تورك)ی لێکۆڵینەوەی سەلیم نوزهەتدا کە ساڵی (١٩٣٠) بڵاوکراوەتەوە، لەم بارەیەوە زانیاریی سەرنجراکێشی تێدایە، هونەرمەندان، حەققی بەگ و سەعید بەگ چۆن لاسایی کوردەکانیان کردووە، بە فۆتۆگرافەوە لێیان کۆڵراوەتەوە .. ڕەشاد ئەکرەم کۆچو، لە کتێبێکدا کە پەیوەندیی بە تروومپاچییانەوە[*٢٥] هەیە، باس لە ئاهەنگەکانی خەتەنە کراوە،کە تروومپاچییەکان دەیانگێڕا، لەم ئاهەنگانەدا کۆڵهەڵگرە کوردەکان بە پێی داب و نەریتی خۆیان چالاکییان دەنواند و دەڵێ: ((ئاهەنگەکانی خەتەنە کردن لە لای تروومپاچییەکان تایبەتمەندیی دیکەی خۆی هەبوو، لە هەر یەکێك لەم ئاهەنگانەدا کۆڵهەڵگرێکی کوردی تەمەن چل پەنجا ساڵیی هەر تێدا دەبوو کە بە هەر هۆیەکەوە بێ خەتەنە نەکرابێ، ئەم کابرا پیرەش لەگەڵ منداڵاندا خەتەنە دەکراو بە کڵاوی سەری و ملوانکەی بۆ چاوەزاری ملی و لەسەر دۆشەگێك دادەنرا، ئەم کۆڵهەڵگرە کوردەش دەبوو و مایەی نوقڵانەو پێشبینیی خۆشی.

63- Salah Birsel, Kahveler Kitabı, İstanbul 1991, s.208.

(*٢٥) ترومپاچی (طولومباجی): بەو کەسانە دەگوترا کە لە ئاگر کوژاندنەوەدا کاریان کردووە و ئەو ئامێرانەی ئاو گوازتنەوەیان بەکار دەهێنا کە (ترومپا) یان پێ دەڵێن. (وەرگێڕ).

له لایەکی دیکەوە، ئەم ترۆمپاچییانە (٤٠-٤٥) ساڵییە بۆ بە تەنیا نەهێشتنی ئەو کوردە نامۆیە و نەکردنی بە بابەتی رووداو، دەچووە شێوەی منداڵی خەتەنە کراو.. بەڵام لە جیاتی ئەوەی کڵاوی لەسەر بنێن، تانجە گوڵینەیەکی لە (سیر) دروستکراوی بە فێستە پاڵەوانانەکەیدا دەکرد. دەوروبەری ئەو ترۆمپاچییە دەبووە شانۆی پڕ چالاکیی نمایش، لە لایەن خەڵکەوە بەخشش باران دەکرا، ئەم پارەی بەخششەش لە نێو هاوکاراندا دابەش دەکرا کەوا کارێکی داهات باشیان بە دەستەوە نەبوو)).

دەستنیشانکردنی شوێنی ژیانی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوڵ ژیاون و کاریان لە چیدا دەکرد و چ کارێکیان کردووە و بە چییەوە خەریك بوون، باسکردنی ئەم لایەنانە لەناو چوارچێوەیەکی دیاریکراودا، زەحمەتە بەڵام هەندێك بەڵگە هەن پەیوەندییان بەم لایەنەوە هەیە و لەو بارەیەوە سەرەداوی گرنگمان بە دەستەوە دەدەن. لە بارەی هەندێك کەسەوە کە بوونەتە ئەندامی کۆمەڵەی (تەعالیی کوردستان)، کە ساڵی (١٩١٥) دامەزراوە، لە لیستەیەکدا کە لە لایەن کەسانی پەیوەندیدار بە ئاسایشی ئەو سەردەمەوە ڕێکخراون، بۆ نموونە لە بارەی کار و فرمانی ئەم کەسانەوە تاڕادەیەکی بەرز روونکردنەوەی بە سوودی پێوە دیارە لە لیستەیەکدا کە (ئۆغوز ئای تەپە) لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکیدا لە بارەی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە بڵاوی کردووەتەوە، کارو پیشەی هەندێك لەو ناوانەی لەو لیستەیەدایە بەمجۆرەیە:

عەبدولقادر نووری ئەفەندی — مامۆستای دارولفونوون بووە.

ساڵح رەیس — سەرۆك کۆمەڵە.

محەممەد روشدی بەگ — بازرگان.

سەعید عەلی ئاغا — کاسبکاری عەرەبانەچی.

حوسێن حوسنی ئەفەندی — کاسبکاری هێزم فرۆش[*٢٦].

عەلی شامیل (گوێکال) — قاوەفرۆش.

[*٢٦] هێزم: داری لە سووتاندندا بەکارهێنراو.. (وەرگێڕ)



حوسێن حوسنی بەگ — خاوەن دەرمانخانە.

کەمالەددین بەحری زادە — مەئموور مەرکەزی پۆلیسی (کادی کوێی)

ئیبراهیم ئەدهەم بەگی ئەمین بەگزادە — فەرشفرۆش لە (بەدەستان)دا.

حەسەن ئەفەندی — لە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیدا.

یووسف زیابەگ — لە جێنشینەکانی وەزارەتی بازرگانی و کشتوکاڵ.

شەعبان ئاغا — کوێخای کۆڵهەڵگرە کۆنەکان.

شەرەفەددین ئەفەندی — قوتابیی قوتابخانەی بازرگانی.

دەروێش ئەفەندی — خاوەنی قیرائەتخانە (چایخانەی بە رۆژنامە و کتێب).

یووسف کەنعان پاشای سیباهزادەی ماردینی ـ کۆنە پشکنەری تەحەرریی ئەستەمبووڵ.

عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی — فێرکار.

سەدرەددین بەگ — موتەسەرریفی کۆنی ئویسکویدار.

جەمال بەگ — بەیتار (پزیشکی ئاژەڵ).

محەممەد خەلیل ئەفەندی — بازرگانی خەڵووز.

خەلیل بەگ — کۆنە بەڕێوەبەری پۆلیس.

عوسمان نووری ئەفەندی — مامۆستای ئایینی گشتی - ی فاتیح.

عەبدوللەتیف ئەفەندی — شوفێری Pötürgeli.

فەیزی بەرکۆ بەگ — دکتۆری (چارسەنجەق).

تۆفیق بەگی سلێمانی — کۆنە قایمقامی یەڵۆڤا.

ڕەمەزان ئاغای شیرڤەیی — خەڵووز فرۆش.

یووسف قادر ئۆغڵو — کۆڵهەڵگری سعرتی.

یاسین یووسف ئۆغڵو — کاسبکاری سعرتی.

سەید مەحموود سەید ئەحمەد ئۆغڵو — دارتاشی سعرتی.

سولەیمان عیسا ئۆغڵو — رەنجبەر.

حەسەن خالید ئۆغڵو — نووسەری ئەرزنجانی[٦٤].

هەندێك لەو ترومپاچییانەی ئەو ئاگرانەیان دەکوژاندەوە کە لە ئەستەمبوولدا دەکەوتنەوە، کورد بوون. ترومپاچییەتی پیشەیەکی سادە و باوی ئەو سەردەمە بووە. یەك لەو مەترسییانەی هەڕەشەی لە ئەستەمبوولّ دەکرد، ئەو ئاگرانە بووە کە زۆر تەنیوەتەوە و بووەتە هۆی لەناوبردنی گەلێك خانوو و کارگە و بینای مێژوویی. ئەم تروومپاچییانە بۆ دەستبەجێ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرانە هەوڵێکی بێوچانیان داوە. ئەو کۆمەڵەی ئەو تروومپاچییانە پێکیاندەهێنا و شێوە جلوبەرگێکی تایبەتیان هەبووە، ناوی (سندووق) یان لێ نراوە. هەر تروومپایەك بە چوار کەس هەڵگیراوە، پێیان دەگوترا (تاقم). هەر سندووقێك کەسانی بەهێزی گرووپی بەڕەسەن جیاجیای ئەتنیکیی تێدا بووە. بەتایبەتی لاوان پابەندییەکی گەورەیان بەم پیشەیە دەنواند. لە نێو ئەم تروومپاچییانەی لەلایە جیاجیاکانی ئەستەمبوولّ کاریان ئەنجام دەدا، هەندێك کوردیش هەبوون. بۆ نموونە ساڵی (١٨٩٩) لە ناوچەی (جەللاد چەشمەسی)ی (ئاق سەرای)دا لەبەرپابوونی ئاگرێکدا (بەهادر)ی کورد لەگەڵ دوو برادەری دیکە، پێکەوە کە هەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکە دەدەن بەژێر دیوارێکدا بوون و گیانیانان لە دەست داوە. بۆ ئەم تروومپاچییانە ئاگری گۆرانیی (جۆری تورکی)ی[*٢٧] داستانی تروومپاچییان هەڵگیرسێنراوە:

**یەکمان ئینجە عەرەب بوو نــاو لــە ناوان**

**هیــــدایەت بــوو نــاوی ئــەوی دیکەمــان**

---

64- Oğuz Aytepe, yeni Belgelerin ışığında kürt Teali cemiyeti, Tarih ve Toplum. 174/ 1988.

[*٢٧] تورکی: جۆرە گۆرانییەکی بە مەقامی تایبەت بە تورکان دەگوترێن. (وەرگێڕ).



**گــەنجی گــەلێك تــوانا بــووین و قارەمان**

**بۆ گشــت خــەڵکی کەوتینە باسی خۆمان**

**❋**

**هاوڕێیەکمان بــوو (بەهادر) نــاوی، کورد**

**کوتــوپــڕ کـــارەسات هــات، هێرشی بــرد**

**لـــە زۆر لادا ئـــاخ و داخی بــەرپــا کرد**

**کــەوتینە نـــاو تــۆفانێك، بــەڵام تــۆفان**

**❋**

**بۆ هەر کەسێك کە دوور بێ لە کەسوکار**

**تــرومپــاچێتیی بـــۆ دەبێتـــە بــیروکــار**

**لە (مەنگەنە) نــاسراین و بووینە نــاودار**

**ئــا بەم نــاوبــانگەوە هاتینە مـــەیـدان![*٢٨]**

---

[*٢٨] ئەو گۆرانییەم بەجۆرە کردووەتە کوردی کە دەقە تورکییەکەی بەجۆرەیە (وەرگێڕ):

**Birimizde ince Arab şühret**

**Birimizin ismi idi Hidâyet**

**Bahâdir tüvânâ genç idik gaayet**

**Ahvâlimiz halka ilâna düşdük**

*

**Bahâdır kürd idi refîkin biri**

**Üçümüz kazâya uğrattik seri**

**İşiden âh itse vardır çok yeri**

لەگەڵ (بەهادر)ی کورددا، ئینجە عەرەب و کەسێکی دیکەی هیدایەت ناو ئەندامی سەندیکای ناوچەی (مەنگەنەی غەلەتە)، لەم ئاگر بەربوونەوەیەدا گیانیان لەدەست داوە. لە کتێبی (ترومپاچییانی ئەستەمبوڵ)ی (ڕەشاد ئەکرەم کۆچو)دا باسی تیپە جوداکانی ترومپاچییە کوردەکان و بەسەرهاتەکانیان کراوە. داودی کورد، دلاوەری کورد، حەسەنی کورد، لە ریزی پێشەوەی ئەمانەدان. لەو رۆژانەدا حەسەنی کورد کە لە تەمەنی نەوەت ساڵیدا بووە، لە کاری جوداجودادا لە ئەستەمبوڵ کاری کردووە و ماوەیەکیش ترومپاچییەتیی کردووە.

لە کتێبی ترومپاچییەکانی ئەستەمبوڵی رەشاد ئەکرەم کۆچودا لە بارەی حەسەنی کوردەوە زانیاریی ورد باس کراوە: ((لە ساڵانی یەکەمی جەنگی گشتیدا کە تەمەنی لە سەرووی نەوەدەوە بووە مردووە. ئەو لە پیرییدا، سەر زیندووانە لە ئەسکەلەی یاغقەپانی - ی غەلەتەدا قاوەچییەتیی خانی دەکرد. بە خۆیشی لە ئەسکەلەدا لە قاوەخانەی کۆڵهەڵگراندا دادەنیشت. وەجاخی خان لەلایەن کوڕی واتایی، موستەفا ئاغای نەنلی کە لە ئاوارەکانی بولغارستان بووە، بەڕێوەدەبرا. حەسەنی کورد لە لاوییدا لە کرێکارانی بەشی (گامێش)ی تەرسانە بووە، کە کرێکارانی ئەم بەشە ئاوی حەوزەکانیان بەتاڵ دەکردەوە و چاودێریی ئەو گامێشانەیان دەکرد کە دۆڵابەکانی ئاوکێشانیان دەخستە گەڕ. لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا لە هێزی دەریاییدا وەرگیراوە. لە جەنگی (قرم)دا بەشداریی کردووە و لە گەڕانەوەشیدا لە پێشان بووەتە ترومپاچی و دواتر بووەتە کوێشکلو[*29] (ئێشکگری ئاگر

---

**Böyle bir acaib tufâna düşdük**

*

**Herkes için ayrı olur kes û kâr**

**Tulumbacılık idi bizdeki efkâr**

**Mengenede idik gaayetle namdâr**

**İşbu şöhret ile meydâna düşdük.**

(*29) کوێشکلو: ئێشکگری ئاگر کوژاندنەوە (وەرگێڕ).



کوژاندنەوە)، کابرایەکی نیمچە کەڵەگەت، موو رەش، سمێڵباڕ، ریش تاشراو و رەوشت بەرز، عاشقی جوانی، هەمیشە چاکشری ی[*30] تا ئەژنۆ تەسکی لە پێ دەکرد. لە دەوروبەری خۆیدا رێزی لە رادەبەدەری بۆ خۆی وەدەست هێنابوو، خووی بە قاوە و نێرگەلەوە گرتبوو. لە کاتێکدا کە نەخوێندەوار بووە، سنووری خۆی دەزانی و گاڵتە و گەمەی لێ قبووڵ دەکرا، ئەم دێڕانەی خوارەوە هی ئەم (واسف)ە گوناهکارەن:

**((پیرە کورد، حاجی حەسەن .. پیری رەنگداکوتاوان**

**لە رێگەی خوار و خێچدا، هەنگاوی راستە و رەوان**

**جوانی پەرستێکە ئەو، دەبتە بەندەی دلبەری**

**تیغی خاوێنی ڤینی، بە عەرشدایە ئاوێزان!**

**ئەی ئەوەی پێی دەلەرزێ و چاو بۆ جوانان دەگێڕێ**

**گەر تەمەنی دەپرسن، هەشتاو پێنج، نەوەت ساڵان ..))**[65][*31]

---

(*30) چاکشری: جۆرە شەرواڵێکی کالاّ تەنکە (وەرگێڕ).

65- Reşad Ekrem koçu, İstanbul Tulumbacıları, İstanbul, 1981. s.411.

(*31) شیعرەکەم بەجۆرە کردووەتە کوردی کە تورکییەکەی ئەمەی خوارەوەیە، (وەرگێڕ):

**Köklüerin Pîridir koca kürd Hacı Hasan**

**Eğri yollarda koşub dâimâ doğru basan**

**Cemâl âşıkıdır O, kul olur sevdiğine**

**Muhabbet kılıcını arşa nâmuslu asan**

**Ey ayak titrer iken gözler arar güzeli**

**Yaşını sorarsanız ya seksenbeş ya doksan.**

له لایەکی دیکەوە گۆڕی کوردێکی زۆری ناسراو له ئەستەمبوولّدا هەیە، گۆڕستانێکی تایبەت بە کوردەکانی لێنییە. ئافرەتێکی کورد کە ساڵانێکی زۆر لە ئەستەمبوولّدا ژیاوە و لەگەڵێدا ناسراویمان پەیدا کردبوو، کە مرد، داوای کردبوو لە گۆڕستانێکی کوردانددا بنێژرێ، بەمجۆرە پێویستی گۆڕستانێکی کوردانی دەربڕیبوو.. گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەد گۆڕی کوردێکی زۆری لێیە، کە بە گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەددا دەگەڕێین و بە بەردەکێلەکاندا دەنۆڕین، دەبینین کوردێکی زۆر لەوێدا نێژراون. نابیی شاعیر کە بە خۆی کوردبووەو گۆڕستانی بنەماڵەی بەدرخانییانیش هەر لەوێیە. له (ئەییووب) دا[*٣٢] کە یەکێکە لە گۆڕستانە هەرە کۆنەکانی عوسمانی، باس لەوە دەکرێ کە کوردی لێ نێژراون. زارۆ ئاغای بتلیسی کە بە تەمەنترین پیاوی جیهان دانراوە،گۆڕەکەی لەوێیە. لەسەر سووچی ڕێی(گویمویش سویو) و کۆڵانی گۆڕ (توربە)ی ئەییووب سولّتاندا، ئیدریسی بتلیسی و هاوسەری لێ نێژراون. عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی کە بە مامۆستای کورد ناسراوە، لە (وەقعەیی حەربییە)دا ساڵی (١٨٢٦) هەندێك کارگوزاریی لێ بینراوە، ساڵی (١٨٥٤) مردووە و (خەرپووتی)یەو کورد بووە، لە ناوچەی ئەییووبی ئەستەمبوولّدا لە ناو بینای خزمەتگوزاریدا نێژراوە. کوردی دیکەش هەن لە گۆڕستانی بچووکتردا نێژراون، وەك عەبدوڵڵا جەودەت، کە لە گۆڕستانی مەرکەز ئەفەندی-کۆزلو- نێژراوە.

ناوی هەندێك کوردیشمان بەرچاو دەکەون کە لە باخچەی هەندێك (مەزار)دا نێژراون. باخچەی مەزاری سولّتان مەحموودی دووەم، گۆڕەکانی سولەیمان پاشای باپیری شەریف پاشای بەناوبانگ و د.ئیسحاق سوکووتیی دیاربەکری-ی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیتتیحاد و تەرەققی و زیا گوێك ئالّپی دیاربەکریی شاعیرو بیرمەندی ناسراوی لێیە. گۆڕی زهنی پاشای بابانزادە، لە بەشی هەرەخوارەوەی گۆڕستانی کۆنە دەرگای ئەدرنە (ئەدرنە قاپوسی) داو ئەحمەد نەعیم- ی کوڕی لە مەیدانە فراوانەکەی گۆڕستانی شەهیدانی دەرگای ئەدرنەو ئیسماعیل حەققیی کوڕی دیکەی لە باخچەی مزگەوتی بایەزیددا نێژراون.

بابەتی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوولّدا نێژراون، پێویستی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی سەربەخۆیە.

---

[*٣٢] ئەییووب: ناوچەیەك و گۆڕستانێکی گەورەی ئەستەمبووڵە، بە ناوی ئەو یاوەرەی پێغەمبەر (د.خ.) وە ناونراوە کە (ئەبوو ئەییووبی ئەنساری)ی پێ دەڵێن و گوایە لەوێ نێژراوە. (وەرگێڕ).

## بەشی دووەم

### ئەستەمبوڵ: یەکەم مەڵبەندی بیری نەتەوەیی مۆدێرنی کورد

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، ئەستەمبوڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، جێی یەکێك لە گرنگترین مەڵبەندەکانی بیری نەتەوەیی مۆدێرنی کورد دەگرێتەوە، تەنانەت ئەگەر پتر بچین، دەتوانین بڵێین یەکەم مەڵبەندیەتی. لە (١٩٠٨)ەوە کە دووەم مەشرووتییەت (دوستوور) جاڕدرا، تا (١٩٢٣) کە ڕژێمی کۆماری ڕاگەیەنرا، لە ماوەی ئەم پانزدە ساڵەدا، سەرەڕای قەدەغەکردن و فشاری دیکەی بۆ سەر بیری نەتەوەیی کورد، بۆ یەکەم جار کورد ئەزموونی خەباتی قانوونیی شەرعی (لیگاڵ) وەدەستدەهێنێ، لەم ڕوانگەیەوە سەردەمەکە گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە ئەم گەلەکۆمەکییەی پەروەردەیی و ڕیکخستنە نەتەوەییەی کە نەتەوەپەروەرە کوردەکان لە چارەکە سەدەی بیستەمدا لە ئەستەمبوڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بەرپایان کردووە، پێشتر لە مێژووی کورددا وێنەی نەبینراوە. لە نێو کورددا ژیانی ڕێکخراو و بیری دامەزراندنی ڕێکخراو بۆ یەکەم جار لە ئەستەمبوڵدا دێتە کایەوە. بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەدا، بزووتنەوەی کورد کە تەنیا گرنگیی بە خەباتی چەکدارانە داوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا شێوەی نوێ و جیاوازی خەباتی بەڕێوەبردووە. لە بابەت بنەماکانی نەتەوەییەوە ڕۆشنبیرانی کورد بۆ یەکەم جار دەست بە پەرەپێدانی بیرکردنەوەکان دەکەن، بایەخێکی زۆر بە (کاغەز و قەڵەم) دەدرێ، یەك لەو تایبەتمەندییە دیار و ئاشکرایانەی ئەم دووەم قۆناغەی بیری نەتەوەیی کوردە، پەرەسەندنی ڕۆڵی چینی ڕۆشنبیر و دامەزراندنی زنجیرەیەك لە یانە و حزبە، بە پێشەوایەتیی ڕۆشنبیرانی کورد.

بە تایبەتی زیادبوونی قوتابییانی کورد لە دەزگاکانی خوێندنی باڵای جیاجیای ئەستەمبوڵدا، ڕێی بۆ پەیدابوونی چینێکی ڕۆشنبیر و هەندێك کەسایەتی لە نێو کورددا خۆشکرد بەجۆرە لە توانای پێشەوایەتییە باوەکاندا پاشەکشێیەك بەرچاو دەکەوێ، بەهۆی ئەم کەسایەتییە تازانە و ئەم دامەزراوانەوە، بۆ یەکەمجار هەندێك ئۆرگانی بڵاوکراوە لە



ئەستەمبوڵدا بە کوردی دەستیان بە بڵاوکردنەوە کرد. بۆ پەرەپێدانی ڕایەکی گشتیی لایەنگری کورد بەتایبەتی کاریگەریی پڕۆپاگەندە و ڕاگەیاندن تا دێ پەرەدەستێنێ، مێدیاکانی کورد با سنووردارش بن، وەك هێزێك لە ژیانی سیاسیدا دەست بە کاریگەریی خۆیان دەکەن. یەك لە تایبەتمەندیی هەرە گرنگی بیری نەتەوەیی کورد کە لە پایتەختدا پەرەی سەند- وەکو دواتریش دەیبینین- بۆ یەکەمجار و بە شێوەیەکی سنووردار لەم کاریگەرییە نەتەوەییەدا و بەرپابوونی گفتوگۆی نوێیە لەم مەیدانەدا.

کورتییەکەی بیری نەتەوەیی کورد لەم ساڵانەدا دەچێتە قۆناخێکی هاوچەرخانە. ساڵی (١٩١٨) کە دۆزی کورد بە چڕی لە ناوەندە نێو دەوڵەتییەکاندا گفتوگۆی لەسەر دەکرا، ڕوو لە ئەستەمبوڵ و پاریس دەکرا. ڕاستتر، چاوپێکەوتنەکانی پاریس لە لایەن کۆمەڵەی (تەعالیی کوردستان)ەوە ئاڕاستە دەکرا، کە ساڵی (١٩١٨) لە ئەستەمبوڵ دامەزرا بوو و بەردەوام لە بۆچوونی ئەم ڕێکخراوە دەپێچرایەوە. چونکە شەریف پاشای نوێنەری کورد لە پاریس، لە لایەن کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە ئەو ئەرکەی پێ سپێررا بوو[1]. لە نێوانی نوێنەرانی کورد لە ئەستەمبوڵ و نوێنەرانی دەوڵەتە بیانییەکاندا، بۆ یەکەمجار لەو ڕۆژانەدا بەم شێوە چڕە دەست بە پەرەسەندن دەکا[2]. ئەستەمبوڵ بەلای کوردەوە پایتەختێك دەنوێنێ، شێوەیەك بۆ ئەزموونی دیبلۆماسییان دابین دەکا، لە نێوانی ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی

---

1- Hasan Yıldız, Fransız Belgeleriyle Sevr –Lozan- musul Üçgeninde Kürdistan, Stokholm, 1990, s.166.

(لە تەلگرافێکەوە کە لە ئەستەمبوڵەوە بۆ پاریس نێرراوە، تێدەگەین کە شەریف پاشا لە لایەن کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە ئەرکی بەرپرسێتیی پێ سپێرراوە، تەلگرافەکە لە (عەبدول محەممەد)ی سەرۆکی یانەی کوردی گەڵەتە (غەڵەتە)وە نێرراوە. بەم تەلگرافەوە، بە بەڵگەوە دەزانین، کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان لەو ساڵانەدا هۆبەیەکی لە غەڵەتەدا هەبووە. چونکە بارەگای ناوەندیی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان لە دامەزرانیدا بارەگاکەی لە ناوچەی (چەغالۆغلو)دا بووە نەك لە غەڵەتە.

لە ئەستەمبووڵدا بوون و نوێنەرایەتییە بیانییەکاندا هاتوچوویەکی چڕ لە ئارادا بووە، رووبەڕوو پەیوەندییان لە نێودا دەبەسترا.

لە نێوانی ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٠)دا کوردەکان لە ئەنجامی گردبوونەوە لە ژێر میچی (کۆمەڵەی تەعالی)دا لە خۆڕێکخستن و یەکگرتنیدا، لە روانگەی کوردەوە گرنگیی ئەستەمبوولی پایتەخت زۆر پەرەدەستێنێ. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە لایەنی سیاسی و رۆشنبیرییەوە وەکو هێزێك بۆ یەکەمجار لە ئەستەمبووڵدا دەبینین شێوەیەکی رێکخراوی دەبێ، ئەم هێزەی رێی تێدەچێ بیرۆکەی ئەوەی سنووری ئەستەمبووڵ ببەزێنێ و بە کوردستاندا بڵاوببێتەوە، بابەتێکە لە ناو ئەو کوردانەی ئەستەمبووڵدا گفتۆگۆی لەسەر دەکرا. ئەم خاڵە یەکێك لە بابەتە بنەڕەتییە رۆژانەکانی نەتەوایەتیی ئەو کوردانەی پێکدەهێنا کە لە ئەستەمبووڵدا بوون. هەوڵ دەدرا تەنگژەکان چارەسەر بکرێن بەڵام لە مەیدانەکانی دیکەی خەباتدا لە مەیداندا نەبوونی بزووتنەوەی کورد هەندێك گیروگرفتی بەرەو روو دەکردن. وەك ئەوەی چینی رووناکبیری کورد لە ئەستەمبووڵ بەرەو رێکخستن دەچوو لە مەڵبەندە جیاجیاکانی کوردستانیشدا هێشتا رێك نەخرابوون. ژمارەی رۆشنبیرانی کورد بە گوێرەی کوردستان، لە ئەستەمبووڵ وەکو چۆنیەتی، پتر بوو. ئەو بیرانەی پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو، بڕیارەکان و سیاسەتەکان هەر هەموو لە شوێنێکی دوور لە کوردستانەوە، واتە لە ئەستەمبووڵدا پەرەی دەسەند. سیاسەتی بەکارخستنی یەکگرتنی کورد و ئەرمەن بەرامبەر فەرمانڕەوایی عوسمانی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، نوێنەرانی رێکخراوێکی نهێنی کە ویستوویەتی لە هەندێك کردەوەیدا بەرامبەرەکەی لەناو بەرێت، لەم بابەتەدا بۆ نموونە بۆ گەڕان بە دوای پشتگیریی کورد پەیدا کردندا سەریان لە شێخێکی کورد داوە کە لە ئەستەمبووڵ ژیاوە[٣]. کورتییەکەی، نوێنەرانی کورد لەو سەروبەندەدا نەك لە کوردستان، بەڵکو لە مەڵبەندێکی دوورتردا، واتە لە ئەستەمبووڵ جێگیر بوون.

سەرباری ئەم هەموو گیروگرفت و زەحمەتییانە، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد کە لە ئەستەمبووڵ پەرەی سەندووە، لە نێوان ساڵانی (١٩٠٠-١٩٢٥)دا بە تاقیکردنەوەیەکی راستەقینەدا رەت

2- Daniel Methy, I. Dünya Savaşi Sonrası, Constantinople'de Kürt Örgütlenmeleri Üzerine Bazı Belirlemeler, Studia Kurdica, no 1.3, 1985.
3- John Hultvall, Mission och vision i Orienten, Stockholm, 1991, s.150.



دەبێ و ئەزموونی نوێتر وەدەست دەخا. بەمجۆرە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نەریتی نوێ و ئەزموونگەلێك و شێوەگەلێکی دیکەی خەبات کە پەیوەندییان بە دوارۆژەوە هەیە وەدەست دەخا. دەتوانین باس لە چوار هێزی تازەی پەروەردەکەرەوەی بزووتنەوەی ئەو کوردایەتییەوە بکەین کە لە ئەستەمبووڵ پەرەی سەندووە:

أ- چینی رۆشنبیری کورد.

ب- رێکخراوە نەتەوەییەکانی کورد.

ج- چاپکراوی بەردەوامی کوردی.

د- ئافرەتە کوردەکانی ئەستەمبووڵ.

یەك لە تایبەتمەندییە بایەخدارەکانی بزووتنەوەی هاوچەرخی نەتەوایەتیی کوردیش لەم ساڵانەدا، هاتنە گۆڕێی بزووتنەوەی ئافرەتانی کوردە لە ئەستەمبووڵ، بەشی سێیەمی ئەم کتێبە زانیاریی فراوانتر لە بارەی ئەم بابەتەوە بەخۆوە دەگرێ.

## ئەو چینە رۆشنبیرە کوردەی لە ئەستەمبووڵ لە دایک بووە

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کەسایەتیی ورشەدار لە ناو ئەو کۆمەڵگە کوردەدا پەیدا دەبێ کە لە ئەستەمبووڵ ژیاوە. ئەم کەسایەتییانەی وا لە مەیدانەکانی رامیاری و رۆشنبیریدا رۆڵی بە بایەخیان دیتووە، لە لایەکی دیکەوە بناغەکانی نەتەوایەتیی مۆدێرنی کوردیان داناوە، لە تەك هێزە باوەکاندا، لە ئەستەمبووڵدا پەیدا بوونی چینێکی رۆشنبیری کوردمان بەرچاو دەکەوێ، لە ناو ئەو هێزانەی کە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە هاتوون و چینەکانی دیکەدا یەکگرتنەوەیەك دەست بە دروست بوون دەکا. ئەزموونی ژیان فێریان دەکا بەیەکەوە بجوولێنەوە، لەم ساڵانەدا بۆ یەکەمجار لە یەك شوێندا کۆبوونەوەی رۆشنبیران کە لە پارچە جیاجیاکانی کوردستانەوە هاتوون و پێکەوە و بە کۆمەڵ چوونە ناو رێکخراوەکان و بە هاریکاری بڵاوکردنەوەی هەندێك ئۆرگانمان بەرچاو دەکەوێ. ئەم پێکەوەبوونەی بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردستاندا، پەیوەندییەکانی نێوان هێزە باوەکان و رۆشنبیران بنیاتێکی دینامیکی وەدەست دەهێنێ. لەم ساڵانەدا کە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان بە پلەی یەکەم بە بەرچاوەوە گیراوە، بزووتنەوەی زانیاری پەیدا کردن پەرە دەستێنێ. بەمجۆرە

ئەستەمبووڵ وەکو پایتەخت شێوەی ناوەندێکی رۆشنبیری پێکدەهێنێ بۆ ئەو رۆشنبیرانەی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە تێیدا گردبوونەتەوە. لە سایەی ئەم گردبوونەوەیەدا بڵاوبوونەوەی یەکبوونەوە وەکو بیر بە شێوەیەکی گوڕبەستوو لە ناو کوردەکاندا دەبینین.

کوردێکی زۆر کە لە ناوچە و پارچە جیاکانی کوردستانەوە هاتبوون، پێناسەی عەشایەری و ناوچەیی خۆیان خستە لاوە و کەوتنە پشکنینی ئەتنیکی و گەڕان بە دوای بنچینەی نەتەوەیی. لەم ساڵانەدا پەرەسەندنی زانستی مێژووش لە نێو کورددا بەرچاو دەکەوێ، بە تایبەتی بڵاوکراوە وەرزانەکانی کورد لەم بابەتە رۆڵێکی گەورەی بینیوە. هەندێك لێکۆڵینەوە، کە لەم بڵاوکراوانەدا دەرچووە، دەتوانرێ بە ژمارەیەکی روونی ئەم زانستە مێژووییە بژمێررێ. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا هەندێك لەو کەسایەتییە کوردە گرنگانەی بایەخیان بە پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد داوە، ئەمانەن:

حاجی قادری کۆیی، سەیید عبدولقادر، سەعید نوورسی، ئەمین عالی بەدرخان، خەلیل خەیالی، موکوسلو حەمزە (حەمزەی مکسی)، لیجەلی ئەحمەد رەمزی (ئەحمەد رەمزیی لیجەیی)، مەمدووح سەلیم، عبدوڵلا جەودەت، محەمەد شوکری سەگبان، سولەیمانییەلی تۆفیق (تۆفیقی سلێمانی-پیرەمێرد)، مەولانزادە رفعەت (رەفعەتی مەولانزادە).. جگە لەمانە گەلێك رۆشنبیر و کەسایەتیی کورد لە ئەستەمبووڵ، تێکەڵی کاریگەریی ئەتنیکی دەبن.

چینی رۆشنبیری کورد، کە لە ئەستەمبووڵ لە بارودۆخی دژوار و ناخۆشدا ناچاری ژیان بەسەربردن بوون، بۆ ئەوەی بتوانن یارمەتیی کوردە سادە و دەستکورتەکان بدەن لە گرفتە جیاجیاکانیاندا، خزمەتی جۆراوجۆریان پێشکەش بەوان کردووە و لەو رێیانە گەڕاون کە لەگەڵ ئەوانەدا یەکبگرن. بەزانینەوە هێدی هێدی هاتنە ناو ژیانی رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بەرچاو دەکەوێ. ئۆرگانی بڵاوکراوەی کۆمەڵەی هاوکاری و پێشکەوتن (تەعاون و تەرەققی) کە ساڵی (١٩٠٨) دەستی بە بڵاوبوونەوە کردووە، ئەو بانگەوازەی لە ژمارەی دووەمیدا بڵاوکراوەتەوە، لەم بابەتەدا بیرۆکەیەکمان دەداتێ: ((داود ئەفەندیی حەیدەریزادەی راوێژکاری قانوونیی یانەکەمان لەبەر ئەوەی گیانێکی کورد پەروەرانەی هەیە، ئامادەیە لە دادگاکاندا بەخۆڕایی بەدوای ئەو دۆزە قانوونی و شەرعییانەدابچێ کە کوردەکان دەیانبێ، هەرچی پەیوەندیی بە مافە رەواکانی برا کوردەکانمانەوە هەیە، ناوبراو لە ژووری ژمارە (٢٥ و ٢٦)ی خانی مووسڵی



ناوچەی (سرکەجی) کە نووسنگەکەی لێیە، سەردانی بکەن. عەبدوڵڵا جەودەتیش لەم ئاڕاستەیەدا لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بانگەواز بڵاودەکاتەوە، بۆ نموونە لەو بانگەوازەدا کە لە گۆڤاری (جەم)دا بڵاوی کردووەتەوە و بەبێ پارە تەماشا و تیمارکردنی هەژارانی راگەیاندووە. ((عەبدوڵڵا جەودەت))ی پزیشکی چاو، جگە لە رۆژانی هەینی و یەکشەمان، هەر چ رۆژێکی دی لە سەعات دووەوە تا چوار لە عیادەکەیدا کە لە نهۆمی دووەمی بینای (ئیجتیهاد)ی ناوچەی (چەغاڵ ئۆغڵو)ی بەرامبەر بنکەی پۆلیسی (ئەیاسۆفیا) دایە، دەتانبینێ. هەژاران بە خۆڕایی و ژمارەی تەلەفۆن: ئەستەمبووڵ (٨٩٥). هەر لەم بابەتە لە ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) لە گۆڤاری (ڕۆژ)دا کە لە ئەستەمبووڵ دەرچووە بانگەوازی لەم جۆرانەمان بەرچاو دەکەوێ. محەمەد شوکری سەگبان کە دوکتۆر بوو بۆ برەودان بە عیادەکەی کە لە خانی سەعید پاشادا بوو کە ئەمرۆ راڕەوی خوارەوەی (چیچەك)ی لێیە، لەو گۆڤارو رۆژنامە کوردییانەدا کە ئەوسا لە ئەستەمبووڵ دەردەچوون، ئەم جۆرە بانگەوازانەی بڵاوکردووەتەوە. لە ناو چینە جیاجیاکانی کۆمەڵەی کورددا کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان، ئەم ئاماژەیەی کە لێکنزیکبوونەوەی خەڵکانی رۆشنبیر دەگەیەنێ، ئەم کاریگەرییە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، لەئەستەمبووڵ چڕییەکی دیار وەدەست دەهێنێ. لەلایەن رۆشنبیرانەوە ئەم جۆرە یەکگرتنەی خراوەتە روو، لە نێو کوردە هەژارەکانی ئەستەمبووڵدا شادییەکی گەورە و بڕوا بەخۆکردن پەیدا دەکا. ئەم ئازایەتییەی چینی رۆشنبیرانی کوردە، دواتر لە رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی رەوەندی کورددا رۆڵێکی گرنگ دەبینێ.

ساڵی (١٩١٩) رۆشنبیرانی کورد لە ئەستەمبووڵ، بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری کوردی کوردستان و خزمەتکەدنی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی، دەستیان بە کارگوزارییەکی بە سوود کردووە و بە ناوی ئیدارەخانەی تەعقیبی ئوموور (فەرمانگەی بەدوواداچوونی کاروبار)ەوە بۆ خزمەتگوزاری هێناوەتە گۆڕێ، ئەم کارگوزارییە لە لایەن گۆڤاری (ژین)ەوە کە لە ئەستەمبووڵ بڵاوکراوەتەوە رێکخراوەو کاروبار لە بنکەی رۆژنامەکە لە چاپخانەی (نەجمی ئیستیقلال)ی شەقامی (ئەبو سسوعوود)ەوە بەڕێوەبراوە، ئامانجی سەرەکیی ئەم خزمەتگوزارییە بەمجۆرە باس کراوە: ((هەموو کارێکی بازرگانی، سەربازی، لەگەڵ هەموو داواکارییەك کە لە فەرمانگە سەربازی و سویلەکاندا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئەو زاتانە جێبەجێ دەکرێن کە لە کوردستاندان)). ئەم خزمەتە لە ژمارە (٢٥)ی هەر ئەو گۆڤارەدا وەك بانگەواز، بە ناوی (هەولێکی گرنگ)ەوە

بڵاو دەکرێتەوە و لە بانگەوازەکەدا لە بارەی چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی ئەو خزمەتگوزارییانەوە روونکردنەوەی دوور و درێژ خراوەتە روو.

لە ئەستەمبوڵ، لە نێو کوردەکاندا لێکنزیکبوونەوەیەك و شێوە رێکخراوییەکی پەرەسەندوو لە ناو رەوەندی هاوشارییەکاندا دەبینرێ. کوردەکان بە پێی ئەو شارانەی لێیانەوە هاتوون کۆمەڵ کۆمەڵ بوون، وەك کوردەکانی دەرسیم، دیاربەکر، بتلیس، وان .. یەك لەو نەتەوە پەرستە کوردە ئاگرینانە لە ئەستەمبووڵ پێگەیشتووە، نووری دەرسیمییە. بۆ نموونە لە (١٩١١-١٩١٣)، لەو ساڵانەدا لە پانسیۆنی ئافرەتێکی رۆم لە (قوم قاپی) ژیاوە و درێژەی بە خوێندن داوە، لە بیرەوەرییەکانیدا بە شێوەیەکی زۆر زیندوو باسی ئەوە دەکا کە بۆ بڵاوکردنەوەی هەستی نیشتمانپەروەری و بیروباوەڕی کوردایەتی لە ناو کوردی دەرسیمدا، چۆن شەو و رۆژ کاریان کردووە.

لەو بیرەوەرییانەیدا پەیوەندیی نزیکی بە هاوشارییەکانی وەکو: عەبدوڵڵا جەودەت، شوکری سەگبان و لوتفی فیکریی نوێنەری دەرسیم باس دەکاو باسی چەند کوردێکی دەرسیمیی دیکەش دەکا لە ئەستەمبووڵ، لە دامەزراوە جودا جوداکاندا کاریان کردووە. ئەو هاووڵاتییانەی لە دەڤەری دەرسیمەوە هاتوون، لە وەزارەتەکانی دارستان و کشتوکاڵ و مەعاریف (پەروەردە)دا بە گشتی کاری نووسەری خزمەتگوزارییان کردووە.

نووری دەرسیمی باس لە سەدان کرێکاری دەرسیمی دەکا کە لە کاتی بێکارییاندا لە قاوەخانەی (عەلی پاشای ئەرزنجانی)دا کۆبوونەتەوە، لە لایەکی دیکەوە لە بارەی گەلێك کوردی دیکەوە نووسیویەتی کە لە ریزی پێشەوەیاندا قوتابییان بوون، لە ئەستەمبووڵدا ژیاون[٤]. ئەو کرێکارانەی لە دەرسیمەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ بە گشتی لە (قازلی چەشمە) داو قوتابییان لە ناوچەی وەکو (ئونقاپانی) و بێشکتاش و ئەییووب و حەیدەر پاشاو قادری کۆیی - دا لە خانووی تایبەتیی خۆیاندا دەژیان[٥]. نموونەی رێکخراوی دیکەی سەر بەشارەکان، کە لەم رێکخراوە دەچن، لە ناو دیاربەکرییانیشدا بەرچاو دەکەون، سەرچاوەکان (قاوەخانەی عەبدوڵڵا

4- Nuri Dersimi, Hatıratım, Ankara, 1992, s.31.
5- age, s.32.



چاوشی ئەرغەنی)ی ناوچەی (دیوان یۆڵو) بە یەکێك لەو مەڵبەندانە دادەنێن کە ئەوانەی لە ناوچەی دیاربەکرەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ لەوێ کۆبونەتەوەوەو یەکترییان بینیوە.

کە دەگەینە سەرەتای سەدەی بیستەم، دەبینین سەیید عەبدولقادر (١٨٥١-١٩٢٥) پێشەوایەتیی ئەو کۆمەڵگە کوردە دەکا کە لە ئەستەمبووڵ دەژی. سەیید عەبدولقادر کە کوڕی ئەو شێخ عوبەیدوڵلایەیە کە ساڵی (١٨٨٠) بەرامبەر عوسمانییەکان شۆڕشی بەرپا کردووە. لە ئەنجامی پیلانێك کە ساڵی (١٨٩٦) دژ بە (سوڵتان) عەبدولحەمید رێکخراوە، دوور خراوەتەوە، سەیید عەبدولقادر ساڵی (١٩٠٨) کە دەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ، بە خۆپیشاندانی خۆشەویستی لە لایەن ئەو کوردانەوە پێشوازیی لێ دەکرێ کە رژابوونە ناو کۆڵانانەوە. سەیید عەبدولقادر لە ناو کۆمەڵانی کوردی ئەستەمبووڵدا وەکو سیمایەکی کاریزماتیکی کۆکەرەوەی لێ دێ و جێی سەرۆکایەتیی کۆمەڵانی کورد دەگرێ. لە مەیدانی رێکخستندا وەکو کەسایەتییەکی کارامە دیارە، سەیید عەبدولقادر جگە لە بیرە وردەکانی، لە ئەنجامی کەسایەتیشیدا لە ناو کوردەکانی ئەستەمبووڵدا وەك سیمبوڵی لێ دێ. بەوەی کە شوێنپێی باوکی هەڵگرتووە، هەمیشە بۆ رزگاریی کورد کار دەکا. وەکو لە خوارەوە دەبینین لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا زنجیرە یانەیەکی کورد لە ئەستەمبووڵ دامەزراون، سەیید عەبدولقادر کەسایەتییەکی کاریگەر بووە. ساڵی (١٩٠٨) دەکرێتە سەرۆکی کۆمەڵەی هاوکاری و پێشکەوتن (تەعاون و تەرەققی) کە لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە، بەتایبەتی کۆڵهەڵگر (حەماڵ)ـە کوردەکانی ئەستەمبووڵ کە ژمارەیەکی ئێجگار ئەستووریان بووە و هەروەها کرێکارە کوردەکان هەمیشە لەگەڵیدا بوون. روونکردنەوەیەکی هەموو (دەستەی کوردی ژووری بازرگانی) کە ساڵی (١٩١٨) لە گۆڤاری وەقت (کات)دا بڵاوکراوەتەوە، ئاماژەیەکی گرنگی ئەم هاوکارییەیە[٦]. سەیید عەبدولقادری خۆشەویستی کۆمەڵانی کوردی ئەستەمبووڵ و حسێب بۆ کراو، چونکە لە بابەتی کوردەکاندا زانایانەتر هەڵسوکەوتی دەکرد، لە لایەن هەندێك ناوەندی کوردی لایەنگیرانی سەربەخۆییەوە رەخنەی لێ گیرا، سەرەڕای هەموو ئەو کەسایەتییە بە زانستە، سەیید عەبدولقادر کە لە ئەستەمبووڵ دەگیرێ، لە ژێر باری ئاسایشێکی چڕدا دەبرێتە دیاربەکرو رۆژی (٢٧ی مایسی ١٩٢٥) لە سێدارە دەدرێ. بۆ دواجار کە سەیید

6- Mehmet Bayrak, Kürtler ve Ulusal Demokratik Mücadeleleri, Ankara, 1993, s.128.

عەبدولقادر لە ناوچەی (سوعادییە) دادەنیشت، لە بابەتی ئەم ماڵەی سەیید عەبدولقادرە، لە سەرچاوەیەکدا ئەم روونکردنەوەیە تۆمارکراوە: (ئەو تەلارە گەورە و گرانەی شێخ عەبدولقادر لە (جاددە بۆستان)ی رۆخی دەریا، لە لایەن (سوڵتان) عەبدولحەمیدەوە پێی بەخشرابوو[7]. بە پێی ئەو زانیارییانەی (ئوغور موجو) لە خزمەکانی سەیید عبدولقادری وەرگرتووە، سەیید عەبدولقادر پێشتر لە گەڕەکی (ئاق بییق)ی سوڵتان ئەحمەدو ناوچەی (قزڵ تۆپراك)ی (قادی کۆیی)دا دانیشتووە.

سەیید عەبدولقادر کە ساڵی (١٩١٨) سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان (تەعالیی کوردستان)ی کردووە، ساڵی (١٩١٩) لە سەردەمی (فەرید پاشای داماد)دا لە (سەرۆکایەتیی شوورای دەوڵەت) دادەمەزرێ کە لە بەرامبەر باڵەخانەی ویلایەتدا بووە. لە لایەکەوە پێشەوایەتی کردنی بزووتنەوەیەکی ئەتنیکی و لە لایەکی دیکەوە، لە ئاستێکی بەرزدا، لە هەرەسەرەوەی پلەیەکی فەرمیدا بوون. لە روانگەی سەیید عەبدولقادرەوە بووەتە هۆی ناجێگیریی ناسنامەکەی، پێم وایە گەورەترین دڵتەنگییەکی سەیید عەبدولقادر ئەم بارودۆخەیەتی کە تووشی هاتووە، سەیید عەبدولقادرێك کە پێی وابووە بەم هەڵسوکەوتە زانایانەیەوە هەردوو لا رازی دەکات، تەواوێك بە پێچەوانەوە دەبێتە ئامانجی رەخنە لێگرتنی هەردوولا، لە کۆتاییشدا وەکو پێشتر باسمان کرد لە سێدارە دەدرێ.

لە سەردەمی هەرای شێخ سەعیددا کەسانی دیکەش هەبوون کە چووبوونە ناو گرووپی ئەستەمبووڵ و دواتر تووشی سزای قورس دەبن. لەگەڵ سەیید عەبدولقادر پێکەوە سەیید محەممەدی کوڕی و عەبدوڵڵا سەعدی پاڵوویی (سەعدییە کوێر) ی رازگری و یەکێکی دی بە ناوی نازف مووشلی (نازفی خەڵکی مووش) کە لە ئەستەمبووڵ دادەنیشت، ساڵی (١٩٢٥) لە ئەستەمبووڵەوە دەبرێنە دیاربەکرو لەوێ لە سێدارە دەدرێن. لەمانە عەبدوڵڵا سەعدی پاڵوویی (١٨٩٠-١٩٢٥) کە ئەندامی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان بووە، بەرازگری گشتیی (کۆمەڵەی تەشریکی مەساعیی کوردستان ناسراوە[8]. باوکی وەکو ئۆنباشی (سەرکار)ی کەناس کاری کردووە. عەبدوڵڵا سەعدی کە (ئامادەیی وەفا) تەواو دەکا، دەچێتە کۆلیژی

7- Metin Toker şeyh said ve Isyanı, Ankara, 1968, s.55.

8- Mehmet Bayrak, Kürtler ve Ulusal Demokratik Hareketleri, Ankara, 1993, s.85.



حقووق (ماف) و دەبێتە یەکێك لە نزیکترینی یاریدەدەرانی سەیید عەبدولقادر. عەبدوڵڵا سەعدی پاڵوویی کە لە گەڕەکی (سۆفیلەر)ی (ئاق سەرای) دا دەژیا، ئەو کەسەی لە ئەستەمبووڵ دەستگیری کرد، (سەرقومسێر تەحسین تاندۆغان) بوو کە لە (ئامادەیی وەفا)دا هاوڕێیی پۆلی بووە. تاندۆغان لە بیرەوەرییەکانیدا هەندێك روونکردنەوە کە پەیوەندیی بەم دەستگیر کردنەوەیەوە هەیە، دەنووسێ: لە سەردەمی شۆڕشەکەی شێخ سەعیددا، دوای گیرانی سەعید نوورسی کە لە ناوچەی وان بووە، هێنراوەتە ئەستەمبووڵ و لەوێدا باس لە بابەتی لێپرسینەوەشی دەکا[9]. سەیید عەبدولقادر بەر لە دەستگیرکردنی، پۆلیسێکی تورك دەچێتە شێوەی دەسەڵاتدارێك (بەرپرس)ێکی ئینگلیزەوە پەیوەندیی پێوە دەکا، بە نیازی زانیاری پەیداکردن لە بارەی پەیوەندیی کوردەکان بە باڵیۆزە بیانییەکانەوە. رووداوی مستەر تەمپلن .. هەر هی ئەو سەردەمانەیە[10].

لە سەرەتای سەدەماندا (سەدەی بیستەم) لە ئەستەمبووڵ یەك لە سیما کوردە هەرە ناسراوەکانیش سەعید نوورسییە (١٨٧٦-١٩٦٠) کە جاروبار لە سەرچاوەکاندا بە سەعیدی کوردی ناوبراوە. سەعید نوورسی کە پیاوێکی گرنگی ئاینییە، ئەو دەمەی لە ئەستەمبووڵ بووە، هەمیشە لەو ناوچانەدا دەگەڕێ کە کوردە هەژارەکانی لێ بووە و بۆ گرفتەکانیان لە چارەسەر دەگەڕێ و .. بۆ نموونە دەڵێ: ((لە کۆبوونەوەی قوتابییانی (بایەزید)و لە رێو رەسمی مەولوود (ئاهەنگی لە دایك بوونی پێغەمبەر)ی ئەیاسۆفیاو لە شانۆی فەرەجدا پێگەیشتم)).

لەم ساڵانەدا نزیکەی (٣٠) هەزار کورد لە ئەستەمبووڵ بووە. سەعید نوورسییەك کە بە قسەی خۆی: ((شوێنی کوردەکان بە گشتی و قاوەخانەکان)) گەڕاوە، هەوڵی هێنانە سەر رێی راستی ئەوانی داوە: ((لە لەکەدار کردنی نەتەوەی کورد ترسام))[11]. لە ژینگەیەکی وەهادا کە سەعید نوورسی بۆ کوردی ئەستەمبووڵ بووەتە ((باوکی دەردان))، پێشەوایەتی و هاوپەیمانێتیی بۆ کردوون، کورد پەروەرییەکی بەتینی خۆیان بۆ دەنوێنێ. بۆ ئەوەی وا نەکا گەرد بەسەر

9- Necmeddin şahiner, Aydınlar Konuşuyor, İstanbul. 1979, s.166.

10- Metin Toker, şeyh Said ve İsyanı, Ankara, 1968, s.50.

(مەتین تەکەر ئەم رووداوەی بە ناونیشانی (سەرەدێری): وەك چیرۆکی جێمس بۆند- گواستووەتەوە).

11- Bediüzzaman Said nursi, Divan-ı Harb-i Örfi, Tenvir Neşriyat, İstanbul, 1992, s.10.

کوردەکانی ئەستەمبوولّدا بنیشیّتەوە، سەعید نوورسی هەولّیّکی زۆر دەدا، هەمیشە شانازی بە بوونی کوردەوە دەکاو لە هەموو بواریّکیشدا ئەمە دەردەخا. سالّی (١٩٠٧) بە ئامانجی دامەزراندنی قوتابخانە لە هەندیّك ناوچەی کوردستاندا کە دیّتە ئەستەمبوولّ، ماوەیەك دەگیریّ و دەخریّتە ئەو بەندیخانەیەوە کە لە (تۆپ تاشی)دا بووە. لەو ماوەیەدا کە لە ئەستەمبوولّ بووە، بیر لە بارودۆخی پەریّشانی کوردستان دەکاتەوە. بەلای سەعید نوورسییەوە تاکە چارەی رزگاربوون لەم بارودۆخە، پەروەردەیە. بۆ ئەم مەبەستە دیّتە ئەستەمبوولّ: ((سالّ و نیویّکە لیّرە بۆ نەشری مەعاریف (بلاّوکردنەوەی زانستی) لە کوردستاندا تیّدەکۆشم))[12].

بەلای سەعید نوورسییەوە، ئەستەمبوولّ پیربوو بوو، خەریکی پرژاندنی بەدکارییە، ئەم شارە بە ((هەنگوینیّکی ژەهراوی)) دەچوویّنیّ[13] و دەلّیّ ئەستەمبوولّ نەخۆشە و لە نویّندا کەوتووە: ((ئەوسا کە ئەستەمبوولّم بینی و خورپەیم پشکنی و زانیم، نەشتەرگەریم کرد، تیّگەیشتم کە ئەوەی لە ناو دلّیدایە نەخۆشییە، بە هەموو لایەکدا دەتەنیّتەوە، هەولّی تیمار کردنی مدا. بە دیّوانەییەك سوپاس کرام))[14]. سەعید نوورسی کە ئەم هەلّویّستەی ئەستەمبوولّی چاو پیّ دەکەویّ، کوردستان لە ئەستەمبوولّ بە پەسەندتر دادەنیّ. بەمجۆرە تاکە شویّنی شایستەی پەیوەندییەکان بۆ مرۆڤی رەسەن تیّکنەچوو، کوردستانە و لە کۆتاییدا دەچیّتە ئەویّ: ((من لە چیاکانی کوردستاندا پەروەردە بوو بووم، رەوشتی ئەستوورم، دەبیّ بە قەپانی کوردستان کیّشانە بکریّ، نابیّ بە تەرازووی هەستەوەری ئەستەمبوولّی پیّشکەوتوو پیّوانە بکریّ..))[15]. سەعید نوورسی، بەمە جیاوازیی رۆشنبیری و بوونی کولتووریّکی تایبەت بە خودی کورد بە شیّوەیەکی هەژیّنەر دەردەبڕیّ. ئەم بەراوردکردنەی کوردستان بە ئەستەمبوولّە، کە لە لای سەعید نوورسی دەبینریّ هەندیّك توندوتیژە بە لای ئەوەوە ئەستەمبوولّ جیّی ژیان نییە. بۆیە بۆ ئەوەی ژیانی خۆی تا سالاّنی (١٩٢٥) دریّژە پیّ بدا دەچیّتە شاری (وان)ی یەك لە جوانترینی شارەکانی کوردستان، (فلیپ مانسەل) کە بە تایبەتی لە بابەتی ئەستەمبوولّی پایتەختی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا هەندیّك لیّکۆلّینەوەی

12- age, s.18.
13- Bediüzzaman Said Nursi, Divan-ı Harb-i Örfi, s.28.
14- Bediüzzaman Said Nursi, Nutuklar ve Makaleler, Tenvir Neşriyat, s.14.
15- Bediüzzaman Said Nursi, Divan-ı Harb-i Örfi, s.32.



ئەنجامداوە، ئەم بەراوردکارییەی کوردستان و ئەستەمبوولّەی سەعید نوورسی بە گرنگ دادەنیّ و ئارەزووی ساتیّك پیّشتر دوورکەوتنەوە لەم شارە دەردەبڕیّ، سەعید نوورسی دەلّیّ: (بۆنی بەدکاری)ی تیّدا فەرمانڕەوایە[16].

سەعید نوورسی چەند جاریّك دەچیّتە ئەستەمبوولّ، سەردانەکەی سالّی (١٩٠٧)ی بۆ پایتەخت لەناو لاوانی کورددا هەلّچوونیّکی گەورە بەرپا دەکا. سەعید نوورسی بەناو و هەلّسوکەوت و شیّوەی جلوبەرگ و بە لیّدووانە کاریگەرەکانییەوە ناسراوە، ئەحمەد رامز ئەفەندی لە بارەی ئەم سەردانەوە دەلّیّ: ((سەعید نوورسی کە لە ئافەریدە دەگمەنەکان بوو و زاتیّکی زیرەکی ئاگرین بوو. لە سالّی (١٩٠٧)دا لە چیا سەخت و رووتەلّەکانی کوردستانەوە وەك خۆریّك هەلّهات و دەنگوباسی لە ئاسۆگەکانی ئەستەمبوولّدا بلاّوبووەوە))[17].

ئەو کۆمەلّەیەی سالّی (١٩٠٧) لە ئەستەمبوولّ دامەزراوە و هەر بەو ناوەی خۆیەوە رۆژنامەی (هاوکاری و پیّشکەوتنی کورد-تەعاون و تەرەققی-ی کورد)ی دەر دەکرد، لەو رۆژنامەیەدا چەند وتاریّکی سەعید نوورەسیمان بەرچاو دەکەویّ. سەعید نوورسی کە ماوەیەك لە (شەکەرلی خان)ی ناوچەی (فاتیح)دا ژیاوە، لە سالاّنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە لایەن رووسەکانەوە بەدیل دەگیریّ، سەعید نوورسی دواتر لەویّوە هەلّدیّ و بە ئەلّمانیادا دیّتەوە ئەستەمبوولّ. هاتنی سەعید نوورسی بۆ ئەستەمبوولّ لەناو خەلّکدا دەنگدانەوەیەکی گەورەی دەبیّ[18]. دواتریش لە کۆشکیّکی گردی (چاملّیجە)دا نیشتەجیّ دەبیّ. بەلاّم ئیّرەشی زۆر بە دلّ نەبووە. ئارەزووی چوونەوەی بۆ کوردستان دەکرد: ((بە پیّی شویّن لە (چاملّیجە) دادەنیشتم کە جوانترین شویّنیّکی ئەستەمبوولّە، هەموو شتیّکم لەبەر دەستدا بوو، کەسیّکی ئیّجگار زیرەك و خۆبەختکەری وەك عەبدوڕڕەحمانی برازای خودا لیّخۆشبووم لەگەلّدا بوو کە قوتابییشم بوو و خزمەتیشی دەکردم و نووسەریشم بوو و کوڕی گوزارەییشم بوو[19]. لەو ماوەیەدا کە سەعید نوورسی لە ئەستەمبوولّ بوو تیّکەلّییەکی کاریگەری لە کۆمەلّەی هاوکاری و

16- Philip Mansel, Dünyanın Arzuladığı Şehir: İstanbul, çev. Şerif Erol, İstanbul, 1996, s.318.
17- Bediüzzaman Said Nursi, Divan-ı Harb-i Örfi, s.3.
18- Abdülkadir Badıllı, Bediüzzaman Said Nursi I, İstanbul, 1990, s.363.
19- Necmeddin Şahiner, Bilinmiyen Taraflariyle Said Nursi, İstanbul, 1988, s.80.

پێشکەوتنی کورد، کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانستی کوردو کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستاندا هەبوو. لە لایەکی دیکەوە ساڵی (١٩٢٠) سەعید نوورسی دەبێتە یەکێك لە دامەزرێنەارنی هەیڤی سەوز (یەشیل ئای)، لە نێو ئەم دامەزرێنەرانەدا ئیبراهیم حەیدەریزادەی بە رەسەن کوردیش هەبوو[٢٠]. کورتییەکەی ئەوەیە، سەعید نوورسی بە ناوەکەی و شێوەی جلوبەرگ و هەڵسوکەوت و لێدووانە بە تویکڵ و بە واتاکانی، رۆڵێکی گەورەی بووە لە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نەتەوەییدا لە نێو کۆمەڵگەی کوردی ئەستەمبووڵدا.

یەکێکی دیکە لەو پیاوە ئاییننییە کوردانەی لەم ساڵانەدا لە ئەستەمبووڵ ژیاون، محەممەد شەفیق ئەرواسی (١٨٨٤-١٩٧٠) بووە. ساڵانێکی زۆر لە ئەستەمبووڵ موفتی و سەرۆکی لیژنەی پێداچوونەوە بە قورئانەکان بووە. بە پیاوێکی کارگوزاری ئایینی ناسراوە. شێخ عەبدولحەکیمی مامی محەممەد تۆفیق ئەرواسی کە یەکێك بووە لە هەشت کەسی یەکەمی ئەو تاقی کردنەوەیەی، کە هەشت سەد کەس بەشدارییان تێدا کردووە، لە سەردەمی عوسمانیدا پێشنوێژیی مزگەوتی سوڵتان ئەحمەدی کردووەو دەبێتە مامۆستای سوڵتان عەبدولحەمیدیش[٢١]. محەممەد شەفیق ئەرواسی یەکێکە لە برادەرە نزیکەکانی سەعید نوورسی، ماڵی محەممەد شەفیق ئەرواسی کە ئەندامی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان (تەعالی) بوو: ((لە (مەشرووتەی تەکیە)ی (ئەسکەلەی بۆستان)ی (سوڵتان ئەییووب)دا بوو))[٢٢]. محەممەد شەفیق ئەرواسی کە ساڵی (١٩٧٠) کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی (ئەدرنە قاپوسو- دەرگای ئەدرنە)دا دەنێژرێ. لامیعە خانمی کچی ئەو شەفیق ئەرواسییەی چل ساڵ لێدووانی ئایینیی لە مزگەوتی ئەییووبدا پێشکەش کردووە، لەو دواییانەدا لەو خانووەیاندا دادەنیشت کە لە تەك مزگەوتی ئەییووبدا بوو.

یەك لەو کەسایەتییانەی لە ئەستەمبووڵ رێزی بووە، ئەمین عالی بەدرخانە (١٨٥١-١٩٢٦). ئەمین عالی بەدرخان کە لە گەلێك ناوچەی وەکو سەلانیك، ئەدەنە و ئەدرنە، بووەتە پشکنەری دادوەری. لە ئەنجامی ئەو دژایەتییانەی بەرامبەر بەدرخانییان کرا ئەمیش بەرەو (ئیسپارتە) دوور خراوە و سورەبییاو کامەران و جەلادەت بەدرخان - ی کوڕەکانی لە پێکهاتنی بیری

20- age, s.213.
21- Musa Anter, Hatıralarım, II. Baskı, Stokholm, 1991, s.72.
22- Necmeddin şahiner, Son şahitler 4, İstanbul, 1988, s.177.



نەتەوەیی مۆدێرنی کورددا هەوڵێکی زۆریان داوە. ئەمین عالی بەدرخان کە دامەزرێنەری کۆمەڵەی (هاوکاری و پێشکەوتن)ی کوردە و دووەم سەرۆکی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کورد (تەعالیی کورد) بووە، دواتریش بووەتە سەرۆکی کۆمەڵەی پێکهاتنی کۆمەڵایەتیی کورد (تەشەککولی ئیجتیماعییەی کورد) کە لەو کەسانەی دامەزراندبوو وا لە (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان) جودا بووبوونەوە. ئەمین عالی بەدرخان لەم دەمانەدا لە گەڕەکی (موهورلەر)ی (کادی کویی- قاضی کویی)ی بەری ئاسیای ئەستەمبووڵدا دەژیا. جگە لە ئەمین عالی بەدرخان، عەلی شامیل پاشاو عەبدوڕڕەززاق بەگ، بە دوو کەسایەتیی ریزی پێشەوەی ئەو بەدرخانییانە ناسرابوون کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان. بەدرخانییەکان کە ساڵی (١٩٠٦) بەرەو تاراوگەی جوداجودا دوور خرانەوە، بە جاڕدانی مەشرووتییەتی دووەم، ساڵی (١٩٠٨) گەڕانەوە ئەستەمبووڵ.

کوڕەکانی ئەمین عالی بەدرخان، سوورەبییا و جەلادەت و کامەران، دواتر لە پێکهاتنی بیری نەتەوەیی کورددا رۆڵی گرنگ دەبینن. بۆ گەیاندنی دەنگی کورد بە رای گشتی، لە پایتەختە جیاجیاکاندا هەوڵێکی زۆر دەدەن. ئەم سێ برایەی لە تەمەنێکی گچکەوە بە هەستی نەتەوایەتی پەروەردە بوو بوون، هێشتا لەو دەمانەدا کە لە ئەستەمبووڵ بوون تێکەڵ بەکارە نەتەوەییەکان دەبوون. ساڵی (١٩١٩) هەردووبرا، جەلادەت و کامەران لە ئێستگەی (حەیدەر پاشا)ی ئەستەمبووڵەوە بە قیتارێك بەرێ دەکەون، لەگەڵ (نوئێل) بەشدارییان لە رێگوزارییەکی لێکۆڵەرەوانە کرد کە لە کوردستاندا رێکخرابوو. ئەم ساڵانە ئەو ساڵانەن کە لە بارەی کوردستانەوە دەست بە (گفتوگۆ و خەبات) کراوە. ئەم دۆزە لە خاڵە سەرەکییەکانی نەخشەی چینە رۆشنبیرە کوردەکانی ئەستەمبووڵ بووە.

کامەران بەدرخان کە ساڵی (١٨٩٥) لە ئەستەمبووڵ لە دایك بووە، هەر کە لاوێکی تەمەن نۆزدە ساڵان بووە لە ئەستەمبووڵ دەستی بە راگەیاندنی دەنگی خۆی کردووە. بۆ نموونە لە گۆڤاری (جیهانی ئافرەتان)دا کە ساڵی (١٩١٤) لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ. کامەران بەدرخان ساڵی (١٩٧١) کە چووەتە سوێد، لەو گفتوگۆیەدا کە لە رۆژنامەی (Dagens Nyheter)ی یەك لە گەورەترین رۆژنامەکانی سوێددا لەگەڵیدا کراوە، باس لە رووداوێك دەکا کە لە ئەستەمبووڵ رووی داوە و زۆر کاری لێ کردووە و دەڵێ ئەو رووداوە

تەواوی جیهانی ئەوی گۆڕیوە. لە ئەستەمبووڵ کە تەمەنی بیست ساڵان بووە، ساڵی (١٩١٥) بە کەشتی دەچێتە بەری ئاسیای ئەستەمبووڵ، کەسێك بەناوی (یەشار نووری)یەوە کە ئەندامی (یەکگرتن و پێشکەوتن) بووە، دێتە لای و بڕیاری لەناوبردنی کەمایەتییەکانی پێ ڕادەگەیەنێ. باسی ئەوەشی کردووە کە دوای لەناوبردنی ئەرمەنی و یۆنانی و کوردیش بۆ خۆراوا دوور خستنەوە و پەرت و بڵاوکردنیان، دۆزی کەمایەتی لە تورکیا یەکلا دەکرێتەوە. کامەران بەدرخان ئەم قسانە پڕ لە مەترسی و لە بیم دەزانێ، ئەم گەشتە نیو سەعاتییەی ناو (بوغاز) تەواوێك جیهانی لێ دەگۆڕێ.

بەدرخانییان، بە هۆی زۆریی ژمارەیانەوە لە ئەستەمبووڵ، لە نێو خۆیاندا خۆیان ڕێکخستووە و دواتریش ساڵی (١٩١٨) کۆمەڵەیەك بە ناوی (کۆمەڵەی بنەماڵەی بەدرخانی) دادەمەزرێنن. بوونی کۆمەڵەیەکی سەیر و سەرنجڕاکێشی وەهای بنەماڵەیەك ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بنەماڵەی بەدرخانییان چ کۆمەڵگەیەکی فراوانی لەم سەردەمەدا لە ئەستەمبووڵ پێکهێناوە. بەدرخانییان کە بە پلەی یەکەم کادی کوێی و ئویسکویدار ناوچە جێنشینییەکانیان بووە، بە ناوچە جیاکانی ئەستەمبووڵیشدا بڵاوبوونەتەوە. بە پێی ئەو زانیارییانەی لە یادداشتەکانی (نیعمەت ئارزك) دایە عەبدوڕڕەحمان بەدرخان، ڕۆژنامەی کوردستانی دەرکردووە کە تایبەتمەندیی ڕۆژنامەی کوردیی پێوەیە، لە نشێوی کۆڵانی دالیانی فەنەربەخچەدا دادەنیشت و دراوسێی نیعمەت ئارزك بووە. عەبدوڕڕەزاق بەگیش کە لە بەدرخانییەکان بوو. وەکو پێشتر گوتمان لە (شیشلی) دادەنیشت. گۆڕستانی بنەماڵەی بەدرخان، لە قەرەجە ئەحمەدی ئویسکویداردایە کە گەورەترین گۆڕستانی ئەستەمبووڵە[٢٣]. ئویسکویدار وەکو گەڕەك یەکێکە لە کۆنترین و گرنگترینی شوێنەکانی کوردەکان. ئەم گەڕەکەی بەری ئەنادۆڵ (ئاسیا)، یەکێك بووە لەو شوێنانەی کوردەکان لە لایە جیاجیاکانی کوردستانەوە بۆ یەکەمجار هاتوونەتە ئەستەمبووڵ هاتوچۆی ئەوێیان کردووە.

دوای ئەوەی پێیان ناوەتە ئەستەمبووڵ، بەرەبەرە بەری ئەورووپای ئەستەمبووڵیان دۆزیوەتەوە. بەهۆی کار پەیداکردنەوە، پەڕیونەتەوە ئەو بەر، ئەم ناوانەشیان بۆ نیشتەجێ بوون هەڵبژاردووە، ساڵی (١٨٥٤) کە قەرەفاتمە بە (ئەمازۆنی کورد-ژنە سوارچاکی ئازا) ناونراوە، لە تەك

23- Malmisanij, Bedirhaniler, Stokholm, 1994, s.118-121.



سوارچاکێکی زۆردا لە (مەراش-مەرعەش)ەوە هاتووەتە ئەستەمبووڵ، وەکو دواتریش دەبینین، بۆ یەکەمجار لە ئویسکویدار بینراوە و لەلایەن خەڵکەوە، بەڕێزەوە پێشوازیی لێ کراوە.

ئێستگەی حەیدەر پاشا کە، لە بەری ئەنادۆڵی ئەستەمبووڵدایە. دەکرێ بە یەکەم شوێنپێی ئەو کوردانە دابنرێ کە لە کوردستانەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ پێیان پێدا نابێ، (نەجدەت سەقا ئۆغلۆ) لە بارەی ئەم ناوەندە مێژووییەوە، بەم ڕوونکردنەوانە دیدی خۆی دەردەبڕێ: ((ئەم مرۆڤانەی لە ئەنادۆڵەوە بە قیتار دەهاتن و بۆ یەکەمجار لێرەوە ئاشنایەتی لەگەڵ ئەستەمبووڵ پەیدا دەکەن و یەکدی دەناسن. تەنانەت ئەوانەشیان کە ئەم شارە ئەفسووناوییە جێدەهێڵن، بە هەستی جۆراوجۆرەوە، بۆ دواجار لەم ئێستگە گەورەیەوە جێیدەهێڵن. ئەم ئێستگەیە لە (١٩٠٨)ەوە تا (١٩٦٠) ڕووداو و یادگارییەکی زۆری لە یاد نەکراوەی بینیوە)).

تا ئەم ساڵانەی دوایی، هەندێك لە بەدرخانییەکان لە ئەستەمبووڵ ژیانیان بەسەربردووە. کاریگەریی فشار و سیاسەتی پەرت و بڵاوکردنەوەی پەرەسەندوو، کەسایەتییە کوردەکانی هێنایە بارێکەوە کە نەدەتوانرا بەرگرییان لێ بکرێ. بەدرخان چناری، ڕۆمانووسی پۆلیسی یەك لەم بەدرخانییانەیە. بەدرخان چنار لە ئسپارتە لەدایك بووە، کوڕی حیکمەت بەدرخانە. ساڵی (١٩٤٢) دەستی بە ژیانی ڕۆژنامەوانی کردووە و لەو سەروبەندەدا. لە ڕۆژنامەی تەنین (طنین) و میللییەتدا کاری کردووە. دواتر زنجیرەیەك کورتە چیرۆك و ڕۆمانی نووسیوە: مردووی بە تارا (کۆچیرۆك ١٩٤١) مەرگی سپی (ڕۆمان ١٩٤٥)، ئەوانەی وازی بە ئاگر دەکەن (ڕۆمان ١٩٥٣) بەسەرهاتە کارەساتئامێزەکان (کۆچیرۆك ١٩٥٤) قانوونی چیا (کۆچیرۆك ١٩٦٨) هەوری ڕەش (ڕۆمانی منداڵان). بەدرخانییەکی دیکە، کە بەشێکی زۆری تەمەنی لە ئەستەمبووڵ بەسەربردووە، تۆفیق عەلی چناری کوڕی ئەمین عالی بەردەخانە، ساڵی (١٩٠٠) لە ئەستەمبووڵ هاتووەتە جیهان، کۆلیژی دارستانی تەواو کردووە (کشتوکاڵ)، دواتر لە ئەڵمانیا درێژەی بە خوێندن داوە و دوکتۆرای لەوێ وەرگرتووە. دوای گەڕانەوەی بۆ تورکیا لە شوێنی جوداجودا کاری کردووە. ساڵی (١٩٦٣) بۆ کارێك چووەتە پاریس، لەوێ لە ئەنجامی ڕووداوێکی ترافیك (هاتوچۆ) گیانی لەدەست داوە. تۆفیق عەلی چنار، برای جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخانە کە خزمەتی گەورەیان بە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد کردووە. (جەمال کوتای) کە بە هەندێك لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە ناسراوە، باوکی لە بەدرخانییانە، بەڵام جەمال

کوتای لە بارەی بنچینەی تەکنیکیی خودی خۆیەوە هەڵوێستێکی دانپێدانەنان دەنوێنێ. بۆ نموونە لە لێتۆژینەوەیەکیدا کە لە بارەی سەعید نوورسییەوەی کردووە. شوێنەواری دانپێدانەنانی پێوە دیارە. هەندێك لە ئەندامانی بنەماڵەی جەمیل پاشا لە سەرەتای سەدەی بیستدا لە ئەستەمبووڵ بوونە. هەندێك لە منداڵەکانی لەو قوتابخانە نموونەییانەدا خوێندوویانە کە ساڵی (١٩٠٨) کراوەتەوە و جۆرە پەروەردەیەکی تایبەتیی دەسەپاند. ئەکرەمی جەمیل پاشا، ژمارەی ئەو قوتابییە کوردانەی لەم قوتابخانانەدا خوێندوویانە بە پانزدە قوتابی دادەنێ و بڵاوبوونەوەی گڕی بیری کوردایەتی لە ناو قوتابییانی کوردی ساڵی (١٩٠٨) تۆمار دەکا. کەسایەتییەکی زۆری ئەم بنەماڵەیە کەوتوونەتە بەر کاریگەریی ئەم بە ئاگاهاتنە نەتەوەییەی لە ئەستەمبووڵدا پەیدابووە. هەروەها پێشەوایەتیی ئەم تێکۆشانەش دەکەن. لە ناو ئەو کۆمەڵەیەی خوێندکارانی کورددا کە ساڵی (١٩١٢) لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە و بە دڵسۆزی کاری کردووە و دواتریش لاوێکی زۆری بنەماڵەی جەمیل پاشا بەشدارییان لەو کردەوە میللییە پەرەسەندووە کردووە کە لە ئەورووپا و دیاربەکردا پەرەی سەندووە. لەمانە، عومەری جەمیل پاشازادە، دەبێتە یەکەم سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیەی قوتابییانە، کە لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە.

ساڵی (١٩٢٥) کە بزووتنەوەی شێخ سەعید بەرپا دەبێ، ئەو ئەکرەم جەمیل پاشایەی کە دەگیرێ، ماوەی سێ ساڵ و نیو لە بەندیخانەی (قەستەمۆنی)دا دەمێنێتەوە و بۆ شوێنی جیاجیاش دوور دەخرێتەوە. دواتر بۆ بەسەر بردنی شەش مانگی دوور خستنەوە، دێتە ئەستەمبووڵی شاری لاوێتیی: ((.. شەش مانگیش لە ئەستەمبووڵ ژیانی تاراوگەییم بەسەر برد، لە ئەستەمبووڵدا تەنیا حەفتەیەك توانیم دایکم ببینم کە لە خەم و پەژارە ئیفلیج بوو بوو. هەردوو دەست و هەردوو پێی نەدەجووڵانەوە، دەنگی لێوە نەدەهات و زاریشی هیچی نەدەگوت، دوای حەفتەیەك لە گۆڕستانی (ماچکا)ی ئەستەمبووڵدا لە تەك باوکمدا نێژرا. من هێشتا لە بەندیخانەدا بووم باوکم مردبوو)). ئەکرەم جەمیل پاشا کە دایك و باوکی لە ئەستەمبووڵ ون کردووە. دوای ئەم ژیانی تاراوگەییەی دەچێتە سووریاو لە وێ بەشداری لەو بزووتنەوەی کوردایەتییە دەکا کە بە رابەرایەتیی (خۆیبوون) پەرەی سەندبوو.

یەك لە بەرگریکارە بیرمەندە ئاگرینەکانی بیری مۆدێرنی نەتەوەیی کوردی ئەستەمبووڵ بەبێ هیچ گومانێك (خەلیل خەیالی)یە. خەلیل خەیالی لە بتلیس لەدای کبووە، دواتر بە نیازی



خوێندنی باڵا دەچێتە ئەستەمبووڵ، لەوێدا وەك ژمێریاری قوتابخانەی باڵای کشتوکاڵی حەلقەلی کار دەکا. خەلیل خەیالی کە قوتابییانی کوردی ئەستەمبووڵی ڕێکخستووە، لە پەرەپێدانی گیانی نەتەوایەتی لەناو قوتابییاندا هەوڵێکی زۆری داوە. لەم سەروبەندەدا لاوێکی زۆری کورد لە قوتابخانەی کشتوکاڵدا بوون. وەکو سورەییا بەدرخان و عومەری جەمیلپاشازادە کە لە سەرەوە باسمان کرد.. خەلیل خەیالی گرنگیی زمانی لە راپەڕینی نەتەوایەتییدا بە بەرچاوەوە دەگرت و دەتوانین بڵێین یەکەمینی ئەو رۆشنبیرە کوردانەیە لەم مەیدانەدا دەستیان بەو کارە کردووە. بۆیە لەناو ئەو رۆشنبیرە کوردانەی لە ئەستەمبووڵدا دەژیان جێیەکی تایبەتیی هەیە. هەر لەم ساڵانەدا پێکەوە لەگەڵ (زیا گوێك ئالپ)دا هەندێك لێکۆڵینەوەی زانستی لە بارەی زمانی کوردییەوە ئەنجام دەدا. بەڵام زیا گوێك ئالپ نووسینە سەرەتاییەکانی ئەم لێکۆڵینەوە هاوبەشانە لای خۆی گل دەداتەوە و نایداتەوە، گوایە ئەوانەی سووتاندووە. ئەکرەمی جەمیل پاشا کە زۆر هاتوچۆی نووسینگەی دیاربەکری (دیوان یۆڵو) کردووە کە لەوێ، بیری لاوانی کوردی لە بارەی کولتووری کوردەوە رۆشن کردووە. دەڵێ: ((ئەم زاتە بیست ساڵ مامۆستایەتیی کوردایەتیی لاوە کوردەکانی ئەستەمبووڵی کردووە))[٢٤]. ئەکرەمی جەمیل پاشا دەڵێ: ئەوی بۆ یەکەم جار ساڵی (١٩٠٩) ناسیوە و لەو دەمانەدا تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵان بووە. ئەکرەم جەمیل پاشا، ئەوە روون دەکاتەوە کە ساڵی (١٩٢٩) دوای دەرچوونی لە بەندیخانە، لە چوونەوەی ئەستەمبووڵیدا خەلیل خەیالیی لە ناو پێخەفی نەخۆشیدا بینیوە.

زیا گوێك ئالپ (١٨٧٦-١٩٢٤) کە لەگەڵ خەلیل خەیالیدا پێکەوە، لە ئەستەمبووڵ هەندێك لێکۆڵینەوەی زانستیی لە بارەی زمانی کوردییەوە درێژە پێ داوە، لەلایەن بنچینەی ئەتنیکییەوە کوردە، دیاربەکرییە. دواتر لە ئەنجامی هەندێك تەنگژەی کەسایەتی، کوردایەتیی خۆی ئینکار کردووە، دەبێتە یەکێك لە بەرگریکارە ئاگرینەکانی ئایدیۆلۆژیای تورکچییەتی و بە یەکێك لە بنیاتنەرانی ئەم ئایدیۆلۆژیایە دادەنرێ[٢٥]. خالیدە ئەدیب ئادیوار لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژە بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە سەیرەی لە بارەی بابەتی زمانی کوردییەوەی سەردەمی ژیانی ئەستەمبووڵی زیا گوێك ئالپ دەکا، کە لە سەرەوە باسمان کرد. بە پێی

24- Ekrem Cemil Paşa, Muhtasar Hayatım, Brüksel, 1989, s.20.
25- Rohat Alakom, Ziya Gökalp’ın Büyük çilesi: Kürtler. İstanbul, 1992.

بۆچوونی خالیدە ئەدیب ئادیوار، زیا گۆیك ئالپ لە سەرەتای لاوێتیدا کاری لە بابەتی ڕەگ و ریشەی زمانی کوردی و ڕێزمانییەوە کردووە، ئەم هەڵوێستە لە هەندێك ناوەندا رێی بۆ ئەوە خۆش کردووە کە وەکو نەتەوەییەکی کورد بناسرێ[٢٦]. لەم بابەتەدا هەواڵێکی سەیر لە رۆژنامەی (تەعاون و تەرققی)ی کورددا کە ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستەمبووڵ بڵاوکراوەتەوە بەرچاو دەکەوێ: ((زیا ئەفەندیی ئەدیبی رێزداریش، بەوەی کە بەرهەمی کۆشش و لێکۆڵینەوەی ماوەی دە ساڵی، رەشنووسی پەندی پێشینانی کوردی و زانستی زمانی کوردی ئامادەکردووە و بەم نزیکانە فەرهەنگێکی کوردی بڵاودەکاتەوە و بەرامبەر ئەو موژدانەش کە ساڵح بەگی خانی - ش کە یەکێکە لە خاوەن بەهرەکانی ناوچە، لەم بابەتەدا لە بارەی ئەو کۆششەوە کە ئەنجامی داوە، گەلێکی سوپاس دەکەین و پیرۆزباییشی بۆ ئەم کۆششە بەرزانەی لێ دەکرێ)). لە ئەنجامی ئەم روونکردنەوەیەدا زیا گۆیك ئالپ بە یەکێك لە کەسانی ریزی پێشەوەی فیلۆلۆژیستەکانی کورد دادەنرێ.

لە لایەکی کەوە، زیا گۆیك ئالپ، ئەگەرچی رەسەنی ئەتنیکیی خۆی بە تورك دادەنێ، لە سەرجەم تۆژینەوەکانیدا، نکولی لەوە ناکا کە کورد گەلێکە و رەسەنی ئەتنیکیی خۆی هەیە. ئەم لایەنەی زیا گۆیك ئالپ بایەخی خۆی هەیە، زیا گۆیك ئالپ لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەدا کە هاتووەتە ئەستەمبووڵ چووەتە خوێندنگای بەیتاڵی (پزیشکی ئاژەڵ)، لەم سەروبەندەدا لەگەڵ ناوەندە رووناکبیرییەکانی ئەستەمبووڵ ئاشنایەتیی پەیدا کردووە. ساڵی (١٨٩٨) زیا گۆیك ئالپ لە ئەستەمبووڵدا دەگیرێ و ساڵی (١٩٠٠) دووبارە دەگیرێتەوە و لە بەندیخانەی (تاش قشڵە)دا توند دەکرێ.

ساڵانێك بەسەردەچێ و زیا گۆیك ئالپ پەیوەندیی بە کوردانەوە دەبڕێ و وردە وردە دەبێتە یەکێك لە کادیرانی ریزی پێشەوەی (ئیتتیحاد و تەرەققی). کە جەنگی بەڵکان بەرپا دەبێ، ناچار دەبێ بنکەی رێکخراو بگوازێتەوە ئەستەمبووڵ. زیا گۆیك ئالپ لەم دەمانەدا لە (جەرڕاح پاشا)دا لە ماڵێکدا جێگیر دەبێ. دواتر دەگوێزێتەوە کۆشکێکی (بویوك ئەدا) کە بە

26- Memoris of Halide Edib, London, 1926, s.317.



جوانیی سروشتییەوە ناسراوە[٢٧]. گۆڕی زیا گۆیك ئالپ لە باخچەی گۆڕی مەحموودی دووەم دایە لە ئەستەمبووڵ.

ڕۆشنبیرێکی دیکەی کورد کە وەکو خەلیل خەیالی بایەخی بە بنچینەکانی بیری نەتەوایەتیی کورد داوە، (حەمزەی موکسییە، موکسلی حەمزە). ئەم کەسایەتییە کوردە، ساڵی (١٨٩٢) لە شارۆچکەی (موکس)ی سەر بە (وان)دا لەدایکبووە. دواتر بە ئامانجی خوێندنی باڵاوە دەچێتە ئەستەمبووڵ، حەمزەی موکسی، لە (عومەرلی)ی قەزای سەر بە ئویسکویداردا مامۆستایی دەکا. بەشی فارسیی زانکۆی ئەستەمبووڵیش تەواو دەکا. هەر لەوێ عەداڵەت خانم - ی تاتای پرۆفیسۆر عەلی ناهید تەرلان دەخوازێ، کە لەوێ دیخوێند و دواتر دەبێتە یەك لە مامۆستایانی ئەوێ. کچێکیان دەبێ ناوی دەنێن (مەنیژە). هەر لەم دەمانەدا هەست بە گرنگیی کلاسیکەکانی کورد و داستانی بەناوبانگی مەم و زین دەکا. ساڵی (١٩١٩) شاکاری نەمری (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانیی شاعیری کلاسیکیی کورد بۆ یەکەم جار لە شێوەی کتێبێکدا لە ئەستەمبوولی پایتەختدا بڵاو دەکاتەوە و پێشەکییەك بۆ کتێبەکە دەنووسێ[٢٨]. مارتن هارتمەن-ی خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی کە لە بارەی ئەدەبییاتی کوردییەوە هەندێك لێکۆڵینەوەی هەیە، ئاماژە بەوە دەدا کە (مەم و زین) یەکێك بووە لە لیستێك کتێب کە لە لایەن بەڕێوەبەرێتیی ئەوسای ئەستەمبووڵەوە پەسەند نەبووە، بۆیە بۆ یەکەمجار لە دەرەوە و لە شێوەی زنجیرەدا لە رۆژنامەی کوردستاندا بڵاوکراوەتەوە[٢٩]. بۆ یەکەمجار لە چاپدانی ئەم کتێبە لە ئەستەمبووڵ، لە ناو ئەو کوردانەی لە ئەستەمبووڵدا بوون بە رووداوێکی گەورەی مێژوویی و رۆشنبیری دادەنرێ.

حەمزەی موکسی ساڵی (١٩١٩) ناچار دەبێ ئەستەمبووڵ بەجێ بهێڵێ، لە رێی ماردینەوە دەچێتە دیاربەکر و لەوێ دەگیرێ. حوکمی پانزدە ساڵی بە جەزرەبەی بەسەردا دەدرێ و دەنێررێتە قەستەمۆنێ. دواتر حەمزەی موکسی کە لە بەندیخانە دەردەچێ، ساڵی (١٩٢٩)

27- Mehmet Emin Erişirgil, Bir Fikir Adamının Romanı, İstanbul, 1984, s.89, 109.
28- Mehmet Bayrak, Kürtler ve Ulusal Demokratik Mücadeleleri, Ankara, 1993, s.105-108.
29- Martin Hartmann, Der Kurdisch Divan des Schech Ahmed von Geziret İbn’Omer genannt Mälai’i gizri, berlin, 1904, s.x.

دەچێتە سووریا و لەوێ بەشداری لە چالاکییەکانی نەتەوەیی کورد دەکا. ساڵی (١٩٦٠) لە سووریا دەمرێ. بەجۆرە خەلیل خەیالی و حەمزەی موکسی بە دوو رۆشنبیری کورد دادەنرێن کە لە سەردەمێکی زوودا بە بایەخی زمان و ئەدەبییاتی کوردییان زانیوە.

مەمدووح سەلیم (١٨٨٠-١٩٧٦) رۆشنبیرێکی کوردی دیکەیە کە لە ئەستەمبوڵ پێگەییوە. مەمدووح سەلیم کە لەوێ فەلسەفەی خوێندووە و لە رێکخراوی وەك قوتابییانی هێڤیی کورد و کۆمەڵەی تەعالی و تەرەققی - ی کوردستاندا کاری کردووە، لە بڵاوکراوەی ئۆرگانی ئەم رێکخراوانەدا گەلێك نووسینی سەیری بەرهەمهێناوە. مەمدووح سەلیم لە (١٩٢٠) دا ئەستەمبوڵ جێ دەهێڵێ و دەچێتە سووریا، هەندێك کەسایەتیی ریزی پێشەوەی تورکیا، وەکو خالید چەلەنگ-ی دادیار و جەمیل مەریج - ی نووسەرو کەمال سویلکەری سەندیکاپەروەر قوتابیی مەمدووح سەلیم بوونە کە لە ئەنتاکیا مامۆستا بووە و بە پێداهەڵدانەوە باسی مەمدووح سەلیم دەکەن[٣٠]. مەمدووح سەلیم دواتر، ساڵی (١٩٢٧) پێشەوایەتیی کاروباری دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبوون دەکا.

یەك لە کوردە چالاکەکانی دیکە لە ئەستەمبوڵ، ئەحمەد رامزی لیجەییە، ئەحمەد رامز کە بایەخێکی زۆری بە بڵاوکردنەوەی پەروەردە داوە، لەم رێیەوە هەوڵی رۆشنبیرکردنی خەڵکی داوە. لە سەرچاوەکاندا بە (خاوەنی کتێبخانەی ئیجتیهاد) دەناسرێ. ساڵی (١٩١٠) دەبێتە بەرێوەبەری ئەو قوتابخانە کوردییەی بە ناوی (مەکتەبی مەشرووتییەت)ەوە بووە. ئەحمەد رامز کە چەند کتێبێکی نووسیوە، بە پێی قسەی قەدری جەمیل پاشا ساڵانی دوایی لە شام بەرێوە دەبات و لەوێشدا دەمرێ[٣١].

یەك لەو رۆشنبیرانەی بە شیعر و شانۆنامە و نووسینەکانی هاوبەشیی لە پەرەسەندنی نەتەوایەتیی کورد کردووە، عەبدوڕڕەحیم زاپسو-وە (١٨٩٠-١٩٥٨)، زاپسو کە لە ئەستەمبوڵ، کۆلیژی شەریعەی تەواو کردووە. لە ریزەکانی پێشەوەدا کارێکی زۆری بە کوردی نووسیوە و لەم دەمانەدا لەو رۆژنامە و گۆڤارانەدا نووسین بڵاودەکاتەوە کە لە ئەستەمبوڵ

30- kadri Cemil Paşa, Doza Kurdistan, Ankara, s.32.
31- Cemil Meriç, Bütün Eserleri: 2, Bu Ülke, 1994, s.23. Kemal Sülker, Hatay ve okul Anıları, yazko Edebiyat, 24/Ekim 1982.



دەردەچوون. عەبدوڕڕەحیم زاپسو کە لە بابەتە ئایینییەکاندا چەند لێکۆڵینەوەیەکی هەیە، لە ناوچەی ئویسکویداری ئەستەمبووڵدا ناونووس کرابوو بەڵام لە (لالەلی)دا دەژیا. ساڵی (١٩٥٨) کە مردووە، لە گۆڕستانی نەجاتی بەگدا دەنێژرێ. بە پێی قسەی کچەکەشی گۆڕەکەی لە گۆڕستانی بنەماڵەییاندایە کە گۆڕستانی (ئەدرنەقاپی)یە. ژاڵە خانم کە یەك لە کچەکانی زاپسووە کە چوار منداڵی هەبووە، هێشتا لە ئەستەمبووڵدا دەژی. هالە خانمیش کچێکی دیکەیەتی، وەك زانراوە هاوسەری مووسا عەنتەری نووسەری کوردە کە چەندین ساڵی دوورودرێژی تەمەنی خۆی لە ئەستەمبوڵ بەسەر بردووە و ئێستا لە سوێد دەژی.

محەممەد شوکری سەگبان (١٨٨١-١٩٦٠) کەسایەتییەکە بەشداریی لەو بزووتنەوە نەتەوەییەی کورد کردووە کە لە سەرەتای سەدەی بیستدا پەرەی سەندووە. شوکری سەگبانی دوکتۆر، ساڵی (١٩٠٨) کە کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققیی کورد دامەزراوە و کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کورد کە دواتر دامەزراوە و کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان کە هاتووەتە کایەوە، ئەم لە ناو دامەزرێنەران و ئەندامانیدا جێی گرتووە. بارەگای کارکردنی کە لە خانی خرستاکی (ناوی دیکەی خانی سەعید پاشا)ی بەرامبەر ئامادەیی غەڵەتەسەرایی ناوچەی (بەیۆغڵو)دا بووە، دەبێتە یەکێك لەو شوێنانەی کوردەکانی ئەستەمبوڵ هاتو چۆیان کردووە[٣٢]. نهۆمی ژێرەوەی ئەم خانە مێژووییە ئێستا بەرێڕەوی گوڵ دەناسرێ. ئەم خانە لەبەر ئەوەی لە کۆنەوە لە لایەن کچە رووسییەکانەوە گوڵی لێ فرۆشراوە، ناوی رێڕەوی گوڵی لێ نراوە، لە لایەن خرستاکی ئەفەندییەوە دروست کراوە کە یەکێك بووە لەو (رۆم)انەی کاری بانقچێتییان کردووە. شوکری سەگبان لەو دەمانەدا لە (بەیۆغڵو) دادەنیشت کە (پەرا)ی پێ دەگوترا.

[٣٢] خرستاکی ناوی ئەو خانە بووە کە شوێنی کارکردنی محەممەد شوکری سەگبان-ی لێ بووە، بە ناوی کابرایەکی رۆمیی کۆنەوە بووە لەوێ کاری بانقی کردووە. ئەم خانە ئەو تەلارەیە ئێستا ڕاڕەوی (چیچەك)ی لێیە. بڕوانە:

Murat belge, İstanbul Rehberi, İstanbul, 1995, s.237.

یەك لەو شوێنانەش کە کوردەکان هامشۆیان دەکرد، جێی کارکردنی عەبدوڵڵا جەودەت بووە، ئەو بینایەی عەبدوڵڵا جەودەت ساڵی (١٩١٠) لە (چەغاڵ ئۆغڵو)دا بە ناوی (ماڵی ئیجتیهاد)ەوە کردبوویەوە، بووەتە شوێنێکی کۆبوونەوەی ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی لەو ساڵانەدا لە ئەستەمبووڵ دەژیان. نهۆمی دووەمی بۆ کارکردن بەکاردەهێنا، هەر ئەو بینایە هێشتا هەر ماوە و ئێستا لە بیناکەدا(گوڵ خانم)دی کچی عەبدوڵڵا جەودەت و سەباحەددین قارڵیداغ کە یەکێکە لە نەوەکانی عەبدوڵڵا جەودەت لەگەڵ خێزانیدا دادەنیشن[٣٣].لە ناو ئەو ڕۆشنبیرانەی ڕەسەنێکی کوردیان هەیە و لە ئەستەمبووڵ دەژین، لە لایەن بیرەوە (کاریزما)ترین و فرەبەرهەمترینیانەوە بەبێ گومان (عەبدوڵڵا جەودەت)ـە (١٨٦٨-١٩٣٢). عەبدوڵڵا جەودەت کە بە خۆی نۆژداری چاو بووە، یەکێك بووە لە یەکەم دامەزرێنەرانی (ئیتتیحاد و تەرەققی) کە خەباتی دژ بە دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید کردووە. عەبدوڵڵا جەودەت کە یەکێکە لەو کەسایەتییە ڕۆشنبیرانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان، شیعری نووسیوە و زنجیرە کتێبێکی فەڕەنسیی وەرگێڕاوەتە سەر تورکی. لە سەرەتای (١٩٠٤)ـەوە تا (١٩٣٢) ڕێك (٣٥٨) ژمارەی گۆڤارێکی بە ناوی (ئیجتیهاد)ەوە بڵاو کردووەتەوە و بیرە جیاکانی خۆی لە ڕێی ئەم گۆڤارەوە هێناوەتە گۆ. گۆڤاری ئیجتیهاد کە ژمارە یەکەمەکانی لە جنێڤ و قاهیرە دەرچووە، بە یەکێك لە تەمەندرێژترین بڵاوکراوەی لە کاتی ڕێکوپێکدا دەرچووی سەردەمی خۆی دەژمێردرێ. عەبدوڵڵا جەودەت، دوای جاڕدانی (مەشرووتییەتی دووەم - دەستووری دووەم) لە تاراوگەوە دەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ، لەگەڵ چینە ڕۆشنبیرە کوردەکانی دیکەی ئەوێدا پەیوەندیی پتەوتر دەکا. عەبدوڵڵا جەودەت لە بارەی کوردەوە بیروباوەڕەکانی خۆی لە ئۆرگانە بڵاوکراوە جیاجیاکاندا بە شێوەیەکی ڕوون دەربڕیوە[٣٤]. عەبدوڵڵا جەودەت کە مردووە، لە

[٣٣] سەباحەددین قارڵیداغی کوڕی محەممەد جەودەتی کوڕی عەبدوڵڵا جەودەتە، لە ئەستەمبووڵ، لە کارگەیەکی چوکۆڵاتە (چوکلێت)دا کار دەکا.

34- Şükrü Hanioğlu, Doctor Abdulla Cevset ve Dönemi, İstanbul, 1981, s.315-341.

سەرچاوەیەکی دیکەی هەر ئەم بابەتە:

Malisanij, kürt Milliyetçiliği ve Abdullah cevdet, Uppsala, 1986.



گۆڕستانی مەرکەز ئەفەندی نێژراوە. عەبدوڵڵا جەودەت کە سێ ژنی هێناوە، دوا هاوسەری هەر لە گۆڕستانی مەرکەز ئەفەندیدا لە تەك گۆڕی عەبدوڵڵا جەودەت-دایە. ئەم هاوسەرەی کە ناوی فاتمە نافیزە قارڵیداغ-ە، ساڵی (١٩٧١) مردووە. عەبدوڵڵا جەودەت دوو منداڵی بووە، گوڵ - ی مامۆستای زمانی ئینگلیزی و محەممەدی عەدلی - ی مامۆستای زمانی فرەنسی، گوڵی کیژی، هێشتا لە ژیاندایە و محەممەدی کوڕی ساڵی (١٩٧٦) مردووە. ئەحمەد ئەنوینلوی نەوەی، کوڕی گوڵی کچیەتی، پاڵەوانی ناسراوی تورکیایە لە وەرزشی لەشجوانیدا. ئەحمەد ئەنوینلو کە ساڵی (١٩٧٠) بۆ یەکەم جار پاڵەوانێتیی جیهانی بەدەستهێناوە، تا ئێستا هەشت جاران مێداڵیای زێڕی جیهانی وەرگرتووە. ئەحمەد ئەنوینلو لە (ماڵی ئیجتیهاد) دادەنیشێ کە عەبدوڵڵا جەودەت ساڵی (١٩١٠) بنیادی ناوە. عەبدوڵڵا جەودەت بەر لە مردنی مانگەکانی هاوین لە کۆشکێکی (بویوك ئەدا) دا دەژیا، پێیان دەگوت کۆشکی (عەلەمچییان). ساڵی (١٩٣٢) کە کۆچی دوایی کرد، ئەم کۆشکە بۆ فاتمە خانمی هاوسەری بەجێ ما، دوای مردنی ئەویش گوڵ قارلیداغی کچی عەبدوڵڵا جەودەت بووە خاوەنی ئەم کۆشکە. گوڵ قارلیداغ لە (١٩٧١)ەوە، هاوینان لەم کۆشکە دەژیا کە لە (بویوك ئەدا) دایە. دوکتۆرێکی دیکەی کورد کە لە ئەستەمبووڵ خوێندنی تەواو کردووە، ئیسحاق سوکووتی - یە (١٨٦٨-١٩٠٣). ئیسحاق سوکووتی کە پزیشکی سەربازیی خوێندبوو و لە کوردەکانی دیاربەکر بوو، ئەو پەیوەندییانەی بە عەبدوڵڵا جەودەتەوە هەیبوو، لەم سەروبەندانەدا لە ئەستەمبووڵ پەرەپێ دەدا. ئیسحاق سوکووتی و عەبدوڵڵا جەودەت لە دامەزرێنەرە بەراییەکانی کۆمەڵەی (ئیتتیحاد و تەرەققی)ن. بەجۆرە پێشەوایەتیی دوو قوتابیی کوردمان بەرچاو دەکەوێ لەو خەباتەی دژ بە سوڵتان عەبدولحەمید کە لە ئەستەمبووڵ بەرپا بووە. ساڵی (١٨٩٦) بە پێنج ساڵ دوور خستنەوە بۆ تاراوگە سزا دەدرێ و دەنێررێتە (ڕۆدوس)، ئیسحاق سوکووتی کە لەوێوە ڕێیەك دەبینێتەوە و رادەکا، دواتر لە جنێڤ نیشتەجێ دەبێ. ئیسحاق سوکووتی کە ساڵی (١٩٠٣) لە ئیتاڵیا دەمرێ، لە لایەن (ڕزا نوور)ەوە ئێسك و پروسکی ساڵی (١٩٠٩) دەهێنرێتەوە ئەستەمبووڵ و لە باخچەی گۆڕستانی سوڵتان مەحموودا دەنێژرێ. رزا نوور لە بیرەوەرییەکانیدا کە دواتر بڵاوبووەتەوە، بە شێوەیەکی دوورو درێژ باسی لەوە کردووە[٣٥]. دوای

35- Rıza Nur, Hayat ve Hatıratım I, İstanbul, 1991, s.270-276.

مردنی ئیسحاق سوکووتی، عەبدوڵڵا جەودەت شیعرێکی نووسیوە، بەمجۆرە باسی ئیسحاق سوکووتی دەکا:

**گیانی گەورە، گەورەترین ئامانجی**

**لەڕێی حەقدا، دادانی وانەی مەرگە**

**ئومێدی ڕێزداری گوڵ دەپشکوێنێ**

**ئەو ئومێدەی خستنی زۆرداریيە**

**ئەوەش مێژووی (ئیسحاقی سوکووتی)یە**

**زۆرداری دی، چەوساوە و لاتیشی دی**

**دادوەری، بە خوێن تفی بە ڕوودا کرد**[*۱]

ژمارەی ئەو کەسە دیارە کوردانەی لە ئەستەمبوڵدا دەژیان، زۆر زۆرن. لوتفی فیکری- ی سەرۆکی ژووری دادیارانی ئەستەمبوڵ، (ئامرئینزیبات)ی ئەستەمبوڵ، خەلیل بەگی میرالای و گەلێك کەسایەتیی دیکەی کورد لە ئەستەمبوڵ دەژیان. لەمانە، لوتفی فیکری (۱۸۷۲-۱۹۳٤)

---

[*۱] شیعرەکەی بەو جۆرە کردووەتە کوردی دەقە تورکییەکەی ئەمەیە(وەرگێڕ):

**Büyük ruhun en büyük insiyaki**

**Hak yolunda ölmek dersi vermekti.**

**Muazzez emeli güller açıyor…**

**O, emeli istibdadı devirmekti**

**İşte İshak Sükuti'nin tarihi.**

**Gördö zalimi, mazlumu, Züğürdü**

**(Adalet) in yüzüne kan tükürdü**



لە پاریس، قانوون (حقووق) دەخوێنێ و دوای کوودەتای (۱۹۰۸) لە (مەجلیسی مەبعووسان — پەرلەمانی ئەوسا)دا بە نوێنەری دەرسیم هەڵدەبژێررێ. بە بیروڕا ئۆپۆزسیۆن ناسراوە. لوتفی فیکری لە سەردەمی کۆماریدا چەند جارێك دادگایی کراوە، دواتر تووشی نەخۆشیی شێر پەنجە بووە و لە تەمەنی (٦٢) ساڵیدا لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

(۲)

هەندێك لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوڵ دەژیان لە و کوردستانی باشوورەوە دەهاتن کە پێی دەگوترێ کوردستانی عیراق، بەشێکی ئەم کوردانە کە لە شارانی وەك سلێمانی و هەولێر و کەرکووك و مووسڵەوە بە ئامانجی خوێندن دەهاتنە ئەستەمبوڵ، بەشێکیشیان لە کاروباری میریدا فەرمانبەر بوون و هەندێکی دیکەیان خاوەن کاروباری سەربەست بوون و لە کاری جیاجیادا کاریان کردووە.

حاجی قادری کۆیی (۱۸۱۵-۱۸۹۷)ی شاعیری کورد، کە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەستەمبوڵ ژیاوە، بەبێ هیچ گومانێك بە گرنگترین کەسایەتی دێتە پێش چاو کە سەرچاوەی هەڵکردنی بای کوردایەتی بووە و ئەو وەچەیەی لە سەدەی بیستەمدا لە ئەستەمبوڵ کوردایەتییان ڕێکخستووە، لە ژێر کاریگەریی ئەودا بوون. ئەم شاعیرە کوردە، لە سەر هێڵی ئەحمەدی خانیی بیرمەندی گەورەدا ڕێی کردووە، لە شیعرەکانیدا بە چڕی مۆتیڤە نەتەوایەتییەکان دەکاتە بابەت. تایبەتمەندییەکی دیکەی حاجی قادری کۆیی، ئەنجامدانی مامۆستایی منداڵانی ئەو بەدرخانییانەیە کە لەو ساڵانەدا ژمارەیان لە ئەستەمبوڵ زۆر زۆر بووە. حاجی قادری کۆیی بەر لە مردنی، بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی، دیوانەکەی داوەتە لای عەبدوڕڕەززاق بەگی یەك لە بەدرخانییان. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین، یەکەم خولقێنەری یان سیمبولی کوردایەتییەك کە لە سەرەتای سەدەی بیستدا لە ئەستەمبوڵ پەرەی سەندووە، حاجی قادری کۆییە. سەرەڕای دەستکورتیمان لە تێکڕای ژیانی لە ئەستەمبوڵیدا، بیروباوەڕەکانی حاجی قادری کۆیی ئەوە پیشان دەدا کە کوردپەروەرێکی ئاگرین بووە. دواتر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کەسایەتییە گرنگەکانی ئەو وەچەیەی بە هەستی نەتەوەیی و بە بیروباوەڕەوە لە چالاکیدا بوون بەبێ پسانەوە دەگەڕانەوە سەر بنەمای بیری حاجی قادری کۆیی. حاجی قادری کۆیی بڵاوکردنەوەی یەکیەتی و پێکەوە بوون و نزیکبوونەوەی نەتەوەیی و

زیندووکردنەوەی بیری رزگاریخوازی لە ناو خەڵکدا بە ئامانج گرتبوو، بۆیە لە لای خەڵك دەبێتە یەکێك لە خۆشەویستترینی شاعیرانی کورد. حاجی قادری کۆیی ساڵی (١٨٣٩) دەچێتە ئەستەمبووڵ و تا مردنی لە ساڵی (١٨٩٧)دا هەر لە ئەستەمبووڵ دەبێ. حاجی قادری کۆیی گرنگییەکەی لەوەدایە کە دەبێتە گرنگترین نوێنەری موژدەبەخشی ناو کوردەکانی ئەستەمبووڵ و نوێنەرایەتیی تەواوی کاریگەریی رۆشنبیرانەی نێوان کوردی باشوور و باکووری کردووە و رۆڵی پردی نێوانیانی بینیوە. ئەم کەسایەتییە کوردە بە باوکی ئەو بیرە نەتەوەییە مۆدێرنە کوردییە دادەنرێ کە لە ئەستەمبووڵ پێکهاتبوو[٣٦].

بابانییانی سەر بە بنەماڵەی بابان، لە ئەستەمبووڵ کۆمەڵێکی گەورە پێکدەهێنن. لەمانە، سەعید پاشا(١٨٣٥-١٩٠٧) ساڵانێکی دوورودرێژ لە سەردەمی سوڵتان عەبدلوحەمیددا وەکو وەزیری کاروباری دەرەوە و سەرۆکی شوورای دەوڵەت کاری کردووە. پێشتریش لەو دەمانەدا کە لە (ڤارنا) کاری کردووە، لەگەڵ موعەللیم ناجی (١٨٥٠-١٨٩٣)ی نووسەری تورکدا دۆستایەتییەکی ئاشکرای دەبێ. سەعید پاشا لە ئەستەمبووڵ کە وەزیری دەرەوە دەبێ موعەللیم ناجی دەگوێزرێتەوە (قەڵەمی مەکتووبی)[*٢]ی. سولەیمان پاشا و عیززەت پاشای براکانی (سەعید پاشای کورد)و شەریف پاشا و فوئاد پاشای کوڕەکانی لە میریدا فرمانی گرنگیان بە دەستەوە بووە. عیززەت پاشای یەك لە براکانی کە ساڵی (١٨٧١) لە ئەستەمبووڵ لە دایك بووە، زمانی بیانیی خوێندووە و بیست و چوار ساڵی رێك لە (ژووری وەرگێڕان)ی بابی عالی - دا کاری کردووە و ساڵی (١٩١٩) کراوەتە والیی ئایدن و عیززەت پاشا کە بە

36- Mehmet Çağlayan, şark Ulemasi, İstanbul, 1996, s.180.

لە بارەی مێژووی مردنی حاجی قادری کۆییەوە، هەندێك سەرچاوە زانیاریی هەڵەیان تێ کەوتووە، لە ژمارە (٣)ی رۆژنامەی (کوردستان)دا کە ساڵی (١٨٩٨) لە قاهیرە دەستی بە بڵاوبوونەوە کردووە، تێبینییەك لە بارەی مردنی بەر لە ساڵێکی ئەوسای حاجی قادری کۆیی تێدایە، پەنا بەو تێبینییە، دەردەکەوێ کە حاجی قادری کۆیی ساڵی (١٨٩٧) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە:

(Kurdistan-İlk kürt Gazetesi, Arap harflerinden latin harflerine çeviren: M. Emin Bozarslan, cild I, Uppsala, 1991, s.135)

[*٢] قەڵەمی مەکتووبی: فەرمانگەی نووسینی هەموو جۆرە نووسراو و فەرمانی فەرمی. (وەرگێڕ).



تەنگژەیەکی دڵ ساڵی (١٩١٩) مردووە، لە تەك سولەیمان پاشای برای نێژراوە کە بەر لە دە رۆژی مردنی ئەویان لێرە (واتە لە ئەستەمبووڵ) مردووە[٣٧]. فوئاد پاشای یەك لە کوڕانی سەعید پاشا، یاوەری سوڵتان عەبدولحەمید بووە، دواتر دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی (تەعالیی کوردستان). شەریف پاشای کوڕەکەی دیکەی، بە باڵیۆزی عوسمانی لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوێد دادەمەزرێ، دواتریش کە لەم ئەرکە جودا دەبێتەوە، وەك نوێنەری کورد بەشداریی پەیوەندییەکانی کۆنگرەی ئاشتیی سیڤەر دەکا کە لە پاریسدا دەستی پێ کردووە. سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم سەعید پاشای زۆر خۆشویستووە و بەم هۆیەوە، هاوینە کۆشکێکی ناوچەی (قورۆچەشمە) بە سەعید پاشا دەبەخشێ. سەعید پاشا کە بەرامبەر مزگەوتی تەشویقییە دادەنیشت، لە سایەی ئەو پەیوەندییەیەوە بە سوڵتان عەبدولحەمید، بابانەکان لە ئەستەمبووڵ هێزێکیان پێکهێناوە و دەبینین کە پایەیەکی بەرزیان بەدەست هێناوە. بە پێی بۆچوونی (سەرمەد موختار ئالۆس)ی لێکۆڵەرەوە، دراوسێکانی لەم کەسایەتییە بە ناوبانگە پێکهاتبوو: ((لە ناوچەکەدا دوای ئەوەی.. تونسلو-ت رەت دەکرد بە ریزە، با بیانژمێرم: کامیل پاشای قوبرسی و سەعید پاشای کورد و سەعید پاشای گچکە ((کوچوك سەعید پاشا)) و مەحموود بەگی نیشلیی-مابەینجی-، ئەمین بەگی داغستانیی مابەینجی..)) سێ تەلار لەم تەلارە رێکو پێکانەیان لەسەر شەقامی تەشویقییەدا کە بەرامبەر مزگەوتی تەشویقییەدا درێژ دەبێتەوە، هێشتا هەر ماون. لەو ناوەدا Beldever و لە پشتییەوە Isplandito و دواتر و ئەو ئەپارتمان (تەلار)ەی بە ناوی ئەپارتمانی مۆدێرنەوەیە دێت. کە ئەو روونکردنەوەیەی سەرمەد موختار ئەڵۆس-ەی سەرەوە بە بەرچاوەوە بگرین، بینای سێیەم واتە ژمارە (٩٧)ی ئەپارتمانی نوێ، دەبێ جێی ئەو کۆشکە بێ کە ساڵانێك سەعید پاشای کوردی لێ دانیشتووە. سەعید پاشا ساڵی (١٩٠٧) کە دەمرێ ئەم کۆشکە بۆ فوئاد و شەریف پاشای کوڕەکانی دەمێنێ. رەزا نوور لە کتێبی (جەمعییەتی خافییە)یدا ئاماژە بەوە دەکا کە شەریف پاشا خانوویەکی لە (نیشان تاشی)دا هەبووە.

مستەفا یامولکی (مستەفا پاشای نەمروود، مستەفا پاشای کورد) کە ماوەیەك کراوەتە سەرۆکی (دیوانی حەربی عورفی) لە ناو ئەو کۆمەڵە کوردانەی کە لە ئەستەمبووڵدا بوون،

37- Engin Berber, Aydın Valisi İzzet Bey’in Hastalığı ve Ölümü, Toplumsal Tarih, no 12, 1994.

ناوێکی گرنگ بووە، خوشکی سەعید پاشای کوردی هێناوە. مستەفا یامولکی تا پلەی فەریق (تومگەنەراڵ) سەرکەوتووە، لە پێشدا دەبێتە ئەندامی دیوانی حەربی عورفی. ماوەیەك بە والیی بورسە دادەمەزرێ. بەڵام دواتر لە کارەکەی دەخرێ، کە فەرید پاشای داماد دەبێتە سەدر ئەعزەم (سەرەکوەزیران) (٥ی نیسانی ١٩٢٠) ئەمجارەیان مستەفا یامولکی دەبێتە سەرۆکی دیوانی حەربی عورفی، بڕیاری ئیعدام کردنێکی زۆر ئیمزا دەکا کە ئەتاتورك لە ریزی پێشەوەی ئەمانەدا بووە. دیوانی حەربی عورفی لە ساڵانی (١٩٢٠)دا لە بینای زانکۆی ئەستەمبووڵ (نەزارەتی حەربییەی کۆن- وەزارەتی جەنگی کۆن) کە لە دائیرەیەکی لای (شاهزادە باشی)دا بووە و مستەفا یامولکی کە بە مستەفا پاشای نەمرووود دەناسرا لێرەدا کاری بەڕێوەدەبرد. مستەفا یامولکی، بەر لە دامەزراندنی رژێمی کۆماری بە ساڵێك، ساڵی (١٩٢٢) دەگەڕێتەوە عیراق و لەو حکومەتەدا کە بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود پێکهێنراوە فرمانی وەزیری پەروەردەی پێ دەسپێررێ. ساڵی (١٩٣٦) هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکا. هەندێك کەسایەتیی پەیوەست بە بنەماڵەی مستەفا یامولکی بەرچاو دەکەوێ کە بە شێوەیەکی کاریگەر بەشداری کردارە نەتەوەییەکانی ئەستەمبووڵ بوون. بۆ نموونە عەبدولعەزیز یامولکی-ی کوڕی و ئەنجومی یامولکی-ی کچی هەندێکن لە مانە[٣٨].

بنەماڵەیەکی دیکەی ناسراوی ئەستەمبووڵ بنەماڵەی زهنی پاشا (١٨٥٠-١٩٢٩)ی بابانە. کەسایەتییەکی زۆری ئەم بنەماڵەیە ئامادەیی (گەڵتە سەرای) یان تەواو کردووە و لە دەرەوەی وڵات (تورکیا) خوێندنیان درێژە پێ داوە و دواتر پۆست و پایەی بەرزیان وەدەست هێناوە. ئەحمەد نەعیم بەگ (١٨٧٢-١٩٣٤)ی یەك لە کوڕەکانی زهنی پاشا بووەتە یەکێك لە خۆشەویستترین ئەندامانی کۆمەڵەی (تەعاون و تەرەققی)ی کورد کە ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە، دواتر خۆی بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی تەرخان کردووە. لە رۆژنامەی کوردیی تەعاون و تەرەققی کە ساڵی (١٩٠٨) بڵاوکراوەتەوە، ئیسماعیل حەققی-ی بابانزادە (١٨٧٦-١٩١٣) بابەتی نووسراوی وەکو کورد و کوردستان و جوگرافیای کوردستان و شوێنە سیاسییەکەیان بەرچاو دەکەوێت. ئیسماعیل حەققی بەگ کە ئەندامی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی-ی کورد بووە و هەندێك کتێبی داناوە، لە تەمەنێکی زوودا مردووە. پرۆفیسۆر

38- Kamil Erdeha, Milli Mücadele Vilaytler ve valiler, İstanbul, 1975, s.337-340.



شوکری بابان (١٨٩٣-١٩٨٠) بووەتە یەکێك لە سیماکانی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان کە لە ئەستەمبووڵ دامەزرابوو. شوکری بابان کە لە ساڵی (١٩٣٣)وە وەکو پرۆفیسۆری باڵای کۆلیژی حوقووق (ماف)ی ئەستەمبووڵ کاری کردووەو لە (١٩٣٨)ەوە لە کۆلیژی ئابووریدا بووەتە ئەندامی دەستەی مامۆستایان. ساڵی (١٩٥٦) بۆ راگرایەتیی ئەم کۆلیژە (عەمادە) هەڵبژێرراوە. شوکری بابان کە لە ناوچەی (فەنەریۆڵو)ی ئەستەمبووڵ دادەنیشت، هەرگیز ژنی نەهێناوە. ساڵی (١٩٨٠) کۆچی دواییی کردووە. دوای مردن بۆ یادەوەریی، سێ پۆلی وانە وتنەوەی کۆلیژی ئابووری، ناوی دەرسخانە (وانەخانە-پۆل)ی پرۆفیسۆری باڵا، شوکری بابانی...ی لێ نرا.

بەشێك لە نەوەکانی بابانەکان ساڵانی دواتر لە ئەستەمبووڵ نیشتەجێ دەبن. یەکێك لەم باباناناش جیهاد بابان (١٩١١-١٩٩٤)ە. لە ئەستەمبووڵ لە دایك بووە و کوڕی حیکمەت بابانە کە نوێنەری سلێمانی و یەکێك بووە لە بەڕێوەبەرە گشتییەکانی کۆمپانیای خەیرییە. حیکمەت بابان لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی بەدرخانیدا، وەك نوێنەری کورد بەشداریی لە یەکەم کۆنگرەی (جۆن تورك)دا کردووە کە ساڵی (١٩٠٢) لە پاریس گیراوە. جیهاد بابان کە ساڵی (١٩٤٦) بە نوێنەری ئەستەمبووڵ هەڵدەبژێرری، ساڵی (١٩٨٠) بووەتە وەزیری رۆشنبیری. لە نێو ئەو کەسایەتییانەی لە کوردستانەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، ناوی ناسراوی دیکەش هەبوون. یەك لەوانە، ئیبراهیم ئەفەندیی حەیدەریی سەر بە بنەماڵەی حەیدەرییە. لە دەڤەری سیلڤان و دیاربەکردا قازییتیی کردووە، دواتر گەلێك فەرمانبەرێتیی جیاجیای دیکەی لە ئەستەمبووڵ کردووە. دواترینیان ئەوەیە کە کراوەتە شەیخولئیسلام. ئەم دامەزراندنە لە لایەن کوردەکانی ئەستەمبووڵەوە بە خۆشی پێشوازیی لێ کراوە و پیرۆزبایی لێ کراوە. لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری ژیندا کە ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) بڵاوکراوەتەوە وتارێکی ئیبراهیم حەیدەری بڵاوبووەتەوە و لە ژمارە دووەوە بووەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی (ژین)، ئیبراهیم ئەفەندی کە لە هەندێك گۆڤار و رۆژنامەی کوردیدا نووسینی بڵاوکراوەتەوە، ساڵی (١٩٢٣) دەگەڕێتەوە بەغدا، لەوێ لە فرمانی جیاجیادا دادەمەزرێنرێ و ساڵی (١٩٣١) لە عێراقدا کۆچی دوایی دەکا[٣٩].

39- Mehmet Çağlayan, şark Uleması, İstanbul, 1996, s.170.

ئەگەر بۆ دواتر بگەڕێینەوە گەلێك کەسایەتی دەبینین کە لە کوردستانی باشوورەوە هاتوون و لە ئەستەمبووڵ ماونەتەوە، لە ناو ئەمانەدا کەسایەتیی وەکو: نالی (١٧٩٧-١٨٥٥)، مەلا محەمەدی کۆیی (١٨٧٦-١٩٤٣)، شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٤٢-١٩١٠)، زێوەر (١٨٧٥-١٩٤٨)، پیرەمێرد (١٨٦٨-١٩٥٠) و ئەمین فەیزی بەگ[*٣] (١٨٦٠-١٩٢٣)، هەندێك شاعیری کورد و نووسەری دیکەیان تێدایە[٤٠]. بۆ نموونە، شێخ رەزای تاڵەبانی بووەتە برادەری نامیق کەمالی شاعیری ناوداری تورك. ((لە ئەستەمبووڵدا هەر لەگەڵ نامیق کەمالدا یەکدییان دەبینی و قسەی شاعیرانەیان پێکەوە دەکرد. نامیق کەمال ئەوی زۆر خۆش دەویست و پەسەند دەکرد))[٤١].

وەکو پێشتر باسمان لێوە کرد، بەرزبوونەوەی ژمارەی ئەو گەورە پیاوە کوردانەی هاتوونەتە ئەستەمبووڵ بە ئاشکرا دیارە، لە نێو ئەمانەدا شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودیش هەیە کە پێشتریش ناومان هێناوە، ئەوسا کە باوکی شێخ مەحموود بە کاروانێکی چل کەسییەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، لەم کاروانەدا، زێوەری شاعیری کوردیش جێی گرتبوو. زێوەر لە یادداشتەکانیدا ئەوەی روون کردووەتەوە کە لەم سەردانەدا لە ئوتێلێکی ناوچەی (نیشان تاشی)دا بووە و سێ مانگ لەوێ ماوەتەوە. سوڵتان عەبدولحەمید نموونەی میواندارییەکی گەورەی بەرامبەر ئەم کوردانەی ئەم کاروانە نوواندووە، کە لە باشووری کوردستانەوە هاتوون.

کەسایەتیی رۆشنبیریی وەك تۆفیقی سلێمانیەیی کە بە پیرەمێرد ناوبراوە و ئەمین فەیزی بەگ ساڵانێکی زۆر لە ئەستەمبووڵ کاریگەرییان لە ژیانی رۆشنبیری و سیاسیدا بووە. ئەمین فەیزی بەگ یەکەم ئەنتۆلۆژیی کورد لە ئەستەمبووڵ ئامادە و بڵاوکردووەتەوە. ئەمین فەیزی بەگ ساڵی (١٩٢٨) لێرە (لە ئەستەمبووڵ) کۆچی دوایی دەکا. تۆفیقی سلێمانیەیی کە شاعیر بووە، ساڵانێك لە ئەستەمبووڵ ژیاوە، لە نێو کورداندا پتر بە پیرەمێرد ناسراوە. لێرە کۆلیژی ماف (حوقووق)ی تەواو کردووە و لە بەڕێوەبەرایەتیی جۆراوجۆردا کاری کردووە و دواتر چووەتەوە کوردستانی عێراق و لەوێ نیشتەجێ دەبێ. پیرەمێرد ماوەیەك لە (هەیبەلی ئەدا-

(*٣) لە دەقی ئەم کتێبەدا بە هەڵە ناوەکە بە (ئەمین فەوزی) نووسراوە (وەرگێڕ).

40- Qanadě Kurdo, Tarîxa Edebyeta Kurdi II, Stockholm, 1985.
41- M. Emin Zeki, Kürdistan Tarihi, Ankara, 1992. s.163.



دوورگەی هەیبەلی) لە تەلارێکدا دەژیا و لێرە لەگەڵ هەندێك شاعیر و نووسەری تورکدا ناسیاوی پەیدا دەکا. لەم بارەیەوە، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ: ((یەکەمجار لە دوورگەدا، بوومە هاوسێی ئەکرەم بەگی رەجائیزادە و خالید زیای عوشاقیزادە و حوسێن رەحمی. رەزا تۆفیقیشیان پێ ناساندم. چوومە ناو بەهەشتی (سەروەتی فونوون)، ئێواران کە بە کەشتی لە ئەستەمبووڵەوە دەگەڕامەوە دوورگە، کە هێلانەی شادیم بوو لەسەر کەشتییەکەدا بەسەر دەریای مەڕمەڕەدا رێگەی دەبڕی (سەروەتی فونوون)م دەخوێندەوە. کاریگەریی ئەو شیعر و ئەدەبییاتە، لە سندباد پتر وای لێ کردم بە دەریای خەیاڵدا رابمێنم..)) لە لایەکی دیکەوە، پیرەمێرد لەو سەردەمەدا لە ئەستەمبووڵ بووە، نووسەری وەك ئەحمەد راسم و عەبدولحەق حامید تەرخان دەناسێ. یەك لەو شوێنانەی زوو زوو هامشۆی دەکرد، کتێبخانەی بایەزید بووە. لە لایەکی دیکەوە، پیرەمێرد لە بارەی (هەیبەلی ئەدا)وە شیعرێکی نووسیوە، لە بەشێکی ئەو شیعرەدا دەڵێ:

**İstanbul’da, Heybeliada’da sessizce**

**Sokuldum gençlerin yanına basamak ve taşlar üzerinden**

**Önce servi boylu, sarmaşik [gihi] bir çift**

**Ki yanaklarının parmaklığı suda ayı yansıtmıştı.**

**Gönüldaş olmuş, yanyana durmuşlardı**

**Tertemiz, çocuksu bir sevdayla…[٤٢]**

لەوانەی لە باشووری کوردستانەوە هاتوون، محەممەد ئەمین زەکیی یەك لە مێژوونووسە گرنگەکانی کورد. تۆفیق وهبیی زانا، رفعەتی مەولانزادەی رۆژنامەنووس و رەفیق حیلمی-ی

42- Malmisanij, Kürt Teavüm ve Terakki Cemiyeti ve Gazetesi, Stockholm, 1998. s.60-64.

* دەقەکە لە شیعری تورکی ناچێ، ئەگەر دەقی کوردییشی هەبێ من دەستم نەکەوت. (وەرگێڕ)

یەك لە رۆشنبیران و کەسایەتییەکی زۆری کورد خوێندنی بالاَیان لە ئەستەمبووڵ بینیوە و کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەو بیرە نەتەوەییە کوردییەی لێرە پەرەی سەندووە. دواتر کە گەڕاونەتەوە عیراق، بەشداریی کۆششی دامەزراندنی ئەو ژیانە رۆشنبیری و سیاسییەی ئەوێیان کردووە. محەممەد ئەمین زەکی (١٨٨٠-١٨٤٨) خوێندنی لە قوتابخانەی جەنگیی ئەستەمبووڵدا تەواو دەکا، هەر لە ئەستەمبووڵ دەست بەو لێکۆڵینەوانەی دەکا کە پێوەندیی بە مێژووی کوردەوە هەیە. لەم بابەتەدا لێکۆڵینەوەکانی لە گەلێك کتێبخانەی ئەستەمبووڵدا ئەنجام دەدا. بەلاَم ئاگرێك کەلە ئەستەمبووڵ بەرپا دەبێ سەرچاوەکانی، هەموو دەبنە خۆڵەکەوە.

تۆفیق وەهبی کە ساڵی ١٨٩١ لە دایکبووە، مەشقی سەربازی لە ئەستەمبووڵ دەبینێ. دواتر دەپەڕێتەوە عیراق و ماوەیەك لەوێ دەبێتە وەزیر. ساڵی ١٩٥٨ دەچێتە ئینگلتەرا و تامردن لەوێ دەمێنێ. زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی بلاَو دەکرێتەوە. لەگەڵ سی. جی. ئیدمۆندس، ساڵی ١٩٦٦، فەرهەنگێکی کوردی بە ناوی فەرهەنگی کوردی-ئینگلیزییەوە بلاَو دەکاتەوە، ئەمەیان یەکێکە لە کارەکانی.

رەفیقی مەولانزادەش یەکێکە لە سیماکانی ئەو کوردانەی سالاَنێکی دوورودرێژ لە ئەستەمبووڵدا ژیاوە، لە باشووری کوردستانەوە هاتووە. ئەم رۆشنبیرە کوردە، پتر وەکو رۆژنامەوانێك دەناسرێ، بە هۆی ئەوەوە کە رۆشنبیرێکی رەخنەگر و ئۆپۆزسیۆن بووە، چەند جارێك گیراوە و دوورخراوەتەوە. رەفعەتی مەولانزادە، سەرەتا رۆژنامەی سەربەستی و دواتر گەلێك رۆژنامە و گۆڤاری دەرکردووە، لەبەر ئەوەی سووکایەتیی بە ئەتاتورك کردووە، ئەتاتورك لە دادگادا شکات لە خودی خۆی دەکاو دەیداتە دادگا. رەفعەت-ی مەولانزادە، لە ریزەکانی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستاندا کە ساڵی ١٩١٨ دامەزراوە بەشدار دەبێ.

رەفیق حیلمی (١٨٩٨-١٩٦٠) یەکێکی دیکەیە لەو کوردانەی سالاَنی لاوێتیی لە ئەستەمبووڵ بەسەربردووە، دوای بەسەرچوونی سالاَنێکی درێژ، سەر لەم شارەی گەنجێتییەی دەداتەوە. پێکەوە لەگەڵ لیژنەیەکدا و لەسەر ویستی شێخ مەحموود ساڵی (١٩٢٢) دوای راگوزارییەکی دوورودرێژ بەسەر ئەستەمبووڵەوە کە دەچێتە ئەنقەرە، لە بارەی ئەو نەخشەیەوە کە گوایە ئازادی بە کورد دەدرێ سەر لە گەلێك کەس دەدا. لە رووی هەندێك پیلانی سیاسییەوە، ئەم لیژنەیە ناگاتە ئامانج. رەفیق حیلمی، کە دوای سالاَنێك لە سایەی ئەم



سەفەرەوە سەر لە ئەستەمبووڵی سەردەمی لاوێتیی دەدا، بەمجۆرە بە گەشت و بینین یەك بەیەکی ئەو ناوچانە دەبینێتەوە کە لە گەنجێتیدا پێیاندا رۆیشتووە: ((سەر لە بەیانی زوو فەرمانبەرێك و چوار ئەفسەری هێزە هاوپەیمانەکان بە کەشتییەکەدا سەرکەوتن، جانتاو پەساپۆرتەکانیان کۆنترۆڵ کردین. دوای ئەوە رێیان داین بچینە ئەستەمبووڵ. چووینە (سرکەجی)، لەوێ ویستمان بچینە ئوتێلی (مەسەررەت) بەلاَم لەبەر ئەوەی لەلایەن فەرەنسییەکانەوە گیرابوو چووینە ئوتێلی (عوسمانی). من چونکە رۆژانی خوێندنم لە ئەستەمبووڵدا بوو، لە ناو تاسەی بینینی جارێکی دیکەی ئەستەمبووڵدا بووم، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی تێیاندا ژیابووم. بۆ ئەمە داوای رێ پێ دانم لە فەتتاح کرد، بۆ ئەوەی وەکو خۆم دەمویست بە ئەستەمبووڵدا بگەڕێم و بۆ بینینی ئەو شوێنانەی پێشتر تێیاندا ژیابووم بەخۆ کەوتم. لە پێشەوە بە (سرکەجی)دا گەڕام، دوای ئەوە بە شوێنەکانی دیکەدا. بیرم لەوە دەکردەوە ئەوسا لە سەردەمی خوێندکاریمدا مرۆ چەند رۆژ لە سلێمانییەوە دەگەیشتە ئەستەمبووڵ. من ئەوسا کە بۆ خوێندن هاتبووم، نامەیەکم لە کەریم بەگەوە کە برای ئەحمەد ئاغای کەرکووکی بوو، بۆ مامۆستا نەجمەددین کەرکووکیی خاوەنی رۆژنامەی ژین هێنابوو. ئەو یەکەم کەس بوو چاوم پێ کەوت و لە سایەی ئەودا کوردێکی زۆری دیکە و خوێندکاری لاوی دیکەم ناسی. ئەوسا قوتابییە کوردەکان کەم نەبوون. نەجمەددین کەرکووکی لە قوتابخانەیەکی (سوڵتانی)دا مامۆستا بوو هەر لەو کاتەشدا قوتابیی کۆلیژی ماف (حوقووق) بوو. ئەو هەر لە پێناوی نەتەوەکەیدا تێدەکۆشا. لە بەئاگا هاتنەوەی لاواندا دەورێکی گەورەی دەبینی. هەر وەکو لەسەرەوەتردا باسم کرد، بۆ یادکردنەوەی سەردەمی قوتابێتیم، دوای (سرکەجی) بۆ چەمبەرلیتاش و گەدیك پاشا، بۆ وەزارەتی حەربییە (جەنگ)، بۆ فاتیح، بۆ ئەیا سۆفیا، بۆ بابی عالی، بۆ سوڵتان مەحموود و بەیۆغڵو و تەقسیم رۆیشتم. هەروەها سواری کەشتی بووم و چوومە کادی کوێی و یلدز..)) رەفیق حیلمی کە پتر درێژەی بە یادداشتەکانی دەدا، بەر لە جێهێشتنی ئەم شارەی گەنجێتییەی، بۆ دواجار دەچێتەوە گازینۆی بەغدا کە لە سرکەجی بووە و لێرەدا تاسەی دەشکێنێ، رەفیق حیلمی کە تەنیا یەك رۆژ لە ئەستەمبووڵ ژیاوە. بەم بۆنەیەوە ئەوە دەردەبڕی کە زۆر خەمبار بووە[٤٣].

43- Refik Hilmi, Anılar, İstanbul, 1995, s.140-141.

## ئەو ڕێکخراوە نەتەوەییانەی لە ئەستەمبووڵ دامەزراون

ساڵی (١٩٠٠-١٩٢٢) پتر لە دە کۆمەڵەی کورد لە ئەستەمبوولدا دامەزراوە، زۆربەی ئەم کۆمەڵانە وایان دەنواند ئامانجی ڕۆشنبیرییان هەیە. دامەزراندنی هەموو ئەم کۆمەڵانە یاسایی بووە، بەڵام یەك دوو ساڵیان پێ نەدەچوو، دادەخران. ئەو کۆمەڵانەی بە ئارەزووی خۆیان داخراون زۆر کەمن. ئەو ساڵانەی ژیانی پێکهێنانی کۆمەڵەکان برەوی پەیدا کردووە، بەتایبەتی لەو ساڵانەدا بووە کە فشاری تێدا نەبووە و هێزە تازە ئازادیخوازەکانی تێدا دەسەڵاتیان تێدا کەوتووەتە دەست، هەموو ئەم ڕێکخراوە کوردییانەی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دامەزراون، لە سەرچاوە فەرمی و نیمچە فەرمیی تورکیدا، هەر هەموو بە شێوەی ((ڕێکخراوەی پڕ مەترسی)) یان ((ڕێکخراوەی جیابوونەوەخواز)) باسیان لێوە کراوە. سەرۆکایەتیی ئەم ڕێکخراوانەی لێرە دامەزراون و ئەوانەی ئەرکی بەڕێوەبەرایەتیان بەجێ دەهێنا، هەموویان کەسایەتیی ئەوتۆن، ساڵانێکی دوورودرێژ لە ئەستەمبووڵ ژیاون. سەرەکیترینی ئەو ڕێکخراوانەی لایەنە بەبایەخەکانی پێکهاتنی بیری نەتەوەیی مۆدێرنی کوردیان پێکهێناوە (بە پێی ساڵانی دامەزراندنیان) ئەمانەن.

**جەمعییەتی عەزمی قەوی-** کۆمەڵەی ئیرادەی بەهێزی کوردستان، کە وەکو گوتراوە ساڵی (١٩٠٠) دامەزراوە، بە یەکەم کۆمەڵەی کورد دانراوە کە لە ئەستەمبووڵ دامەزرابێ، لەم ڕووەوە بایەخدارە، وەکو زانراوە دامەزرێنەری کۆمەڵەی عەزمی قەویی کوردستان، فیکری ئەفەندیی دیاربەکرییە، لەسەر بەرگی کتێبێکدا لە بارەی بەدرخانییانەوە لە ئەستەمبووڵ بڵاوکراوەتەوە، ڕوونکردنەوەی ((داهاتی بۆ کۆمەڵەی عەزمی قەویی کوردستانە))[٤٤]. یەکێك لە ئەندامە چالاکەکانی ئەم یانەیە (ئەحمەد ڕامزی لیجەی)یە. ئەحمەد ڕامز کە ساڵی (١٩٠٤) بۆ میسر دوور خراوەتەوە، یەکێکە لەوانەی بایەخی بە کاریگەریی بڵاوکراوە و پەروەردە داوە. بە پێی قسەی زنار سلۆپی، بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەی مەشرووتییەتەی ساڵی (١٩١٠) لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە و منداڵانی کوردی تێدا خوێندووە، ئەحمەد ڕامزی کوردیزادەیە، ئامادەکردنی هەندێك کتێبی لە بارەی زمان و پەروەردەوە، ئەوە دەردەخا کە پەروەردەکارێکی چاك بووە. ئەحمەد ڕامز کە هەر ئەو ساڵە، دامەزرێنەری کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانستی

44- Celîlî, Celîl Jîyana Rewşenbirî û Sîyasî ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.196.



(مەعارف)ـە، ساڵی (١٩٠٩) کتێبی (دیوانی حەربی عورفی)ی سەعید نوورسی بڵاوکراوەتەوە، پێشەکییەکی ئاگرین بۆ چاپی دووەمی دەنووسێ و ئەوەی ئەم کەسایەتییە کوردە بۆ یەکەم جار بە خوێنەران دەناسێنێ ئەحمەد ڕامز لیجەیی-یە.

**کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققیی کورد:** بە کاریگەریی ئەو ناوەندە ئازادییەی مەشرووتییەتی دووەم دەیهێنێتە کایەوە، بیری نەتەوەیی کوردی بە جووڵە خستووە، ساڵی (١٩٠٨) ئەم ڕێکخراوەی لە ئەستەمبوولدا دایدەمەزرێنێ، یەکێکە لەو ڕێکخراوە هەرە گرنگانەی لە سەرەتای سەدەماندا (سەدەی بیستەم) دامەزراوە. دامەزرێنەری کۆمەڵەکە سەید عەبدولقادرە. بە پێی بەندی سەرباری ژمارە (٧)ی پەیڕەوی کۆمەڵەکە، سەید عەبدولقادر، بە درێژایی تەمەنی هەر سەرۆکایەتیی کۆمەڵە دەکا. بۆ دووەم جار موشیر ئەحمەد پاشا دەکرێتە سەرۆك[٤٥]. لە نێو دامەزرێنەرانی دیکەی کۆمەڵەدا کەسایەتیی وەکو ئەمین عالی بەدرخان، شەریف پاشا، خەلیل خەیالی و ئەحمەد ڕامزیان تێدایە، بابەتێکی سەرنجڕاکێش، بە پێی ڕاگەیاندنی بەندی چوارەم، کۆمەڵە لە پانزدە کەس پێکهاتووە، دەستەی دامەزرێنەری لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا لە ئەنجامی کۆبوونەوەیەکی گشتیدا لە لایەن دەستەیەکەوە بە دەنگدانی نهێنی هەڵبژێرراون ئەم کۆبوونەوە گشتییە بۆچی لە شوێنێکی دیکەدا نەکراوە و لە مزگەوتی ئەیاسۆفیادا گیراوە، هۆی ئەمە نازانین. بەپێی قسەی قەدری جەمیل پاشا جێی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی لە گەڕەکی گەدك پاشادا بووە. ڕوونکردنەوەیەك کە لە لاپەڕەیەکی ئەو ڕۆژنامەیەدا کە کۆمەڵەکە ساڵی (١٩٠٨) بڵاوی کردووەتەوە، ئەوە پیشان دەدا کە بارەگای بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکە لە (وەزنەجیلەر)دا بووە[٤٦].جەلیلی جەلیلیش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققیی کورد لە وەزنەجیلەردا کۆمەڵەیەکی

45- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye'de Siyasal Partiler I, S.409-413.

46- Kürt Teavün ve Terakki Gazetesi, Kürçe- Türkçe Dergi 1908-1909. Arap Harflarinden Latin harflerine çeviren: Mehmed Emin Bozarslan, Uppsala, 1998.

- Malmisanij, Kürt Teavün ve Terakki Cemiyeti ve Gazetesi, Stockholm, 1988.

کردووەتەوە و نزیکەی (٥٠٠) کەسی لێ کۆبووەتەوە[٤٧].ئەم کۆمەڵەیە بووەتە بارەگای گشتیی کۆمەڵە، یان نەبووە، ئەمە نازانین. لەوانەیە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە بۆ یەکەمجار لە گەڕەکی (گەدك پاشا)دا دەستیپێکردبێ. لێرە دامەزراندنی جاڕدراوە، بەڵام دواتر کۆششەکانی لەو بارەگایەیدا درێژە پێ داوە کە لە وەزنەجیلەردا بووە. گەڕەکی گەدك پاشای ئەستەمبووڵ بە پێی سەرچاوەکان ناوچەیەك بووە بە چڕی کوردی لێ بووە. جەمال کوتای کە بە هەندێك لێکۆڵینەوەی مێژوویی ناسراوە، ئاماژە بۆ بوونی خانێك دەکا، ناوی (خانی عەشیرەت) بووە و لە گەدك پاشادا کوردەکان چوونەتە ئەو خانە. ئەم کۆمەڵەیەی لە ئەستەمبووڵ و ناوەندەکانی دیکەی کوردستاندا لقی لێ کراوەتەوە، بۆ نموونە لەو لقەیدا کە لە بتلیس کراوەتەوە، هەزاران ئەندامی هەبووە[٤٨]. کۆمەڵە،ساڵی (١٩٠٩) دادەخرێ. ئەو رێکخراوەی لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە و لە کوردستاندا کەوتووەتە چالاکی، کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققیی کورد بووە.

**کۆمەڵەی نەشری مەعارفی کورد:** کە ساڵی (١٩١٠) دامەزراوە، بە پێی بەندی سێیەمی پەیڕەوی ناوخۆ، بۆ منداڵانی کورد لە ئەستەمبووڵ کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی بە ئامانج دەگرێ. بە پێی زانیاریی دیکە لە سەرچاوەکانی دیکەدا هەیە، ئەم قوتابخانەیە ساڵی (١٩١٠) لە چەمبەرلی تاشدا، لە قوتابخانەیەکدا بە ناوی قوتابخانەی مەشرووتییەتدا دەستی بە کاری پەروەردە کردووە[٤٩]. بە پێی هەندێك سەرچاوەش قوتابخانەی مەشرووتییەت، لە شوێنێکی کۆڵانی (خۆجا پاشا)دا دەکرێتەوە کە لە (سرکەجی) دایە. لە بارەی شوێنی ئەم قوتابخانەیەوە مووسا عەنتەر لە بیرەوەرییەکانیدا تێبینییەکی وای بە بیردا دێت کە دەڵێ: ((لەو بینا زەردەی کە وەقفی گۆڕی سوڵتان مەحموود بووە، قوتابخانەیەکی کوردی کرایەوە))[٥٠]. تارق زەفەر توینایای بڵاوکەرەوەی پەیڕەوی کۆمەڵە، لە نێو ئەندامە دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەدا ئەم کەسایەتییانە دەستنیشان دەکا: ئەمین عالی بەگی بەدرخانزادە، دوکتۆر عەبدوڵڵا بەگ جەودەت، مدحەت بەگی بەدرخانزادە، سەیفوڵڵا بەگی (نوێنەر-مەبعووس)ی ئەرزەڕۆم، یەحیا ئەفەندیی نوێنەری حەکاری، تۆفیق بەگی نوێنەری وان، کامیل بەگی بەدرخانزادە، عەبدوڕڕەحمان بەگی بەدرخانزادە، محەممەد ئەفەندیی نوێنەری (گەنج)، حوسێن عەونی بەگی میر سەیفەددینزادە، مەحموود بەگی میراڵای، محەممەد فایق ئەفەندی، سەعید ئەفەندیی بەدیعوززەمان، خەلیل خەیالی ئەفەندیی موتکی، ئەحمەد رامزی کوردیزادە[٥١]. لە بارەی ئەوەوە کە بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەی مەشرووتییەتە کە پێشتر باسمان لێوە کرد کێ بووە، لە هەندێك سەرچاوەدا ئەحمەد رامزی کوردیزادە، لە هەندێکی دیکەدا عەبدوڕڕەحمان بەدرخان بووە[٥٢]. لە یەکەم دەستەدا نزیکەی سی قوتابی وەرگیراوە.

**کۆمەڵەی ئەوانەی کوردستانیان خۆشدەوێ:** ئەم کۆمەڵەیە ساڵی (١٩١٢) لەلایەن مەلا خدرەوە دامەزراوە، وەکو نووری دەرسیمی دەڵێ: ((هەموو ئەو کوردانەی لە ئەستەمبووڵ بوون بەشدارییان تێدا کردووە))[٥٣]. سکرتێری گشتیی ئەم کۆمەڵەیە نووری دەرسیمی بووە کە ئەو کوردانەی لە ئەمەریکا بوون پشتگیرییان دەکرد. رەزا تۆفیقیش کە بە خۆی تورك بووە، بووەتە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە[٥٤]. نووری دەرسیمی کە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ئەو بیرە نەتەوەییە کوردییەدا هەبووە کە لە سەرەتای سەردەمماندا (سەدەی بیستەم) لە ئەستەمبووڵ سەری هەڵدابوو. ئەو لە ئەستەمبووڵدا بەیتاڵیی دەخوێند. لە ساڵانی خوێندندا بەتایبەتی لە نێو کوردەکانی دەرسیمدا بۆ بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی چالاکییەکی چاك دەنوێنێ. نووری دەرسیمی، ئەوە باس دەکا کە بۆ ئەو دەرسیمییانەی لە قاوەخانەی عەلی پاشای ئەرزنجانیی ناوچەی (ئونکاپانی)ی ئەستەمبووڵدا بە سەدان کۆدەبوونەوە، سازی لێدەدا و دەستەی مۆسیقایی بۆ پێکدەهێنان. یەك لەو کوردانەی نووری دەرسیمی زوو زوو سەردانی دەکرد و پێوەندیی لەگەڵدا بووە، دوکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت و ئەوی دیکە دوکتۆر محەممەد شوکری سەگبان بووە. نووری دەرسیمی وەك دەڵێ: لە خانەی ئیجتیهاد (ئیجتیهاد ئێڤی)دا سەردانی عەبدوڵڵا جەودەتی کردووە و شوکری سەگبانیش پێی راسپاردووە لە بارەی کوردایەتییەوە پروپاگەندە بکەن[٥٥].

47- Celîlê Celîl, Jîyana Rewşenbirî û Sîyasî ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.80.
48- age, s. 83.
49- Mehmet Bayrak, Kürtler ve Ulusal Demokratik Mücadeleleri, Ankara, 1993, s.85.
50- Musa Anter, Hatıralarım, 2. basım, s.57.

51- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye'de Siyasal Partiler II, s.186, bu konuda başka bir kaynak: İsmail Göldaş, Kürdistan Teali Cemiyeti, İstanbul, 1991.
52- Celîlî Celîl, Jîyana Rewşenbirî û Sîyasî ya Kurdan, Stockholm, 1985, s.88.
53- Nuri Dersimi; Hatıratım, Ankara, 1992, s.34.
54- age., s.34.
55- age., s.42.

**کۆمەڵەی هێڤیی قوتابییانی کورد**، ئەم کۆمەڵەیەی ساڵی ١٩١٢ دامەزراوە، لە هەندێك سەرچاوەدا تەنیا بە هێڤی ناوبراوە، ئەم وشەیە واتەی (هیوا) دەگەیەنێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەدان قوتابیی کورد لە ئەستەمبوولّ لە دامەزراوەکانی جیاجیای خوێندنی باڵادا دەیانخوێند. بە گوێرەی قسەی ئەکرەمی جەمیل پاشا، ئەو قوتابییە کوردانەی لە ئەستەمبوولّیان دەخوێند (٢٠٠) دوو سەد قوتابی بوون، هەر وەکو نووری دەرسیمیش دەڵێ: نزیکەی (١٥٠) سەد و پەنجا کەس بوونە. ساڵی (١٩١٢) لە کۆبوونەوەیەکدا کە ڕێکخراوەکە لە ناوچەی (شێخزادە)دا ئامادەی کردووە، وەك دەرکەوتووە سەدان کەسی تێدا بەشدار بووە: ((ئەوسا لە قوتابی و ئەفسەری (ئالایلی)[*٤] و قوتابییانی پزیشکی، پێنج سەد کەس چووبوونە ناو ریزەکانی ئەم کۆمەڵەیەوە)). ساڵی (١٩١٩) لە هەوڵێکدا کە لە گۆڤارەکە بڵاوکراوەتەوە ناوی (کوردستان) بووە. سەرەداوێکمان لە بارەی ساڵی دامەزراندنی کۆمەڵەکەوە بە دەستەوەی دەدا: ((حەوت ساڵ لەمەوبەر دەستەیەك لاوی کورد (کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کورد)یان پێکهێناوە))[٥٦]. تارق زەفەر تونای کەم پشت بەم زانیارییانە دەبەستێ، بۆ ئەوە دەچێ کۆمەڵەکە ساڵی (١٩١٢) دامەزرابێت، هەندێك لێکۆڵەرەوە بە بەرچاوەوە گرتنی مێژووی دەرچوونی یەکەم ژمارەی (ڕۆژی کورد)ی ئۆرگانی بڵاوکراوەی کۆمەڵە، وای بۆ دەچن، ساڵی (١٩١٣) دامەزراوە. کۆمەڵە دوو ئۆرگانی بڵاوکراوەی بە ناوی (ڕۆژی کورد) و (هەتاوی کورد)ەوە دەرکردووە. عومەر بەگی جەمیل پاشازادە دەکرێتە یەکەم سەرۆکی کۆمەڵەی قوتابییانی کورد، لە دەرەوەی وڵاتدا، لە هەندێك شاری وەکو جنێڤ و لۆزان و میوونیخ، لق دەکاتەوە[٥٧]. بەندی دووەمی پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کورد بەم جۆرە ریزبەندی کراوە:

أ) بە یەك ناساندنی قوتابییانی کورد، دابینکردنی پەیوەندی لە نێوانیاندا و برایەتی و پێکەوەبوون زامن بکا.

[*٤] ئەفسەری (ئالایلی): ئەو ئەفسەرانەی قوتابخانەی سەربازییان نەخوێندووە و بە ڕێگەی دیکە کراونەتە ئەفسەر. (وەرگێڕ).

56- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye’de Siyasal Partiler I, s.406.
57- Ekrem Cemil Paşa, Muhtasar Hayatım, Brüksel, 1989, s.23.



ب) هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی زمان و ئەدەبییاتی کورد و پێکهێنانیان لە شێوەی کتێبدا.

ج) ڕێنمایی ئەو قوتابییە کوردانەی دێنە پایتەخت (ئەستەمبوولّ) لە دامەزرانیان لە قوتابخانەکاندا.

د) پێخوێندنی ئەو قوتابییانەی داراییان باش نییە لە قوتابخانەی گونجاودا.

هـ) بە کورتی هەوڵدان بۆ بەرەو پێشەوەچوون و پێکهاتنی زانستی و کۆمەڵایەتیی کورد.

ئەم کۆمەڵەیەی لە ئەستەمبوولّ لە لایەن قوتابییە کوردەکانەوە دامەزراوە، لە سەرچاوەکاندا بە یەکەم کۆمەڵەی قوتابییانی کورد تۆمار کراوە. ئەم کۆمەڵەیەی بە هۆی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە چالاکییەکانی راگرتووە، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دەبینین دیسانەوە دەستی بە گەیاندنی دەنگی خۆی کردووە. ساڵی (١٩١٩) بە بۆنەی هەشتەمین ساڵیادییەوە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی کراوە و لەم کۆبوونەوەیەدا تۆفیق حەمید بەگی دیاربەکری گوتارێکی پێشکەش کردووە. لەم گوتارەی ئەم بەرێزەدا کە لە قوتابخانەی کشتوکاڵیی ناوچەی (حەلقەلی)دا پێشکەشی کردووە، دەردەکەوێ سێ چوار قوتابی بناغەی کۆمەڵەی قوتابییانی کوردیان پێکهێناوە. لە کتێبی (هینکەرێ زمانی کوردی- رابەری زمان بۆ ئەوانەی دەیانەوێ کوردی فێربن)دا کە ساڵی (١٩٢١) کۆمەڵە بڵاوی کردووەتەوە، تێدەگەین کە کاریگەریی کۆمەڵە تا ئەو ساڵە درێژەی هەبووە[٥٨]. کۆمەڵەی هێڤیی قوتابییانی کورد، بۆ یەکەم جار لە خانی ئەرزەرۆم دەکرێتەوە کە بەرامبەر پۆستەخانەی نوێی سرکەجیدا بووە، بیناکردنی ئەو ساختمانەی لە سەروبەندی دامەزرانی کۆمەڵەدا تەواو بووە. واتە ساڵی (١٩١٢)، ئەمڕۆ هێشتا لە جێی خۆیدایە، دواتر لەبەر تەنگیی جێگا، دەگوێزرێتەوە شوێنێکی بەرامبەر ئوتێلی مەسەررەتی هەورازەکەی لای بابی عالی[٥٩]. لە ناوچەی شەهزادەدا کۆمەڵەی هێڤیی

[٥٨] کۆمەڵەی هێڤیی قوتابییانی کورد، ساڵی (١٩٢١) کتێبێك بە ناوی (هینکەرێ زمانێ کوردی — ڕێزمانی کوردی)یەوە بڵاودەکاتەوە و لەم کتێبەدا ئەوە ڕاگەیەنراوە کە کۆمەڵە ڕابوردوویەکی (٩) نۆ ساڵەی هەیە. بڕوانە:

Malmisanij, Kürt Milliyetçiligi ve Abdullah cevdet, s.57.
59- Nuri Dersimi, Hatıratım, s.32.

قوتابییانی کورد و لە قوتابخانەی کشتوکاڵەوە[٦١]. دامەزران و کارکردنی، یانیش کۆبوونەوە، لە سەرچاوەکاندا باسیان لێوەکراوە.

**کۆمەڵەی کوردستان تەشریعی مەساعی** (کۆمەڵەی کارە یاساییەکانی کوردستان)، لە هەندێك سەرچاوەدا کۆمەڵەیەك بە ناوی کۆمەڵەی کارە یاساییەکانی کوردستانەوە، ساڵی (١٩١٢) لە ئەستەمبوڵ دامەزراوە و ئەرکی سکرتێری کۆمەڵەکە خرایە ئەستۆی عەبدوڵڵا سەعدی پالۆ، لە نووسینێکدا لە لایەن عەبدوڵڵا سەعدییەوە بۆ کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کورد نووسراوە، پێشنیاری یەکگرتنەوەی هەردوو ڕێکخراوەکە دەکا، لە کۆتاییدا هەردوو کۆمەڵەکە یەك دەگرنەوە و بەناوی کۆمەڵەی ئیرشاد و ئیرتیقا (کۆمەڵەی ڕێنمایی و پێشکەوتن)ەوە کۆمەڵەیەکی نوێ دادەمەزرێ. کە سەیری بەندی ئامانج دەکەین لە پەیڕەو و پرۆگرامی هەرسێ کۆمەڵەکەدا، هەندێك لایەنی هاوبەشیانمان بۆ دەردەکەوێ. بۆ نموونە، کۆمەڵەکان بەناچاری نەبێ خۆیان بەکاری سیاسییەوە خەریك ناکەن[٦٢]. دەکرێ وای دابنێین کە لەو دەمانەدا هەندێك دژواریی قانوونی ڕێ لەم جۆرە یەکگرتنەوەیە بگرێ. بەهۆی ئەو سەرەو ژێر بوونە جەنگی یەکەمی جیهانی خولقاندوویەتی و لە ئەنجامدا گەلێك کوردی چالاك لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیی سیاسیی کورددا، لەم ساڵانەدا تووشی دابڕان کردووە. کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کوردیش وەك لە سەرەوە باسمان لێوەکرد، لەم ساڵانەدا چالاکییەکانی خۆی ڕاگرتووە.

**کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان):** ناوەناوە لە سەرچاوەکاندا ئەم کۆمەڵەیەی ساڵی (١٩١٨) دامەزراوە، بە ((کۆمەڵەی کورد)) ناسراوە. هەندێك لە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە سەید عبدولقادر سەرۆکایەتیی دەکرد، ئەمانەن: شوکری بابان، حیکمەت بەگی بابانزادە، عەزیز بەگ، شوکری سەگبان[٦٣]. ڕێکخراوەکە ئۆرگانێکی بڵاوکراوەی نافەرمیی بە ناوی (ژین)ەوە هەبووە: دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دەنگی خۆی ڕاگەیاندووە و کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان کە یەکێك بووە لە گرنگترینی کۆمەڵە کوردییەکان، لە کۆبوونەوەکانی ئاشتیی (سیڤەر)دا بۆ گەیاندنی ویست و خواستەکانی کورد بە کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکان هەوڵێکی گەورە و زۆری داوە، باس لەوە کراوە کە کۆمەڵەی تەعالیی

61- Kadri Cemil Paşa, Doza Kürdistan, s.34.
62- Mehmet Bayrak, Kürtler ve Ulusal Demokratik Hareketleri, Ankara, 1993, s.85.
63- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye'de Siyasal Partiler, s.186.



کوردستان لە ئەستەمبووڵ پانزدە هەزار ئەندامی هەبووە[٦٤]. لە بابەت ڕێکخراوە کوردییەکانی ئەستەمبووڵەوە تارق زەفەر تونایا یەکەم زانیاریی بە درێژی بە خوێندەواران ڕاگەیاندووە، لە لێکۆڵینەوە فراوانەکەیدا کە بەناوی (پارتییە سیاسییەکانی تورکیا)یە، بەڵگەنامەیەك بە ناوی پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەی کوردستان (کردستان جمعیتی نظامنامەسی) بڵاو دەکاتەوە. بەمجۆرە ئەوەمان بۆ دەردەخاتەوە کە لەم ساڵانەدا بە ناوی (کۆمەڵەی کوردستان)ـەوە کۆمەڵەیەکی دیکە لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە. تاریق زەفەر تونایا. باشی بۆ دەچێ و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە لە نێوان پەیڕەو و پرۆگرامی ئەم کۆمەڵەیە و پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستاندا هەندێك وردە جیاوازی هەن. لە هەندێك سەرچاوەی کوردیدا، بە هەڵە واپیشان دراوە کە ئەم دوو کۆمەڵەیە هەر یەك کۆمەڵە بن. کۆمەڵەی کوردستان لە خانووی بەهجەت پاشادا بووە لە کۆڵانی پشت دیوانی موحاسەبات (دیوانی ژمێریارییەکان)[٦٥] ، لە هەندێك سەرچاوەدا دیوانی موحاسەبات بە دیوانی ڕاوێژکاری پیشان دراوە[٦٦]، لە کاتێکدا کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان،بە پێی قسەی تارق زەفەر تونایا، لە شوێنێکی لای خانووی ئیجتیهادی د.عەبدوڵڵا جەودەتدا کارەکانی بەڕێوەبردووە. لە کاتێکدا ئەم بینایەی ناوی خانووی ئیجتیهاد بووە، لە ژمارە (٤٢)ی کۆڵانی (چەتاڵچەشمە)ی ئێستای ناوچەی (چەغالۆغلو)دا بووە و ئەم شوێنە مێژووییە تا ئێستا هەر وەك خۆی ماوەتەوە و نەڕووخاوە. لەبەر ئەوە یەکەم بارەگای کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان لە لای ڕاستی خانووی (ئیجتیهاد)ی د.عەبدوڵڵا جەودەت، یان لە لای چەپی بینایەکەدا بووە و[٦٧] کۆمەڵەی کوردستان کە پێشتر باسمان لێوە کرد، کارەکانی خۆی لە شوێنێکی دیکەدا ئەنجام دەدا. جەواد دورسونیش لە بیرەوەرییەکانیدا ئەوە باس دەکا کە لەگەڵ سولەیمان نەزیفدا پێکەوە لە هەندێك چاوپێکەوتنندا ئامادەبوون و چوونەتە کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان کە لە ((بارەگای نزیك خانووی

64- Ahmed Mesut, İngiliz Belgelerinde Kürdistan (1918-1958), İstanbul, 1992, s.103.

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا ئەم ژمارەیە بە (١٠) دە هەزار دانراوە، بڕوانە:

Martin van Bruinessen, Ağa, şeyh ve Devlet, Ankara, s.346.
65- İsmail Göldaş, Kürdistan Teali Cemiyeti, s.13.
66- M. Emin Bozarslan'ın Jîn dergisinin yeni basımı için yazdığı sunuş yazısı, s.22.
67- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye'de Siyasal Partiler II, s.185.

ئیجتیهاد))دا بووە. کەوابێ کۆمەڵەی کوردستان و کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، بەلای کەمەوە لەسەر کاغەز دوو کۆمەڵەی جیاواز بووە، چونکە تارق زەفەر تونایای بڵاوکەرەوەی پەیڕەوی ناوخۆی هەردوو کۆمەڵەکە ئاماژە بۆ ئەو جیاوازییە گچکانەی نێوان هەردوو پەیڕەوەکە دەکا. ئەم دوو کۆمەڵەیە، یەك کۆمەڵەش بن، شوێن و پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، ناوەناوە هەندێك گۆڕانکارییان پێوە دیار دەبێ.

**کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد (کۆمەڵەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی کورد):** دوای دووکەرت بوونی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، لە لایەن بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵەکەوە (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد) دامەزراوە، هەندێك لە ئەندامانی ئەمانەن: ئەمین عالی بەدرخان، شوکری بابان، فوئاد بابان، حیکمەت بابان، د.عەبدوڵڵا جەودەت، د.شوکری سەگبان، کەمال فەیزی بەگی بتلیسی، ئەکرەمی جەمیل پاشا، نەجمەددین حوسێن بەگی کەرکوکی، رفعەت بەگی مەولانزادە، مەمدووح سەلیم بەگ[٦٨]. ئەم کۆمەڵەیەی لە لایەن هەندێك کوردەوە، کە لە کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە داپچڕابوون، دامەزراوە. سەرۆکایەتیی کۆمەڵەیان داوەتە ئەمین عالی بەدرخان، بەجۆرە دوای ئەم داپچڕانانە کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان هەر هەمووی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەید عەبدولقادر و برادەرانی.

**تیپی میللیی کورد (کورد میللت فرقەسی):** هەندێك لەو ئەندامانەی لە (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد)ەوە داپچڕان، ئەمجارەیان بە ناوی (تیپی میللیی کورد)ەوە، حزبێکی دیکە دادەمەزرێنن، ئەوانەی ئەندامانی ریزی پێشەوە بوون ئەمانەن: نەجمەددین حوسێن، مەمدووح سلیم، کەمال فەوزی، عەزیز بابانزادە[٦٩]. کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان و کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد و تیپی میللیی کورد، لە ژێر دەواری خۆیبووندا یەکیان گرتەوە کە ساڵی (١٩٢٧) لە لوبنان دامەزرابوو و تێکەڵی ئەم ڕێکخراوە بوون کە بەم ناوەوە ناسرا.

**کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد:** ئەم کۆمەڵەیەی ساڵی (١٩١٩) دامەزراوە، یەکەم کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردە کە زانرابێ. ئەم کۆمەڵەیەی زنجیرەیەك چالاکیی ئەنجام داوە، ئەمینە

68- Kadri Cemil Paşa, Doza Kurdistan, Ankara, 1991, s.61.
69- age., s.62.



خانمی هاوسەری شەریف پاشا بۆ سەرۆکایەتیی کۆمەڵە بە پاڵێوراو دەستنیشان کراوە. بە پێی پەیڕەوی ناوخۆی ئەم کۆمەڵەیەی لە چاپخانەی جیهانی ئافرەت (Kadın Dünyası)دا لە چاپ دراوە، نەك تەنیا ئافرەتانی کورد، ئافرەتانی نەتەوەکانی دیکەش بۆیان هەبووە ببنە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە[٧٠]. بەشی سێیەمی ئەم کتێبە زانیاریی دیکەی لە بارەی کۆمەڵەی ئافرەتانی تەعالیی کوردەوە تێدایە.

**کۆمەڵەی تەعمیمی مەعارف و نەشرییات (کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانست و بڵاوکردنەوە):** یەك لە گرنگترین چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە کە ساڵی (١٩١٩) دامەزراوە، چاپکردنی داستانی مەم و زینی شاکاری ئەحمەدی خانییە، کە بۆ یەکەمجار، لە شێوەی کتێبدا لە ئەستەمبووڵ بڵاوکراوەتەوە. ئەم شاکارە، کە بە پێشەکیی حەمزەی میکس بۆ یەکەمجار لە شێوەی کتێبدا دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەران. ئەمە لەو ساڵانەدا، لە ناو کوردەکاندا بە ڕووداوێکی گەورەی ڕۆشنبیری دادەنرێ. ئەم چاپی یەکەمەی مەم و زینە، لەبەر گرنگیی مێژوویی، لە سەرچاوەکاندا بە (چاپی ئەستەمبوڵ) ناو دەبرێ. پرۆگرامی کۆمەڵە، کە لە (٢٠) بیست بەند پێکهاتووە، لە گۆڤاری (ژین)دا بڵاودەکرێتەوە[٧١]، لە بارەی دامەزرێنەر، یان دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانست و بڵاوکردنەوەوە، زانیاریمان، تا دوارادە سنووردار و کەمە، مرۆ تێدەگا، ئەم کۆمەڵەیە ڕێکخراوێکی ئامانج ڕۆشنبیریی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانە کە ساڵی (١٩١٨) دامەزراوە.

## بڵاوکراوە کوردییە وەرزانەکان

جگە لە کوردستان-ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی کە ساڵی (١٨٩٨) لە قاهیرە دەرچووە، ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەی بە کوردی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بڵاوبووەتەوە، هەر هەمووی لە ئەستەمبووڵ دەستیان بە دەرچوون کردووە. تەواوی ئەم بڵاوکراوانە، بە دوو زمانی (کوردی و عوسمانی) دەردەچوون. ئەم بڵاوکراوانە وەکو کاریان لە پەرەسەندنی ژیانی سیاسی کردووە، ئەوەندەش کاریگەرییان بەسەر پەرەسەندنی ژیانی ڕۆشنبیریشەوە هەبووە، لە لایەکی دیکەوە، بواری بەهێزبوونی پەخشانی کوردیی دابین کردووە. لە ڕێی ئەم بڵاوکراوە وەرزییانەوە، دواتر..

(٧٠) بۆ زانیاریی فراوانتر سەیری بەشی چوارەمی ئەم کتێبە بکەن.
71- Kürd Tamim-i Maarif Cemiyeti Bildirisi, Jîn, no 10.

لەناو ئەو رۆشنبیرە كوردانەوە كە بەرهەم و نووسینەكانیان بڵاودەكرایەوە، هەندێك قەڵەمی بە بڕشت پێدەگا. بناغە تیۆرییەكانی نەتەوایەتیی كورد، بەتایبەتیش ئەو نووسینانەی لە بارەی مێژووی كورد و زمانی كوردییەوە بڵاودەكرایەوە، هێزێكی تیژڕەویی بە بڵاوبوونەوەی هەست و بیروباوەڕی نەتەوایەتیی بەناو خەڵكدا دەدا. ئەم بڵاوكراوانە، وەكو جێی دەنگی میللەتێكیان گرتبێتەوە وایان لێهات كە، لە ئەستەمبوڵیش و لە كوردستانیشدا دەژیان. چاپكراوی كوردی دەستی بەوە كرد كە وەكو هێزێك، كاریگەریی خۆی بنوێنێ. بەڵگەیەك كە ساڵی (١٩٢٠) نووسراوە و كەمال فەوزی لە ژێرەوەیدا، بە ناوی چاپەمەنیی كوردەوە، واژۆی كردووە[٧٢]، دەبینین تێزێكی بە ناوی بڵاوكراوەی كوردییەوە كە لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا پەرەی سەندووە، ئامادەكردووە، هەندێك گۆڤار و رۆژنامەی كە لەم ساڵانەدا لە ئەستەمبوڵ دەرچووە، وەكو بابەت بۆ لێكۆڵینەوەكەی هەڵبژاردووە[٧٣]. *محەممەد* ئەمین بۆز ئەرسلان لە بارەی بڵاوكراوەی وەرزانەی وەكو ئەو (ژین)ەی (١٩١٨-١٩١٩) لە ئەستەمبوڵ دەرچووە و رۆژنامەی تەعاون و تەرەققیی كورد (١٩٠٨) كاری كردووە و كۆی تەواوی هەریەكەی ئەمانەی سەر لە نوێ ئامادەی چاپ كردووە و ناویەتییە بەر خزمەتی خوێنەران[٧٤]. سەر لە نوێ - لەگەڵ هەندێك تێبینیی روونكەرەوە- لە چاپدانی ئەم بڵاوكراوە

---

72- Ahmed Mesut, İngiliz Belgelerinde Kürdistan (1918-1958), İstanbul, 1992, s.131.

73- Janet Klein, Claiming the Nation: The Origins and Nature of Kurdish nationalist Discourse-A study of the Kurdish press in the ottoman Empire, June, 1996. A Thesis presented to the Faculty of princeton University in Candidacy for Degree of Master of Arts.

جانێت كلێین: لەم تێزەیدا، لەم گۆڤار و رۆژنامە كوردییانەی كە لە سەردەمی عوسمانیدا دەرچوون كۆڵیوەتەوە: كوردستان (١٨٩٨-١٩٠٢)، رۆژی كورد (١٩١٣)، هەتاوی كورد (١٩١٣-١٩١٤)، ژین (١٩١٨-١٩١٩) و كوردستان (١٩١٩). جگە لە كوردستانی (١٨٩٨-١٩٢٠)، بڵاوكراوەكانی دیكە هەر هەموو لە ئەستەمبوڵ دەرچوون. وەك زانراویشە، كوردستان لە پێشدا لە قاهیرە و دواتر لە شارە جیاجیاكانی ئەوروپا بڵاوكراوەتەوە.

74- Kürt Teavün ve Terakki Gazetesi, Kürdçe-Tûrkçe dergi (1908-1909). Arap Harflerinden latin harflerine çeviren: Mehmed Emin Bozarslan, Uppsala, 1998.



وەرزییانە، بەتایبەتی لە دیدی خستنەبەر رووناكیی هەندێك لایەنی نەزانراوی مێژووی كوردەوە بایەخێكی گەورە بەخۆوە دەگرێ.

لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا لە بارەی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەوە كە لە ئەستەمبوڵ بە كوردی دەرچوون. لە خوارەوە هەندێك تێبینیی كورتی روونكەرەوە، جێیان بۆ كراوەتەوە. جگە لەم ئۆرگانانەی كە ساڵانی دەرچوونیان بەبەرچاوەوە گیراوە، هەندێك بڵاوكراوەی دیكەش كە لە ئەستەمبوڵ دەرچووە، لە سەرچاوە جیاجیاكاندا باسیان لێوە كراوە، لەم بابەتەدا، دیارە پێویستە لێكۆڵینەوەی پتریان لە بارەوە بكرێ. ریزبەندیی بە پێی دەرچوونی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی بە كوردی لە ئەستەمبوڵ دەرچوون بەمجۆرەیە:

**رۆژنامەی تەعاون و تەرەققیی كورد:** ئەم رۆژنامەیەی ئۆرگانی ئەو كۆمەڵە كوردییەیە كە هەر بەو ناوەوە دامەزراوە. ساڵی (١٩٠٨) بڵاوكراوەتەوە. وەكو یەكەم ئۆرگانی بڵاوكراوەی كوردیی وەرزانەی زانراوە كە لە ئەستەمبوڵ بڵاوكرابێتەوە، خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرسی ئەو، تۆفیقی خەڵكی سلێمانییە كە لە ناو خەڵكدا پتر بە پیرەمێرد ناسراوە (١٨٦٧-١٩٥٠). بە خۆی وەك شاعیرێكی كوردی خۆشەویست دانراوە، سەر نووسەری رۆژنامەكە ئەحمەد جەمیلی دیاربەكرییە (١٨٧٢-١٩٤١) كە باوكی ئۆرهان ئەسەنای هونەرمەندی شانۆییە. *محەممەد* ئەمین بۆز ئەرسلان كە كاری لە بارەی نۆ ژمارەی رۆژنامەی ئیتتیحاد و تەرەققیی كورد كردووە، ساڵی (١٩٩٨) بە كۆكراوی لە سوێد بڵاوی كردووەتەوە. *محەممەد* ئەمین بۆز ئەرسلان كە لە ئەنستیتیووی زمانە رۆژهەڵاتییەكانی زانكۆی میوونیخ، زمانی (٩) ژمارەی لێ سادەتر و ئاسانتر كردووە و سەر لە نوێ بڵاوی كردوونەتەوە، لە لایەكی دیكەوە بۆ ئەم چاپە نوێیە بە كوردی و توركی پێشەكیی نووسیوەو ئامادەكرووە. لە رۆژنامەكەدا نووسین و لێكۆڵینەوەی نووسەری وەك ئەحمەد جەمیل و ئیسماعیل حەققیی بابانزادە و مەلا سەعیدی كورد و سولەیمان نەزیفمان بەرچاو دەكەون. ئەو نووسینانەی ناو رۆژنامەكە، دوو نووسینی سەرنجڕاكێشیان تێدایە. لەم نووسینانەدا كە لە لایەن سولەیمان نەزیفەوە نووسراون، بە كورددا هەڵدراوە و رەخنە لەو فشارانە گیراوە كە ئاراستەی خۆی كراوە.

لە ژمارەی دووەمی رۆژنامەكەدا بە ناونیشانی كورد و كوردستان و لە ژمارە حەوتیدا بە ناونیشانی (ئزمیر كوردستان نییە)وە سەرو وتارێكی تێدا بڵاوكراوەتەوە، سولەیمان نەزیف كە بە

بنەچە کوردە، بەتایبەتی لە ساڵانی (١٩٢٠)دا لە بابەتی کوردەکاندا دەبێتە خاوەنی ڕوانگەیەکی تا دواڕادە جیهانی. شوێنی بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەکە هەر لە بارەگای گشتیی کۆمەڵەکەدا بووە کە هەر بەو ناوەوە بووە[٧٥].

**خۆرهەڵات و کوردستان:** ئەم ڕۆژنامەیەی ساڵی (١٩٠٨) بڵاوکراوەتەوە، لە سەرەتادا هەفتەی دووجار دەستی بە بڵاوکردنەوە کردووە. بەڕێوەبەری بەرپرسی ئەحمەد شەریفی هەرسەکی (هەرسەکلی)و سەرنووسەرەکەی بەدریی مەلاتیەیی (مەلاتیەلی) بووە. بە تەواوی نازانرێ ڕۆژنامەکە چەند ژمارەی لێ دەرچووە، بۆ نموونە، کتێبخانەی شارەوانیی ئەستەمبووڵ ژمارە (٣،٢،١)ی لێیە. لە ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا نووسینێکی سەعیدی کورد بڵاوکراوەتەوە[٧٦]. ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، لە لایەن ڕێکخراوێکی زانراوەوە بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ڕۆژنامەی خۆرهەڵات و کوردستان- شەرق و کوردستان، تا ئێستا روون نییە لەلایەن چ ڕێکخراوێکی کوردییەوە بڵاوکراوەتەوە.

**ڕۆژی کورد:** ئەم گۆڤارەی لەلایەن کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کوردەوە ساڵی (١٩١٣) بڵاوکراوەتەوە، بە کوردی و تورکی دەرچووە. خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرسی: عەبدولکەریمی سلێمانییە. جەمال خەزنەدار سێ ژمارەی یەکەمی پێکەوە سەر لە نوێ لە بەغدا بڵاوکردووەتەوە[٧٧].

**هەتاوی کورد:** دوای ئەوەی ساڵی (١٩١٣) ڕۆژی کورد داخراوە، لە جیاتیی ئەو گۆڤارێکی دیکە بە ناوی (هەتاوی کورد)ەوە دەردەچێ، خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرسی، عەبدولعەزیز بابانە. (١٠)

---

[٧٥] م. ئەمین بۆز ئەرسلان کە کارەکانی لە سوێددا درێژە پێ دەدا، سەر لە نوێ ئەو گۆڤاری (ژین)ەی ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) لە ئەستەمبووڵ بڵاوبووەتەوە-ی سەر لە نوێ بۆ چاپ ئامادەکردووەتەوە و لە شاری (ئۆپسالا) بڵاوی کردووەتەوە. هەروەها (٩) نۆ ژمارەی ڕۆژنامەی تەعاون و تەرەققیی کوردی، کە ئەمیش ساڵی (١٩٠٨) هەر لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، ساڵی (١٩٩٨) لە شاری (ئۆپسالا)ی سوێددا بڵاوکردووەتەوە.

76- Malmîsanij & Mahmud Levendî, Li Kurdistana Bakur û Tirkîyê Rojnamegeriya Kurdî (1908-1909), Ankara, 1992, s.24-32.

77- age., s.53-57.



دە ژمارەی ئەم گۆڤارە لە کتێبخانەکاندا هەیە کە تا ساڵی (١٩١٤) لە دەرچووندا بەردەوام بووە[٧٨]، ئەم گۆڤارەش وەکو ئۆرگانی کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کورد دەرچووە.

**ژین (گۆڤاری ژین):** ئەم گۆڤارە، ئۆرگانی بڵاوکراوەی نافەرمیی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان بووە. وەکو دواتر باسی لێوە دەکەین ڕۆژنامەیەکی کوردیش دەرچووە. ئەم گۆڤارەی ساڵی (١٩١٨) بڵاوکراوەتەوە، ساڵی (١٩١٩) کۆتایی بە بڵاوکردنەوەی هێناوە و بە تێکڕایی (٢٥) ژمارەی دەرچووە. نووسینەکانی ژین، بە کوردی و تورکی بڵاوکراوەتەوە و لە پێشدا بەڕێوەبەر و بەرپرسی گۆڤارەکە حەمزەی موکسی (موکوسلی) بووە. دوای (٢٠) ژمارە مەمدووح سەلیم ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ. محەمەد ئەمین بۆز ئەرسلان هەر هەموو ژمارەکانی بە هەندێك وەرگێڕان و ڕوونکردنەوەوە بۆ چاپی نوێی ئامادەکردووە، (٢٥) ژمارەی لە شێوەی پێنج بەرگدا ساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٨) لە ستۆکهۆڵم بڵاوکردووەتەوە. شوێنی بەڕێوەبردنی ژین، لە چاپخانەی (نەجمی ئیستیقلال)ی سەر شەقامی ئەبوسسوعوودی ناوچەی (گەڕەکی) بابی عالیدا بووە[٧٩]. وەکو پێشتر باسمان کرد، ئەم شەقامە بە ناوی ئەبوسسوعوود ئەفەندیی پیاوی ئایینیی کوردەوە کراوە کە ساڵانی (١٥٤٥) لە ئەستەمبووڵ شەیخولئیسلامەتیی کردووە.

**کوردستان:** خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرسی ئەم گۆڤارەی ساڵی (١٩١٩) لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، محەمەد میهرییە. محەمەد میهری کە باوکی سەڵاحەددین هیلاڤ-ی نووسەر و هەواداری فەلسەفەی ناسراوە، لەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی لەم ساڵانەدا دەرچووە، کۆمەڵە نووسینێك دەنووسێ و لە زمانی کوردی دەکۆڵێتەوە. محەمەد میهریی پارێزەر ماوەیەك ئەندامێتیی دەستەی مامۆستایانی کۆلیژی شەریعە (ئیلاهیات)ی کردووە. ساڵی (١٩٥٧) لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە. محەمەد میهری، یەك لەو قوتابییە کوردە کەمانە بووە کە لە کوردستانی ئێرانەوە هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، ئەندامی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان بووە. لە (١٣) ژمارەیەوە کە لە کتێبخانەی میللیدا هەیە، تێدەگەین کە ئەم گۆڤارە بەلای کەمەوە (١٣) ژمارەی لێ دەرچووە، بەڵام بە تەواوی چەند ژمارەی لێ دەرچووە. ئەمە نازانین. دەبێ

---

78- age., s.61-64.

79- Jîn, Kürdçe- Türkçe Dergi (1918-1919). Arap harflerinden Latin harflerine çeviren: M. Emin Bozarslan, Uppsala, 1985-1988.

ئەم گۆڤارە بەو ڕۆژنامە کوردییەی بە ناوی کوردستانەوە دەرچووە تێکەڵ نەکەین، کە ساڵی (١٨٩٨) لە قاهیرە دەستی بە بڵاوبوونەوە کردووە[٨٠].

**ژین (ڕۆژنامە):** وەکو لە سەرەوە گوتمان، هەر بەو ناوەوە ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) گۆڤارێك دەرچووە، دوا بەرپرس و بەڕێوەبەری ئەم گۆڤارە، مەمدووح سەلیم بووە. بەڕێوەبەرێتیی ڕۆژنامەی ژینیش هەر مەمدووح سەلیم کردوویەتی، وا دەردەکەوێ ئەم دوو ئۆرگانە بڵاوکراوەیە، تەواوکەری یەکدی بووبن. دەتوانین بڵێین ڕۆژنامەی ژین یان ئۆرگانی بڵاوکراوەی ئەو بڕە کوردەیە کە لە کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان جیابوونەتەوە و کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کوردیان دامەزراندووە، یانیش لە لایەن ئەوانەوە بڵاوکراوەتەوە. چونکە وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، مەمدووح سەلیم لەگەڵ ئەو گرووپە هەڵسوکەوتی دەکرد کە لە کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان جیابوونەتەوە[٨١].

**عەشیرەت:** ئەم بڵاوکراوەیەی تا ئێستا لە سەرچاوەکاندا زۆر باسی لێوەنەکراوە، بەلای عەلی بیرینجیی لێکۆڵەرەوە لەلایەن ئەحمەد سورەییای بەدرخانزادەوە دەرکراوە. لایەکی بە تورکی و لایەکیشی بە کوردییە. ئەو سەرچاوەیەی باسی لێوەکرا هیچ زانیارییەکی لە بابەتی کاتی دەرچوونییەوە تێدا نییە[٨٢].

## جیهانی کتێب

ئەستەمبووڵ لە مێژووی کتێبی کوردیدا بایەخێکی تایبەتیی هەیە، ڕۆشنبیریی کوردی لەم ساڵانەدا بایەخێکی زۆر بە کاری بڵاوکردنەوەی کتێب دەدا. جگە لەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی لە سەرەوە بە کورتی باسمان لێوە کردن، بڵاوکردنەوەی هەندێك کتێب کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە، بۆ یەکەم جار لە ئەستەمبووڵدا بەرچاو دەکەوێ. هەندێك لەو چاپخانانەی لە ئەستەمبووڵ بوون و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و دووکانەکانی کتێبفرۆشی، بوونەتە جێی هاتوچۆی ئەو کوردانەی لەوێ دەژیان. یەك لەوانە بەتایبەتی سەنجمان ڕادەکێشێ.

80- Malmîsanij & Mahmud Levendi, Li Kurdistana Bakur û Tirkîyê Rojnamegeriya Kurdî (1908-1902), Ankara 1992, s.81-90.
81- age., s.76-80.
82- Ali Birinci, Meşrutiyet Matbuatı (1324-1325), Kebikeç-İnsan Bilimleri için kaynak Araştırmaları dergisi, no 2, 1995, s.145.



لە چاپخانەی نەجمی ئیستیقلال کە لەسەر شەقامی ئەبوسسوعوودی ناوچەی چەغالۆغلۆدا بووە، جگە لە کاریگەرییەکانی چاپەمەنی، هەندێك کاریگەریی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریش بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە لە ترۆپکی ئەو کارەی چاپەمەنییانەدا، مەڵبەندی گۆڤاری ژینیش و ئەو بارەگای بەڕێوەبەرایەتییەی بە ناوی تەعقیبی ئوموور ( بە دواداچوونی کاروبار) کە لە ئەستەمبووڵ کاروباری کوردی بەڕێوەدەبرد، ناوەندەکە لێرە بووە. بە کورتییەکەی لەو ساڵانەدا شوێنی ئەم چاپخانەیە لە لایەن ڕۆشنبیرە کوردەکانەوە وەك مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و یەکدی بینین بەکارهێنراوە. خاوەنی ئەم چاپخانەیە حەمزەی موکسی بووە. کتێبێکی سەعید نوورسی بە ناوی نوتق (لێدووان) ساڵی (١٩١١) لە لایەن ئەحمەد رامز ئەفەندییەوە لە چاپخانەی ئیقبالی میللەت (داهاتووی میللەت)دا کە لە خانی وەزیر (وەزیر خانی)ی دەڤەری چەمبەرلیتاشدا بووە و پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەی نەشری مەعاریفی کورد (بڵاوکردنەوەی زانستی کوردی) لە چاپخانەی (ئامەدی)دا چاپ کراوە. ئامەد، وەکو زانراوە ناوێکی کۆنی دیار بەکرە. نازانین خاوەنانی ئەم دوو چاپخانەیە کێن و چ کەسن. ڕۆشنبیرێکی کوردی دیکە کە کاریگەریی لە بڵاوکردنەوەدا بووە، ئەحمەد رامز ئەفەندییە، وەکو جەمال کوتای باسی لێوە کردووە، خاوەنی کوتوبخانەی ئیجتیهاد (کتێبخانەی ئیجتیهاد) کە لە ئەستەمبووڵ ئەحمەد رامز ئەفەندیی لیجەیی بووە، وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد، عەبدوڵڵا جەودەتیش بەو ناوەوە ڕۆژنامەیەکی دەرکردووە و لە هەندێك بڵاوکراوەی دیکەدا کاریگەریی هەبووە[٨٣]. پێویستە ئەم کارانە تێکەڵ نەکرێن. کتێبخانەی نوێی خۆرهەڵات کە لە شەقامی بابی عالیدا بووە و لە دووکانی حەمدی ئەفەندیی سەححافدا کە لە ناوچەی شەهزادەدا بووە. هەندێك بڵاوکراوەی کوردیی لێ دەفرۆشرا. وەکو لە هەموو ئەم نموونانەدا دەبینرێ لە لایەن ئەو کوردە ڕۆشنبیرانەوە کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان، بایەخێکی ئاشکراو دیار بە کاریگەریی چاپ و بڵاوکردنەوە دراوە.

کە باسی کتێب دەکرێ، دەبێ باس لە ئیسماعیل پاشای بەغدایی (١٨٣٩-١٩٢٠) بکرێ کە پەیوەندیی بە لێکۆڵینەوەی بیبلیۆگرافیاوە هەیە و بەشی زۆری تەمەنی خۆی لە کوردستانی عێراقدا بەسەر بردووە و سەر بە بنەماڵەی بابان بووە. محەمەد ئەمین باوکیەتی و سەلیم بەگیش باپیری. لەبەر ئەوەی لە شاری بەغدا لە دایك بووە. بە نازناوی بەغدایی ناسراوە. لە ساڵی

83- Cemal Kutay, Bediüzzaman Said Nursi, İstanbul, 1980, s.185.

(١٨٧٥)دا كە هاتووەتە ئەستەمبووڵ ئیسماعیل پاشا لە (باقر كوێیی)دا نیشتەجێ بووە و بەو لێكۆڵینەوانەیەوە ناسراوە كە لە بارەی بیبلیۆگرافیاوە بووە. یەك لە كتێبە چاپكراوەكانی بە ناوی (ئەسمائولموئەللیفین)ەوەیە. لێكۆڵینەوەیەكە نیوەی بیۆگرافی و نیوەی بیبلیۆگرافیایە. هەروەها بەشی تەواونەكراوەی كەشفوززونوون (كشف الظنون)ی كاتب چەلەبیی تەواوكردووە. لەم لێكۆڵینەوەیەی كاتب چەلەبییەدا كە بیست ساڵ كاری تێدا كردووە، باس لە (١٥) پانزدە هەزار كتێب و نووسەر كراوە.

یەك لەو یەكەم كتێبە كوردییانەی لە ئەستەمبووڵ بڵاوكراوەتەوە، دیوانی مەولانا خالیدە، ساڵی (١٨٤٤) لە ئەستەمبووڵ بڵاوكراوەتەوە.

ساڵی (١٨٥٧) بۆ یەكەم جار (ئینجیل) پەرچڤەی كوردی دەكرێ و بە ئەلف و بێی ئەرمەنی لە ئەستەمبووڵ بڵاودەكرێتەوە. دواتر چاپێكی دووەمی ئەم كتێبە ساڵی (١٨٧٢) دیسانەوە هەر لەوێ چاپ دەكرێتەوە. ئەمجارەیان بە ئەلف و بێیەك كە زمانی ئەرمەنی و كوردیی تێدا بەكارهاتووە، هەر بە پیتی ئەرمەنی ساڵی (١٨٦١) لە ئەستەمبووڵ بڵاودەكرێتەوە. یووسف زیائەددین پاشا، لە ساڵی (١٨٩٤-١٨٩٥)دا فەرهەنگێك بە كوردی و عەرەبی ئامادە دەكاو لە ئەستەمبووڵ بڵاوی دەكاتەوە. ئەم فەرهەنگە لەگەڵ نامیلكەی نووبارا بچووكان-ی ئەحمەدی خانیدا پێكەوە بڵاودەكرێنەوە ئەمجارە لە ساڵی (١٩١٩)دا لەلایەن حەمزەی موكسییەوە داستانی مەم و زینی بەناوبانگی ئەحمەدێ خانی بۆ یەكەم جار لە ئەستەمبووڵ لە شێوەی كتێبدا چاپ كراوە. بڵاوبوونەوەی ئەم شاكارە ئەدەبییەی بە هەندێك مۆتیفی نەتەوەیی رازاوەتەوە، لەناو كورداندا بە رووداوێكی گرنگ دادەنرێ. دواتریش دیوانی مەلایێ جزیری كە كلاسیكێكی كوردیی بە بایەخە، ساڵی (١٩٢٢) لە ئەستەمبووڵ چاپ كراوە.

نووسەری كوردی دیكەش وەكو خەلیل خەیالی، ئەمین فەیزی بەگ[*٥] و عەبدوڕڕەحیم زاپسو و هی دیكە لە شێوەی كتێب نووسینی جیاجیایان بڵاوكردووەتەوە. بەمجۆرە لە مێژووی كتێبی كوردیدا دەستپێكی سەردەمێكی نوێ لە ئەستەمبووڵ بەرچاو دەكەوێ.

(*٥) لە دەقی ناو كتێبەكەدا بە هەڵە بە (فەوزی= Fevzi) نووسراوە (وەرگێڕ).



لەم ساڵانەدا، یەكەم شار كە رۆشنبیرانی كوردی تێدا بە چەمكێكی مۆدێرن و بە پێودانگێكی گشتی، ئاشنایەتییان لەگەڵ كتێبدا پەیدا كردبێ، شاری ئەستەمبووڵە. لەم ساڵانەدا بایەخێكی زۆر بە پەرۆشانی كتێب دراوە. لە گۆڤاری (ژین) دا كە لە ئەستەمبووڵی پایتەختدا دەرچووە، بانگەوازێكی سەرنجڕاكێش بۆ رۆشنبیرە كوردەكان بە ناوونیشانی (تكایەك) بڵاودەكاتەوە و لە بڕگەی یەكەمی بانگەوازەكەدا دەڵێ: ((یەكێك لە مەبەستەكانی گۆڤارەكەمان كە كردوویەتییە ئامانجی خۆی، بڵاوكردنەوەی ئەو دیوان و شیعر و نووسینە كۆنەكانی دیكەی زانا و ئەدیبانی كوردە، كە پەیوەندییان بە زمانی كورد و لە بارەی مێژووی كوردەوە نووسراون.

## دواگورزی لە بیری نەتەوەیی كورد وەشێنراو

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا نێوانی (سەرا) و ناسیۆنالیستە كوردەكان بە هیچ شێوەیەك راست نابێتەوە. لە كۆتاییدا سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دەگاتە بەر دەرگای لات بوون. دوای جاڕدانی مەشرووتییەتی دووەم، ئەمجارەیان لە ئەستەمبووڵ بەرامبەر كورد راوە كوردێكی دیكە دەست پێ دەكا. یەك لە ئامانجە سەرەكییەكانی فشار و تیرۆری (ئیتتیحادی)یان، كورد بووە. داواكارییە نەتەوەییەكانی كورد قبووڵ ناكرێ.

كاریگەرترینی ئەو هەڵسوكەوتە مافهەرسكردنانەی ساڵانی (١٧٣٠، ١٨٢٦، ١٩٠٦، ١٩٢٥) كە لە ئەستەمبووڵ ئاراستەی كورد كراوە، ئەو فشارانەیە كە ساڵی (١٩٢٥) لە ئەستەمبووڵ ئاراستەی كەسایەتییە كوردە بەرچاوەكان كراوە.

ئەو چینە كوردەی ساڵانێك لە ئەستەمبووڵ ژیاون، بە تایبەتی دوای جاڕدانی كۆماری (توركیا)، كاریگەرییە جۆراوجۆرەكانیان بە بیانوو گیراوە و رەشەبایەكی توندی تیرۆریان لە دژ ئاراستەكراوە و بەرەو شوێنە جیاجیاكانی جیهان دوور خراونەتەوە. بەم جۆرە، رۆشنبیرە كوردەكان و كەسایەتییە دیارەكانیان ناچاری دوور كەوتنەوە دەبن لە ئەستەمبووڵ و رێی تاراوگەیان لێ دیار دەكەوێ. بەو مەبەستە، رێ دەگرنە بەر كە جارێكی دی نەگەڕێنەوە ئەستەمبووڵ.

سەید عەبدولقادر كە بە درێژایی ساڵانێك لێرەدا پێشەوایەتیی كۆمەڵانی كوردی كردووە، لە ساڵی (١٩٢٥)دا لە ئەستەمبووڵ دەگیرێ و دەبرێتە دیاربەكر و بە تۆمەتی پشتگیری كردنی

شۆڕشی شێخ سەعید لە سێدارە دەدرێ. بەمجۆرە کوردەکان گورزێکی دیکەیان لێ دەدرێ. ڕووداوی لە سێدارەدانی سەرکردەیەکی بێتاوان کە سالآنێك کوردەکانی ئەستەمبوولٚ ڕێزێکی گەورەیان لێ دەنا، هەژێنترین گورزێك بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کوردی ئەستەمبوولٚی بە ئامانج گرتبوو. بەو جۆرە سەختە، سزادانی سەید عەبدولقادر کە یەکێك بووە لە زاناترین و دۆستایەتیخوازترینی کەسایەتییە کوردەکانی ئەستەمبوولٚ، سەرکوتکردنی تەواوی نەتەوەیی کوردی ئەستەمبوولٚ دەگەیەنێ. بەمجۆرە ئەستەمبوولٚ، وەکو شار لە سالآنێکی دوور و درێژەوە ئەو تایبەتمەندییەی بەخۆوە گرتووە و بووەتە ناوەندی چالاکیی سیاسی و ڕۆشنبیری، لە ڕوانگەی کوردەکانەوە، بایەخ و گرنگییەکی ئەوتۆی نامێنێ، ئەو بەگەڕکەوتنەی چەوساندنەوەیەی لە ئەنجامی شۆڕشی شێخ سەعیددا کە ساڵی (١٩٢٥) بەرپا بووە. دەستی پێکردووە، لەو دەمەدا کە تەواوی مرۆڤی کورد دەمکوت دەکرێ و لە ئەنجامدا ئەستەمبوولٚ لە دیدی کوردەکانەوە دەبێتە وێرانە و وەکو شارێکی مردووی لێ دێ.

یەك لەو دوا کەسایەتییە کوردانەی وا مانەوەی لە ئەستەمبوولٚیان بە باشتر زانی، سەید عەبدولقادر و هەندێك لە برادەرانی ساڵی (١٩٢٥) بە زۆری زۆردارەکی لەم خاکە دادەبڕێن و بە یاوەریی پۆلیس دەبرێنە دیاربەکر و لەوێ لە سێدارە دەدرێ. ئەم ڕووداوە لێرە هەڕەشەیەکی چاوشکێنی بە بایەخ بووە ئاراستەی کوردەکانی دیکەی ئەستەمبوولٚ کراوە. هەندێك کورد سەرەڕای هەموو ئەم مەترسییانە، دیسانەوە ئەستەمبوولٚ بەجێ ناهێلٚن و تا مردن هەر لەوێ دەژین. دیارترینی ئەم دوا کوردانە ئەمانەن: عەبدوڵڵا جەودەت، عەبدوڕڕەحمان زاپسو، محەممەد میهری، خەلیل خەیالی، بەدرخان ڕاسم موراد بەگ، شوکری بابان، شێخ شەفیق ئەڤراسی، شوکری سەگبان.

زۆربەی وەچەکانی ئەم نەوەیە و منداڵانی وەچەکانیان تا ئەمڕۆش لە ئەستەمبوولٚ ماونەتەوە. زۆربەی ئەمانە خۆیان بە تورك دەزانن. هەندێکیشیان ناسنامەی دوولایەنە هەڵدەگرن و هەندێکیشیان، دەتوانین بڵێین لە ناو قەیرانێکی چڕی ناسنامەدا دەژین. لەمانە زۆربەیان ناسنامەی نەتەوەییان و ڕابوردووی باوکیان لە بیر چووەتەوە و وەك وەچەیەکی جیاواز پێگەیشتوون و لە کۆتاییشدا لە ناو ملیۆنانی سەرژمێری پەرەسەندووی ئەستەمبووڵدا بزربوون



و کۆتاییان پێ هات. ئەم تەواوبوونە بۆ ئەو وەچەیەی لە سەرەتای سەدەماندا (سەدەی بیستەم) لە ئەستەمبوولٚ ژیاون و ئەوێیان بە نیشتیمانی دووەم هەڵبژاردووە، کۆتاییهاتنیان دەگەیەنێ.

بە تایبەتی چینی ڕۆشنبیری کورد لە (١٩٢٠)ەکاندا بە خەیاڵی زل و هەوەسبازییەوە ڕێیان گرتووەتە بەر، بەڵام بەم ئامانجەیان نەگەیشتوون. ناچاری بەجێ هێشتنی ئەستەمبوولٚ بوون، ئەو چینە کوردە ڕۆشنبیرەی کە لە (١٩٢٠)ەکاندا لە ئەستەمبووڵدا دەژیان، ڕێی تاراوگەیان لێ دەرکەوت، ئەم کۆچبارە بە پەژارەیەی ئەو چینە ڕۆشنبیرە کوردەی لە ئەستەمبوولٚ بووە، ئەو گۆرانییەی ئەستەمبوولٚمان دەهێنێتەوە یاد، کە بە مەقامی (کوردیلی حیجاز کار) دەگوترێ، ڕاستییەکەی ڕۆشنبیرانی کورد توانج لە ئەستەمبوولٚ دەگرن. شیعری ئەو گۆرانییەی بە مەقامی (کوردیلی حیجاز کار) دەگوترێ، لە کتێبی (ئەستەمبوولٚ لە گۆرانییەکاندا)ی (سەعدوون ئاق سوت)دا بەمجۆرەیە[*٦].

**ئەو ڕۆژەی لە دوڕگـەدا، تـۆم دی زەوقت پێ چێشتم**

**نـە ئـومێدێکت دامێ، نـە هـەڵاتی و جێت هێشتم**

---

[*٦] ئەم دەقەی ئێرە من (وەرگێڕ) کردوومەتە کوردی، دەقە تورکییەکە ئەمەی خوارەوەیە:

**Ada’da gördüğüm gün gönlüme neşe Saçtin**

**Ne bana ümit verdin ne bırakıp kaçtın**

**İsterdim beşik olsun sevgiye şen kucağım**

**Ne bana ümit verdin ne de bırakıp kaçtın**

*

**Elimizde çiçekler koştuk, oynadık, güldük**

**Şarkıların sihirli nağmesine gömüldük**

**Bir hayal âleminde uçuşurken gönüller**

**Ne yazık, gün batmadan Ada’dan geri döndük.**

* * *

ئەم ئامێزە شەنەی من، دەمویست بۆ ڤین بێشکەبێ

نە ئومێدێکت دامێ، نە هەڵاتی و جێت هێشتم

گوڵمان لە دەست، رامان کرد، بە پێکەنین و وازی

گۆرانییان، نێژراینە، ناو ئەفسوونی ئاوازی

لەو دەمەدا لە گێتیی خەیاڵدا دڵان دەفڕین

گەڕاینەوە بەر لەوەی، خۆر .. ئاوابوون بخوازی

*          *          *

## بەشی سێیەم

# ئافرەتە کوردەکانی ئەستەمبووڵ

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ناوەندێکی بە بایەخی نەتەوایەتیی مۆدێرنی کورد، ئەستەمبووڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە. سەرەڕای ئەوەی پیاوان زۆرینەی ئەو کوردانەیان پێکدەهێنا کە دەچوونە ئەستەمبووڵ، کوردێکی زۆریش لەگەڵ منداڵ و هاوسەرەکانیاندا دەچوونە ئەوێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەمماندا بارودۆخی ئافرەتان، بابەتی وەك هێز و تێکۆشانیان، یەك لە بابەتە بە بایەخەکانی گفتوگۆی رۆژانەیان پێکدەهێنا. لەم بارەیەوە دید و بۆچوونی تازە و جۆراوجۆر دەهاتە کایەوە. بۆ یەکەم جار بەشێکی ئافرەتانی کورد لە رێی بیروباوەڕی مۆدێرن و رێکخراوەکانەوە، لە ئەستەمبووڵ بەشداریی چالاکییە نەتەوایەتییەکان دەکەن. بەشێکیان بۆ یەکەمجار لەوێ ئاشنایەتییان لەگەڵ کۆمەڵە وشەیەکی نوێی وەکو: تەشکیلات (رێکخراوەکان)، جەمعییەت (کۆمەڵە)، نیزامنامە (پەیڕەو و پرۆگرام)، ئەعزا (ئەندام)، ئیجتیماع (کۆبوونەوە)، تەبلیغ (ڕاگەیاندن)، موجادەلە (خەبات)، گەزەتە- غەزەتە (ڕۆژنامە)، مەجمووعە (گۆڤار) پەیدا دەکەن .. بەکارهێنانی، یان هێنانە ناو ژیانەوەی ئەم وشانە دەکرێ، وەك ئاماژە بۆ سەردەمێکی نوێ بە دەستەوە بگیرێ، چونکە بە گوێرەی کۆنەکانەوە شێوەی تێکۆشانەکان تەواوێك دەگۆڕێن. بەرەو پێشەوە چوونێکی گرنگ کە لەم ساڵانەدا دەبینرێ، ئەوەیە کە ئافرەتان لەگەڵ پیاواندا پێکەوە شان بە شان بەشدارییان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسیدا کردووە.

رۆشنبیری و شارستانییەکی زۆر لە ئەستەمبووڵدا هەبوو، ئەم شارە گەورەیە، خۆرهەڵات و خۆراوا یەك دەخا، ئاسیا و ئەوروپا لە ئامێز دەگرێ. ئەم هەمە رەنگییەی رۆشنبیرییەکان پێکیانهێناوە، بێگومان کار دەکاتە سەر پەرەسەندنی بیرکردنەوە نوێیەکانیش. لە لایەکی کەوە



ئەستەمبووڵ وەکو ناوەندێکی بە ئاگاهاتنەوەی ئەتنیکی و بەرزبوونەوەی ئاگری سەرهەڵدانی لێ دێ. کۆمەڵە ئەتنیکییەکانی ئێرەی وەکو کۆمەڵانی رۆم و ئەرمەنی و کورد و ئەرناوت (ئەلبانی)، زۆرشت لە ئەزموونی یەکدییەوە فێر دەبن، ئەم بارودۆخە بۆ کوردیش هەر وایە. لەم رووەوە مۆزاییکی ئەستەمبووڵ لە روانگەی کوردەوە تا دوا پلە پەروەردەکارە. ئافرەتانی ئەو خەڵکانە بە پێودانگێکی گرنگ دەکەوێتە بەر کاریگەریی ئەم کار لەیەکدی کردنانە، لە نێو ئەمانەشدا ئافرەتی کوردیش هەن. دەتوانین بڵێین ئەستەمبووڵ وەکو شار ناوکەو ناوەندی بزووتنەوەی مۆدێرنی ئافرەتی کورد پێکدەهێنێ. بێگومان یەکەم رێکخراوی ئافرەتان کە ساڵی (١٩١٩) لێرە دامەزراوە بە رێکەوت نەبووە. کورتییەکەی لەم ساڵانەدا، لە ئەستەمبووڵ لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی ئافرەتی کورددا کراوەتەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا لە تورکیا، لە بارەی بزووتنەوەی ئافرەتی عوسمانییەوە زنجیرەیەك کتێب و وتار بڵاوکرایەوە. بە تایبەتی لە بابەتی رێکخراوەکانی ئافرەتانەوە لە ئەستەمبووڵ دەبینین گەلێك بەڵگەی نوێی روونکەرەوە هاتووەتە گۆڕێ. بەڵام چەند مخابنە کە لەم لێکۆڵینەوانەدا ئافرەتانی کورد بە بەرچاوەوە نەگیراون، ئەمە هۆی جۆراوجۆری هەیە. هەندێك بەڵگەی نوێ کە هاتووەتە ناوەوە. وەك لە سایەی لێکۆڵینەوەکان و سەرچاوەکاندا بینیومانە، ئەم لاپەڕەیە وردە وردە روون دەبێتەوە و لە بابەتی ئافرەتانی کورددا دەبێتە خاوەنی هەندێك بەڵگەی سەرنجڕاکێش و بەسوود. لە ساڵی (١٩٩٥)دا لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەماندا کە بە کوردی بڵاومان کردووەتەوە بە کورتی باس لەم کارانە کراوە[1].

نووسینی مێژووی بزووتنەوەی ئافرەتی کورد تازەیە، بە تایبەتی دوای ساڵی (١٩٨٠) لە ئەنجامی پەیدابوونی هەندێك بەڵگەو زانیاری، رابوردووی بزووتنەوەی ئافرەتی کورد بە پێودانگێکی گرنگ دەست بە روونکردنەوە کرا. بەتایبەتی هاتنەکایەی (کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد)ی ساڵی (١٩١٩) لە ئەستەمبووڵ. لە ئەنجامی ئەم نووسینانە لە روانگەی زۆر

---

1- at Alakom, Li Kurdistanê Hêzeke Nû: Jinên Kurd, Stockholm, 1995, 145 Laper.

لە کۆتایی ئەم کتێبەدا ئەلبوومێکی فراوانی سەد وێنەیی کە لە فۆتۆگراف و وێنەی روونکەرەوەو کاریکاتێر پێکهاتووە، بڵاوکراوەتەوە.

Rohat Alakom, Kürt Kadınları Teali Cemiyeti, Tarih ve Toplum, no. 171, 1998.

کەسەوە هەواڵێکی نوێ پێکدەهێنێ. تا ساڵانی (١٩٨٠) لە لایەن کەم کەسەوە تەنیا ناوی ئەم کۆمەڵەیە دەزانرا. وەکو لەمەودوا دەبینین، زانیارییەکانمان لە بارەی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کوردەوە رۆژ بە رۆژ لە زیاد بووندایە.

### سەفەرە نیمچە دیپلۆماسییەکانی ئافرەتانی کورد بۆ ئەستەمبووڵ

ئەستەمبوولی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نەك هەر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، بەڵکو لە ساڵانی کۆنتریشدا لەگەڵ سەفەری نیمچە دیپلۆماسییانەی هەندێك ئافرەتی کورددا ئاشنایەتیی پەیدا کردووە. هەندێك ئافرەتی کورد کە بە ئازایەتی ناسراون، گەیشتوونەتە بەردەمی پادشا (ئیمپراتۆر) و بەشدارییان لە هەندێك چاوپێکەوتنی نیمچە دیپلۆماسییانەدا کردووە. بەگی جزیرە. میر محەمەد کە دەمرێ، هاوسەرەکەی لەگەڵ کوڕیدا دەچێتە پایتەخت. لە بارەی بەڕێوەبردنی بەگایەتیی خۆیەوە بڕیارێك بە دەرکردن دەدا و دواتر دەگەڕێتەوە هەرێمی خۆی. شەرەفخانی مێژوونووسی کوردی ناسراو، ئەم ئافرەتە بە کەسێکی ((بەرز و ژیر و کۆڵنەدەر و کارگوزار)) دەناسێنێ[٢]. ئافرەتێکی وەها کۆڵنەدەری دیکەش هاوسەری ساڵح بەگ بووە. ساڵح بەگ لە سەرکردەکانی ریزی پێشەوەی (بەگایەتیی سەکەمان) بووە. هاوسەری ئەم بەگزادەیە دەچێتە ئەستەمبووڵ و هەڵوێستی بەگایەتیی خۆی بە کەسانی خاوەن دەسەڵات رادەگەیەنێ[٣].

جگە لەم نموونە دێرینانە، کاریزماتیکترین ئافرەتێکی کورد کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدە، سەریان لە ئەستەمبوولی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی داوە، بێگومان (قەرەفاتمە)یە.

لە ساڵی (١٨٥٣)دا لە دەسپێکی جەنگی (قرم)دا قەرەفاتمە، کە بە سێ سەد سوارچاکییەوە چووەتە ئەستەمبووڵ و چووەتە بەردەمی پادشا، بەمجۆرە رایدەگەیەنێ کە لە ناو پشتیوانانی پادشادایە. ئەم سەفەرەی قەرەفاتمە بە تایبەتی لە مێدیای ئەوروپادا جێیەکی فراوان دەگرێ. لەو ساڵانەدا بە سواریی ماییینێکەوە وەکو مێردان و بە ناو مەیدانی ئویسکویداردا گەڕان، کاری ئافرەتان نەبووە. کەچی قەرەفاتمە ئەم ئازایەتییە دەنوێنێ و لەگەڵ گرووپێکی

2- Şeref Han, Şerefname-kürt Tarihi, İstanbul, 1971 Arapçadan çeviren: M. Emin Bozarslan, s.153.
3- Şeref Han, Şerefname, s.200.



پیاواندا دەچێتە ئەستەمبووڵ. بۆ نموونە لە رۆژنامە و گۆڤاری ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی و سوێدیی وەکو:

The İllustrated London News, Globus, Le Tour du Monde, Svenska Family - Journalen, Kadınlar Dünyası.

لە بارەی قەرەفاتمەوە زنجیرەیەك هەواڵ بڵاوکراوەتەوە. یەکەم هەواڵ لە بارەی ئەم گەشتەی قەرەفاتمەوە لە رۆژنامەی (The illustated London News)دا بە ناونیشانی ((قەرەفاتمە لە ئەستەمبووڵ)) بڵاو دەکرێتەوە (٢٢ی نیسانی ١٨٥٤)، لەو نووسینەدا ئەوە نووسراوە کە قەرەفاتمە سەر بە عەشیرەتێکی کوردی دەڤەری مەراش-ە[٤]. بەڵام هەندێك سەرچاوەی دیکە، ئەو ناوچەیەی قەرەفاتمەی لێوە هاتووە بە رەواندز[٥]. یان بە مەلاتییە[٦] دادەنێ. جگە لەم سەردانی ئەستەمبووڵەی قەرەفاتمەیە. لە سەرچاوەکاندا ئازایەتیی قەرەفاتمە و قارەمانییەتیی باسکراوە. ئەمجارە قەرەفاتمە لەو جەنگەدا دەبینین کە ساڵی (١٨٧٧-١٨٧٨) لە ناوچەی ئەرزەرۆمدا بەرامبەر رووسەکان درێژە پێداوە[٧].

لە لایەکی دیکەوە وێنەیەکی فۆتۆگرافیی زۆری قەرەفاتمە لەو رۆژنامە و گۆڤارانەدا دەردەچێ کە لە ئەوروپا بڵاودەکرێتەوە. بۆ نموونە:

The illustrated London News. Globus, Le Tour du Monde, Svenska Familj-Journalen, Kadınlar Dünyası.

قەرەفاتمە لەم بڵاوکراوانەدا بە: ((شێری کوردستان))[٨] ، ((ژنە میرزادەی کورد))[٩] و ((قارەمانی کوردستان)) دەناسێنرێ. لە گۆڤارێکی سوێددا ساڵی (١٨٨١) لە بارەی

4- The İllusrtated London News, 22 Nisan 1854.
5- Amand v. Schweiger-Lerchenfeld, Qvinnan bland skilda folk.(ئافرەت لە ناو خەڵکی جیاوازدا), Stockholm, 1881. s.59.
6- Halil Hamid, Alem-i Nisvan-Kürt Kadınları, Siyanet, no 15, 1914.
7- Bak. Siyanet dergisinin aynı sayısı.
8- İlhami Yazgan, Kara Fatma İstanbul'da, Özgür Gündem 12.9.1993.
9- Les Kurdes-Les Yezidis, Le Tour du Monde, cilt; 16, 1867, s.92.

قەرەفاتمەوە نووسینێك بە ناو و نیشانی (ئەمازۆنێك)[*١]ـەوە بڵاودەكرێتەوە. لە نووسینەكەدا پەیدابوونی هاوشێوەیەكی تاسسۆس كلۆریندا (Tassos clorinda) لەم سەدەیەماندا بە ناوی قەرەفاتمەی كوردەوە باس كراوە و لە لایەكی دیكەوە سەرنج بۆ لێكچوونی نێوانی (جان دارك) و قەرەفاتمە راكێشراوە. هەر لەو گۆڤارەدا تابلۆیەكی قەرەفاتمە بڵاوكراوەتەوە، كە لە لایەن (A.Wanjura) وە كێشراوە. لە ژمارەیەكی (Le Tour du Monde)دا كە ساڵی (١٨٦٧) دەرچووە، تابلۆیەكی شێوە پیاوانەی قەرەفاتمە بڵاو كراوەتەوە. لە هەندێك سەرچاوەی توركیدا ئەم وێنەیە، وەك ئافرەتێكی تورك پیشان دەدرێ. هەر ئەو وێنەیە لە كتێبی: قوای ملیەنك قادین قهرمانلری (ژنە قارەمانەكانی هێزە میللییەكان)ی (ئاینوور مسر ئۆغلۆ)دا وا دانراوە كە ئافرەتێكی توركە. دانەیەكی رەسەنی ئەم تابلۆیەی لە (Le Tour du Monde)دا بڵاوكراوەتەوە.. لە بەهاری (١٩٩٧)دا كە سەرم لە ئەستەمبووڵ دا، لەلای كۆنە كتێبفرۆشێكدا وەكو ئەنتیكێكی (كۆنینەی بە نرخ) لە چوارچێوەیەكدا بە نرخێكی بەرز بۆ فرۆشتن دانرابوو، لە ژێر تابلۆكەدا نووسرابوو: ((میرە ژنی كورد=La Princessa Kurde)). بەمجۆرە قەرەفاتمە دوای ساڵانێكی دوور و درێژ دیسان لە ئەستەمبووڵ بوو! لە سەرچاوە كۆنەكاندا ئەم تابلۆیە و چوار تابلۆی جودای دیكەی قەرەفاتمە پێكەوە بەرچاومان دەكەوێ. یەكێكی ئەمانەش رەنگا و رەنگە، لە مەیاندا قەرەفاتمە نەك لەسەر پشتی ئەسپدا، بەڵكو بە پێوە دەبینرێ. لە ژێر هەر ئەو وێنەیەدا نووسراوە: ((قەرەفاتمە- قارەمانی كوردستان)) (Karafatma- I'hêroine du Kurdistan). كۆپییەكی ئەم تابلۆیە لە كتێبی (پارس توغلاجی)دا كە بەناوی: (ئافرەتانی ئەستەمبووڵ لە سەردەمی عوسمانیدا)یە بڵاوكراوەتەوە. وا دیارە ئەم دیمەنەی قەرەفاتمە، لە كۆمەڵە جلوبەرگێكی لە پیشانگا دانراوی خەڵكانێكی جیاجیاوە وەرگیراوە و شێوەكەی رێكخراوە و بەوەی كە لە سەر وێنەكەدا ناونیشانی: ((Costumes Turk et Orienttaux))ی بۆ دانراوە، دیارە ئەم وێنەیە لە سەرچاوەیەكی فەرەنسییەوە وەرگیراوە، بەڵام پارس توغلاجی لە كتێبەكەیدا هیچ زانیارییەكمان لەم بارەیەوە ناداتێ. لەلایەكی دیكەوە، لە ژێر وێنە رەسەنەكەدا نووسراوە (قەرەفاتمە- قارەمانی

(*١) ئەمازۆن: ناوێكی دێرینە لە جیهاندا، بەو ژنانە گوتراوە بە سواری و ئازایانە بەشدارییان لە جەنگ كردووە. (وەرگێڕ)



كوردستان- Kara Fatma- I'heroine du Kurdistan) تەنیا بە (قەرەفاتمە) وەرگێڕاوە، هەر لەو لاپەڕەیەدا، لە ژێر ئەو وێنەیەی بە ناوی ((سوارچاكی كورد))ەوەیە نووسراوە ((سوارچاكێكی خۆرهەڵات)).

لە سەرچاوە كۆنە كوردییەكاندا زۆر بە دەگمەن چاومان بە ناوی قەرەفاتمە دەكەوێ. ئەوەندەی بزانین بۆ یەكەمجار لە كتێبی (Adler von Kurdistan)ی كامەران بەدرخاندا كە ساڵی (١٩٣٧) لە ئەڵمانیا بڵاوكراوەتەوە، بە پێداهەڵدانەوە باسی لێوەكراوە. پادشا (سوڵتان) لە قەرەفاتمە دەپرسێ: ((یەكێكی وەك تۆ كە ئەم جۆرە قارەمانییەی نواندووە، چۆن دەبێ توركی نەزانێ؟)) بەرامبەر ئەم پرسیارە، قەرەفاتمە ئەو وەڵامە دەداتەوە: ((ئەی پادشای من، ئەگەر ئێوە كوردیتان بزانیبا، پێویست بەوە نەدەما توركی بزانن)). هەندێك نووسەری توركی وەك ئەحمەد جەودەت پاشا و مدحەت ئەفەندی لە كتێبەكانیاندا لە بارەی قەرەفاتمەوە زانیاری دەبەخشن. وەك دەبینرێ ناوی قەرەفاتمە لە سەدەی(١٩) نۆزدەدا بە مێدیای جیهانیدا بڵاودەبێتەوە. لە توێژینەوەیەكدا (ئاینوور مسرئۆغلۆ) لە بارەی ئافرەتانی توركەوەی نووسیوە، قەرەفاتمەی وەكو تورك وەرگرتووە، لە لایەكی دیكەوە لە گۆڤاری (جیهانی ئافرەت- Kadın Dünyası)ی توركیدا كە ساڵانی (١٩١٣-١٩٢١) لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، ئەو زانیارییانە تێكدەدا كە لە بارەی قەرەفاتمەوە هەیە. ئاینوور مسرئۆغلۆ لە كتێبێكیدا كە ساڵی (١٩٧٦) بڵاوی كردووەتەوە، تەواوی ئەم باسەی (جیهانی ئافرەت)ەی لە كتێبەكەیدا داناوە، بەڵام ئەو بەشەی یەكەم پەرەگرافی نووسینەكەی، كە باسی كورد بوونی قەرەفاتمە دەكا، لابردووە. لەم پەرەگرافەدا باسی ئەوە دەكا كە قەرەفاتمە، كچی بەگزادەیەكی كوردی ناوچەی مەلاتییەیە. لە هەندێك سەرچاوەی مێژووی توركدا تووشی گەلێك شێواندنی لەم جۆرە دەبین. بە پێی خاڵێكی سەرنجراكێشی نووسینەكە، قەرەفاتمە راوێژكارێكی بە ناوی (ئیبۆ)وە بووە گەلێكی لێ ترساوە و (خۆی لێ لاداوە)[١٠]. گۆڤاری (Le Tour du Monde)

(١٠) لەم ساڵانەی دواییدا بیبلیۆگرافیایەكی دەوڵەمەندی قەرەفاتمە پێكهاتووە لەم بارەیەوە بڕواننە:

Kara Fatma at Constantinople, The İllustrated London News, 22 Nisan 1854.

كە لە فەرەنسا بڵاوكراوەتەوە، دواتریش لە بارەی دوارۆژی قەرەفاتمەوە ئەمانە دەڵێ: ((پاش ئەوەی چەند هەفتەیەك بووە- شێری ئەستەمبووڵ- قەرەمیرەژن گەڕایەوە ناوچە شاخاوییەكەی خۆی و لەوە پتر دەنگی لێوە نەهاتەوە، لە دەرەوەی كوردستان، لە ئەستەمبووڵ چیی دی باسی پتری لە بارەوە نەكرا)).

---

Les Kurdes-Les Yezidis, Le Tour du Monde, cilt: 16, s.92, 1867. Dscharidat al-Waqa'i al-Masriyah, no 730, 4.11.1877 (bak. Cemal Nebez, Die Kurdische Zeischrift "Nischtiman" Stockholm, 1985, s.133).

Amand v. Schweiger-Lerchenfeld, Qvinnan bland skilda folk, Stockholm, 1881, s.59.

En amason, Svenka Familj-Journalen, no 11, 1881.

Kara Fatma, Kadınlar Dünyası, no 100, 1913.

Halil Hamid, Alem-i Nisvan: Kürt Kadınları, Siyanet, no 16, 1914.

Kamuran Bedirhan & Herbert Örtel, Adler von Kurdistan, Berlin, 1937.

Türk yazarı Mithat Efendi'nin çıkartmış olduğu Karkanbar adlı dergide Kara fatma'ya ilişkin olarak bir yazı yer almıştır (bak. Mehmed Çağlayan, Şark Uleması, İstanbul, 1996, s.309).

Ahmed Cevdet Paşa, Ma'rûzât, İstanbul, 1980 (Ahmed Cevdet Paşa'ya göre Kara Fatma, Cerîd aşiretine mensuptur, s.147).

N. Medyalı, Kürt Aşiret Lideri Kara Fatma Hanım, İstanbul'da Osmanlı Sultanı ile Görüşüyor, Berhem, no.5, 1989.

Martin van Bruinessen, Matriarchy in Kurdistan? Women Rulers in Kurdish History, The international Journal of Kurdish studies, cilt: no 1-2, 1993.

Aynur Mısıroğlu, Kuva-yı Milliye'nin Kadın Kahramanları, İstanbul, 1994, s.45.

Rohat Alakom, Li Kurdistanê Hêzeke Nû: Jînên Kurd, Stockholm, 1995.

İhami Yazgan, Kara Fatma Efsanesi 1-II, Özgür Politika 31.5.1996- 1.7.1996.



ئەم سەفەرەی قەرەفاتمەیەش بۆ ئەستەمبووڵ و ئەو هەواڵانەش كە لەم بارەیەوە دەرچووە، لە روانگەی ئافرەتانی كوردەوە دەكرێ وەك سەرچاوەیەكی بە شان و شكۆ و شانازی پێكراو هەڵبسەنگێنرێ. گرنگیی مێژوویی ئەم كۆششە نیمچە دیپلۆماسییانەی ئافرەتی كورد پێش سەدان ساڵ بەجێیان هێناوە، ئەم سەفەرانەی بۆ ئەستەمبووڵ كراون، بێگومان لە سەردەمی خۆیاندا رووداوی گەورە بووە، بەتایبەتی ئەم دوا سەفەرەیان لە مێژووی ئافرەتی كورددا گرنگییەكی گەورەی هەیە.

## ژیانی ئافرەتی كورد

زۆرینەی ئەو ئافرەتە كوردانەی لە ئەستەمبووڵ بوون وەكو ((ژنی ناو ماڵ ژینیان بەسەر بردووە. بە كاری ناوماڵ و منداڵەوە خەریكبوون. بەشێكیشیان بە مامۆستایی و چاودێریی منداڵ و كاری خاوێنكردنەوە و بەرگدروون و كاری دیكەوە خەریك بوون. ئەو ئافرەتانەی لە خێزانی هەژارەوە هاتوون لە ئەستەمبووڵ تووشی دژوارییەكی زۆر هاتوون. لە شارێكی وەها گەورەدا نەزانینی توركی و لەبەر هۆگەلی دیكەوە گەلێك شتی سەیر و سەمەرە بەسەر ئەم ئافرەتانەدا هاتووە، بۆ نموونە كابرایەكی خەڵكی بتلیس رۆژێكیان هاوسەرەكەی بزر دەبێ، چەند رۆژێك دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە و بابەتەكە دەگاتە رۆژنامەكان. ئەم كابرایەی ناوی ئەحمەد بووە لە دانیشتووانی ناوچەی (زەیرەك) بووە و ناوی هاوسەریشی نیعمەت خانم بووە[11].

لە نووسەرە توركەكانیش خالیدە ئەدیب ئادیوار، لە بیرەوەرییەكانیدا باسی كچە كوردێك دەكات كاری چاودێری كردنی منداڵی كردووە و لە یەكێك لە رۆمانەكانیدا كە ئافرەت قارەمانی بووە، جێیەكی بۆ دیاری كردووە[12]. لە لایەكی دیكەوە خالیدە ئەدیب ئادیوار لە

---

11- "Karımı Kaybettim; Haberiniz var Mi?" Cumhuriyet 25.7.1930.

12- Memoris of Halide Edib, London, 1926, s.104.

خالیدە ئەدیب ئادیوار- لە رۆمانی (ژانەدڵ Kalp Ağrısı)دا چیرۆكی عەشقی (زەینۆ)ی كچە كورد كە لە ئەستەمبووڵدا ژیاوە دەگێڕێتەوە، لەم بارەیەوە بڕوانە:

Doç. İnci Enginün, Halide Edib Adıvar'ın Eserlerinde Doğu ve Batı Meselesi, İstanbul, 1978, s.218-220. Bahriye çeri Türk Romanında Kadın, İstanbul, 1996, s.42-45.

Bu Roman ilk kez 1924 yılında vakit gazetesinde tefrika edilir, aynı yıl kitap olarak yayımlanır.

بیرەوەرییەکانیدا باسی کیژە کوردێکی دیکە دەکا کە لە ئەستەمبووڵ ژیاوە. ئەم کچەی ناوی مەخموورە بووە کچی عەلی شامیل پاشای بەدرخانی- یە. ئەم کچە و خالیدە ئەدیب ئادیواری نووسەری تورك، دایکیان یەکە و باوکیان جودایە. واتە لە دایکەوە بە زڕخوشك دادەنرێن. هەموو پیاوانی بەدرخانییەکان کە ناویان لە رووداوی ساڵی (١٩٠٦)ی کوژرانی ریدوان (رضوان) پاشادا هێنراوە، بە منداڵانی دوانزە ساڵییانیشەوە دوور خراونەتەوە، هەر هەموو بەدرخانییەکان لە ئەستەمبووڵ دوور خراونەتەوە. هەندێك لە ئافرەتەکانیان لەگەڵ منداڵە گچکەکانیان پێکەوە بە تەنیا دەمێننەوە و پەرێشان دەبن. یەك لەمانە (مەخموورە)یە. مێردەکەی بۆ قودس دوور دەخرێتەوە. بەخۆی هەر لە ژێر چاودێریدا بووە و پۆلیس هەر لەبەر دەرگایاندا ئێشکیان گرتووە. مەخموورە، کە سکی پڕ بووە، ساوایەکی نۆ مانگییشی بووە. بەپێی قسەی خالیدە ئەدیب ئادیوار، یەك لە مامەکانی مەخموورە خانم کە هەڵاتووەتە دەرەوەی وڵات، پێی دەڵێ: ((تۆش لەگەڵماندا وەرە، دەبیتە قراڵیچە - شاژن-ی کوردستان))، بە قسەی خالیدە ئەدیب ئادیوار ئەم داواکارییە رەت دەکاتەوە و دەڵێ: ((من ژنە تورکێکم لە ژێر ئەم ئاڵایەدا لە دایك بووم، لێرە ژیاوم، لێرەش دەمرم)).

لە خاڵێکی سەرنجڕاکێشدا، بیرەوەرییەکانی ئادیوار پێشتر لە (١٩٢٦)دا کە بە ئینگلیزی بڵاوی کردووەتەوە، ئەم جۆرە باسە پرۆپاگاندە ئامێزانەی زۆر تێدا نەبووە. ئەم بیرەوەرییانە دواتر، ساڵانی (١٩٥٠) بە ناوی (خانووە بە هێشووە مۆرەکە- Mor Salkımlı Ev)ەوە بە تورکی بڵاوکراوەتەوە هەندێك بابەتی ناسکی لێ دەردەهێنرێ، لە جیاتیی ئەوانە هەندێك پاشکۆی تێدا دەئاخنرێ. وا دیارە، ئەم بیرەوەرییانە کە بە تورکی دەرچووە، نووسەر ناچاری سەر لە نوێ چاوگێڕانێکی بە ناواخنی کتێبەکە بوو بێ. خالیدە ئەدیب ئادیوار هەندێك لە بەرهەمەکانی زانیاریی سەرنجڕاکێشیان لە بارەی ژیانی کوردەکانی ئەستەمبوولی بەخۆوە گرتووە.

لە گۆڤاری (ژین)دا کە لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، هەندێك نامەمان بەرچاو دەکەوێ کە لە لایەن ئافرەتە کوردەکانەوە نووسراون، بۆ نموونە نامەکانی کچە مامۆستایەك بە ناوی (ه. عەزیز) و مامۆستایەك بە ناوی (تەنین مەلازادەی میدیایی)یەوە لە (ژین) دا بڵاوکراوەتەوە. لەم دوو نامەیەی ئەم خوێنەرانەوە تێدەگەین کە لە ناو ئافرەتانی کورددا قوتابییش و مامۆستاش هەبووە. هەروەها لە سایەی ئەم نامانەدا تێدەگەین کە لە نێو ئافرەتانی کورددا تا



رادەیەك هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری بڵاوبووەتەوە، برێکی ئەم ئافرەتانە هەستیان بە نزیکیی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد کردووە[١٣]. جگە لەوەی دوو ئافرەت بە ناوی (هیدایەت) و (گوزیدە)وە لێرەدا پەروەردەبوون، دواتر مامۆستاییان کردووە.

داخۆ لەم دەمانەدا چەند ئافرەتی کورد لە ئەستەمبووڵ دەژیان؟ لەم بارەیەوە ژمارەیەکی رێکمان پێ نادرێ، بەڵام بەبێ گومان ژمارەیان هەزارانی رەت دەکرد. لە هەندێك سەرچاوەی کۆندا لە بارەی ژمارەی ئەو ئافرەتە کوردانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان، ناوە ناوە هەندێك ژمارە دانراوە. بۆ نموونە بە پێی تۆمارەکانی شارەوانیی ساڵی (١٩٣١-١٩٣٢)ی ئەستەمبووڵ (٤١١) ئافرەت لە ئەستەمبووڵ بووە. بە پێی ئەو سەرژمێرەی ساڵی (١٩٥٠) کراوە، ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لە خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باشوورەوە هاتوون و لە ئەستەمبووڵ ژیاون بە (٢١) هەزار کەس دانراون. ساڵی (١٩٥٠) بە گشتی سەرژمێری کورد لە ئەستەمبووڵدا نزیکەی (٦٠) هەزار کەس بووە. واتە رێژەی ئافرەتان بە پێی سەرژمێری کورد بە گشتی سێیەکی پێکهێناوە، بە بەرچاوەوە گرتنی ئەم رێژەیە دەتوانین بڵێین لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەو ئافرەتە کوردانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان نزیکەی (١٠) دە هەزار کەس بووە. وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد تێکڕای سەرژمێری کورد لە ئەستەمبووڵ. لەو ساڵانەدا بە (٣٠) هەزار کەس دادەنرێ.

### رووخانی دیوارەکان: پێکهاتنی بەرەی ژن - پیاو:

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا شوێنی ئافرەت لە کۆمەڵدا و بابەتی رۆڵی لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بۆ یەکەم جار بەم شێوە فراوان و زانستییانەیە قسەی لەسەر دەکرێ. لەم بارەیەوە بیرۆکەی نوێ دەهێنرێنە گۆڕێ. بوونی ئافرەتانی کورد وەکو هێزێکی سیاسی و رۆشنبیری و ئەتنیکی لەم دەمانەدا تازە بە تازە پەردەی لەسەر لادەدرێ. هەڵوێستی ئافرەتان زانستییانە لە لای کوردی ئەستەمبووڵ بە بەرچاوەوە دەگیرێ. نەك هەر

---

[١٣] بۆ نامەی (ه.عەزیز) بڕوانە ژین- ژمارە (١٦)، ١٩١٩.

بۆ نامەی تەنینی مۆلانزادەی میدیایی. بڕوانە: ژین- ژمارە (٩)، ١٩١٨ کە م.ئەمین بۆز ئەرسلان- لە پیتی عەرەبییەوە کردوویەتییە لاتینی و لە ستۆکهۆڵم ساڵی (١٩٨٥-١٩٨٨) چاپی کردووەتەوە.

تەنیا ئافرەتان، بەڵکو پیاوانیش لەگەڵ بزووتنەوەی ئافرەتاندا لە هاوکاریدا دەبن. وەکی دی لە روانگەی رەسەنی ئەتنیکییەوە چەند رۆشنبیرێکی کورد، لە وریابوونەوەی ئافرەتانی عوسمانیدا دەورێکی گەورەیان بینیوە، بۆ نموونە عەبدوڵڵا جەودەت، قاسم ئەمین، زیا گوێك ئالْپ و رەفعەتی مەولانزادە، هەندێکن لەمانە.

عەبدوڵڵا جەودەت یەك لە رۆشنبیرە کوردەکان بوو، لە نووسینەکانیدا بەردەوام بەرگری لە مافەکانی ئافرەت دەکا، ئافرەت لە پێکهاتنی کۆمەڵگاکان و دەوری دایکان بە گەورە هەڵدەسەنگێنێ: ((... ئێمە بە پێی واتا، پتر درێژەی ژیانی دایکانمانین، لەوەی هی باوکانمان بین))[١٤].

عەبدوڵڵا جەودەتی رۆشنبیری کورد، لەگەڵ ئیسحاق سوکووتی، قوتابخانەیەك دەکەنەوە کوڕان و کیژان پێکەوە بتوانن تێیدا بخوێنن. لە بابەتی ئافرەتاندا نووسینێکی زۆری لە گۆڤار و رۆژنامە جیاجیاکاندا بلاو کردووەتەوە، بۆ نموونە، چیرۆکێکی (گوڵ)ی کچی عبدوڵلا جەودەت لە (گۆڤاری ئیجتیهاد)دا بڵاوکراوەتەوە، هەر لە ژێر چیرۆکەکەدا نووسینێکی عەبدوڵڵا جەودەت بە ناونیشانی (ئافرەت و سیاسەت) بڵاوکراوەتەوە. عەبدوڵڵا جەودەت هەوڵی داوە، لەم نووسینەدا بۆچوونەکانی خۆی لە بارەی ئافرەتەوە کورت بکاتەوە[١٥]. ساڵی (١٩٩٧) لە ئەستەمبووڵ کە سەرم لە شوێنە کۆنەکانی کوردان دەدا، لەو ماوەیەدا سەرم لە (ماڵی ئیجتیهاد) دا، کە عەبدوڵڵا جەودەت ساڵەهای ساڵی لێ ماوەتەوە و کاری کردووە. (گوڵ)ی کچی، هێشتا لە ژیاندا بوو و لەوێ دەژیا، لەگەڵ گەورەیی تەمەنیشی خەریکی نۆژەنکردنەوەی ماڵەکەی بوو.

قاسم ئەمین (١٨٦٠-١٩٠٣) یەکێکە لە رۆشنبیرە کوردەکان و ساڵانێکی دوورودرێژ لە میسردا ژیاوە. ئەو نووسینانەی لە بارەی ئافرەتەوە نووسینی لە جیهانی عەرەبیش و هەروەها لە ئەورووپاش دەنگدانەوەیەکی گەورە بەرپا دەکا، قاسم ئەمین کە لە بنەماڵەیەکی کوردی

14- Dr. M. Şükrü Hanioğlu, Doktor Abdullah Cevdet ve Dönemi, 1981, s.174.

15- Dr. Abdullah Cevdet, içtimai Hayatta Kadın, Süs, no 42, 1924, içtimai Hayatta kadın: J. M. Köyü ve Kadın, Süs, no 43, 1924. Abdullah Cevdet'in Kadınlara ilişkin yazdığı yazıları için bak. Kadın Dergileri Bibliyografyası, İstanbul, 1992. yine bak. Abdullah Cevdet, kadın ve Siyaset, kızı Gül'ün bir öyküsü aynı sayıda yer almaktadır: Küçük Satıci, İçtihat, no 298, 1930.



سلێمانییەوە هاتووە، لە فەرەنسا حوقووق (ماف — قانوون)ی خوێندووە و ساڵانێکی دوورودرێژ لە میسر دادوەریی کردووە. کتێبی (ئازادیی ئافرەتان)ی قاسم ئەمین بە ناوی (حورریيەتی نسوان)، ساڵی (١٩١٨) بە تورکی وەردەگێڕێ، بەڵام بە بۆچوونی د.بەرنارد جاپۆرال لە لایەن حوکوومەتی ئەو سەردەمەوە ساڵی (١٩١٥) قەدەغە دەکرێ. بەمجۆرە قاسم ئەمین لە لای ناوەندە رۆشنبیرییەکەی ئەستەمبووڵ دەبێتە کەسایەتییەکی ناسراو.

ئەم لێکۆڵینەوەیەی قاسم ئەمینە، دواتر وەردەگێڕێتە سەر زمانی جیاجیا و دەبێتە سەرچاوەیەکی سەرەکیی گرنگ. بۆ نموونە ساڵی (١٩٢٨) لە شتوتگارت دەکرێتە ئەڵمانی، نووسەر جگە لەمە، بەناوی (ئافرەتی نوێ)وە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەشی هەیە. یەك لەوانەی بۆ یەکەم جار کوردایەتیی قاسم ئەمینی باس کردبێ، محەممەد ئەمین زەکی بەگە کە بە لێکۆڵینەوەکانییەوە لە بارەی مێژووی کورد بەناوبانگە.

زیا گوێك ئالْپ هەر چەندە لە لایەن رەسەنی ئەتنیکییەوە کوردیش بێ، دواتر دەبێتە باوکی نەتەوەخوازیی تورك و لە دۆزی کورد دوور دەکەوێتەوە. بەڵام بۆچوونەکانی بەرامبەر ئافرەتان، بە بەراورد لەگەڵ هەندێك کەسی سەردەمی خۆی گەلێك لە پێشەوەتر بووە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا زیا گوێك ئالْپ کە ناوە ناوە لە ئەستەمبووڵدا ژیاوە، لەوێ لەگەڵ رۆشنبیرە کوردەکانی دیکەدا ئاشنایەتیی دەبێ لە بارەی زمانی کوردییەوە لە لێکۆڵینەوەگەلێکدا بەشداری دەکا. لە یەك لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەڵێ: ((لە نێو کوردیشدا جاروبار ئافرەتانیش وەك پیاوان ئازایەتی و قارەمانێتیی نموونەیی دەنوێنن))[١٦].

زیا گوێك ئالْپ هەر لەو لێکۆڵینەوەیەیدا ئەم پەندی پێشینانەی کوردە دووبارە دەکاتەوە: ((شێر شێرە، چ ژنە چ مێرە)). زیا گوێك ئالْپ بەر لە جاڕدانی مەشرووتییەت سەردەمێك لەگەڵ هەندێك لەو کوردانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان پەیوەندیی دەبێ. کار لە رێزمانی کوردی دەکا. بە پێی قسەی خالیدە ئەدیب ئادیوار، دواتر دەست لەم کارە هەڵدەگرێ.

یەك لەم کەسایەتییە کوردە سەرنجڕاکێشانەی ئەستەمبووڵ بێگومان رەفعەتی مەولانزادەیە. رەفعەتی مەولانزادە کە لە کوردەکانی سلێمانییە، ساڵانێکی دوورودرێژ لە ئەستەمبووڵ

16- Ziya Gökalp, Kürt Aşiretleri Hakkında Sosyolojik Tetkikler, İstanbul, 1992, s.38.

ژیاوە، لەوێ وەکو ڕۆژنامەنووسێك کاری کردووە. بەم هۆیەوە گەلێك جار گیراوە، دوورخراوەتەوە و بووەتە ئامانجی زنجیرە فشارێکی سیاسی. لە کۆتاییدا دەخرێتە لیستی سەدو پەنجا کەسییەکەوە و دەنێررێتە تاراوگە. تا ساڵی (١٩٣٠) کە مێژووی کۆچی دواییەتی ژیانی لە ژێر مەرجەکانی ژیانی تاراوگەیی لە سووریە بەسەر بردووە. ڕفعەتی مەولانزادە بەر لەوەی بنێررێتە تاراوگەی سووریا، کچێکی بە ناوی (عولوییە) خانم (١٨٩٣-١٩٦٤) خواستووە، دوای هێنانی ناوی دەبێتە عولوییە مەولان. لە ساڵی (١٩١٣)ەوە بەڕابەریی عولوییە مەولان، بە ناوی جیهانی ئافرەت-ەوە لە ئەستەمبووڵ گۆڤارێکی ئافرەتان دەست بە دەرچوون دەکات. ناوە ناوە وەستانی تێکەوتبێ، تا ساڵی (١٩٢١) بڵاوبوونەوەی بەردەوام بووە، نزیکەی (١٩٤) ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

جیهانی ئافرەتان، لە نێو ئافرەتانی عوسمانیدا بێ ئەوەی جیاوازی لە ئایین و ڕێبازی ئایینی و ئەتنیکی بکا، بووەتە دەنگی تەواوی ئافرەتانی عوسمانی. لەم دەمانەدا لە نێو ئەو (وەرزییانە)ی ئافرەتان دەریانکردووە، یەك لە جدیترین و ناسراوترینی گۆڤارەکان (جیهانی ئافرەتان)ـە. گۆڤارەکە هەر بەو ناوەوە چاپخانەیەکی هەبووە. وەکو دواتر باسی لێوە دەکەین نیزامنامە (پەیڕەو و پرۆگرامی) کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد، کە ساڵی (١٩١٩) دامەزراوە، لەو چاپخانەیە لەچاپدراوە. ئەمەش ئەوە پیشان دەدا کە دەرگای گۆڤارەکە لە ڕووی هەر هەموو ئافرەتانی عوسمانی واڵاکراوە بووە، ئافرەتانی ڕۆم، ئەرمەنی، کورد، ئەرناوت (ئەڵبانی) و چەرکەس لەگەڵ گۆڤارەکەدا پەیوەندیی جیاجیایان هەبووە.

دەرچوونی جیهانی ئافرەت، کاریگەرییەکی زۆر بەرپا دەکا. هەندێك لە ئۆرگانەکانی مێدیای ئەورووپی، شوێنیان بۆ دەرچوونی ئەم گۆڤارە تەرخان دەکرد، بۆ نموونە وەکو: Berlin Tageblat کە لە ئەڵمانیا دەرچووە و Dagny کە لە سوێد دەردەکرا، Odette Feldmannی ڕۆژنامەنووسی ئەڵمان، لە ڕیپۆرتاژێکدا کە لەگەڵ عولوییە مەولاندا ئەنجامی داوە، عولوییە مەولان ئەوە رادەگەیەنێ کە بیرۆکەی دەرکردنی گۆڤارێکی وەها بۆ یەکەمجار لە لایەن



هاوسەرییەوە هاتووەتە گۆڕێ[١٧]. لە بابەتێکی سەنجراکێشدا، لە ژمارە (١٦٣) بەولاوە، ڕفعەت مەولان دەبێتە بەڕێوەبەری گۆڤارەکە. لە لایەکی دیکەوە، بە ئامانجی ئەوەی سەر لە نوێ بەرپرسییەتییان بە بیری پیاواندا بهێنێتەوە، ڕفعەتی مەولانزادە ئەم جارەیان ساڵی (١٩١٤) گۆڤارێکی دیکەی بە ناوی جیهانی پیاوان دەردەکا. یەك لە گەورەترین ئامانجەکانی گۆڤارەکە هێنانە دیی نزیکبوونەوە بووە لە نێوانی جیهانی ئافرەتان و جیهانی پیاواندا، گۆڤارەکە بڵاوکردنەوەی چەمکی (جیهانی مرۆڤ) بەناو کۆمەڵدا بە ئامانج دەگرێ[١٨].

جیهانی ئافرەتان کە لە (٢٨ی مایسی ١٩١٣) دامەزراوە و ئۆرگانی بڵاوکراوەی کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکانی ئافرەتان: (Müdafaa-i hukuk-ı Nisvan Cemiyeti) بووە کە بەرگریی لە مافەکانی ئافرەتان دەکرد کە خاوەنی مافی یەکسانن لەگەڵ پیاواندا. ئەم کۆمەڵەیەی دەرگاکانی بۆ هەموو ئافرەتە عوسمانییەکان دەکاتەوە و بێ ئەوەی جیاوازیی

---

17- Kadınlar Dünjasse och Nurieh Hanoum- En Turkisk Kvinnotidning och dess redaktor, Dagny, no 33, Stockholm, 1913.

(ئەم نووسینەی بە سوێدی نووسراوە، ڕیپۆرتاژێکە لەگەڵ عولییە مەولان کراوە، وا دیارە لە ئەڵمانییەوە وەرگێڕدراوە. چونکە ئەوەی ئەم ڕیپۆرتاژەی ئەنجام داوە یەکێکە لە کارمەندانی ڕۆژنامەی (بەرلینەر تاگەبلات Berliner Tageblatt)ە. نووسینەکە پێشتر لە (فراوان ڕەنسچو Freuen Rundschaw)ی پاشکۆی ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراوەتەوە).

18- Serpil Çakır, Osmanlı Kadın Hareketi, İstanbul, 1994, s.38.

سەرپیل چاکر ساڵی ١٩٩١ لە بارەی بزووتنەوەی ئافرەتانی مەشرووتییەتی دووەم و بزووتنەوەی ئافرەتانی عوسمانییەوە تێزێکی دوکتۆرای ئامادەکردووە و وتارێکی بە ناوی کۆمەڵەکانی ئافرەتانی عوسمانییەوە نووسیوە. بڕوانە:

Toplum ve Bilim no 53, 1991, s.139-157.

لە بارەی عولوییە مەولانەوە، هەندێك زانیاریی بە دوور و درێژی، لەو گوتارەی سەرپیل چاکردا کە بە ناوی: عولوییە مەولان و نەزیهە موحێددین: دوو ناوی ناو مێژووی ئافرەتدا باس کراوە. بڕوانە:

Toplumsal Tarih, no 46, 1997.

ئایین و ڕێبازی ئایین بە بەرچاوەوە بگرێ لە پێناوی هەر هەموو ئافرەتانی عوسمانی لە تێکۆشاندا بووە. بۆ نموونە ئافرەتێکی بەرگریکاری مافەکانی ئافرەتان کە ناوی نەزیهە محێددین بووە رەخنەی لە عولوییە مەولانی ئەندامی ئەکتیڤی کۆمەڵەکە گرتووە. بەوەی کە ئەم کۆمەڵەیە لە لایەن رفعەتی مەولانزادەی هاوسەری عولوییە مەولانەوە دامەزراوە، بەمجۆرە هەوڵی داوە، عولوییە مەولان گچکە بکاتەوە. ئەگەر پێویست بە چڕکردنەوە هەبێ، لە بارەی کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکانی ئافرەتان (جەمعییەتی مودافەعەیی حقووقی نسوان)یش و ئەو گۆڤارەی جیهانی ئافرەتانیش کە کۆمەڵە دەریکردووە ئەو لێکۆڵینەوانەی کراون لە بارەی رەخنە لێ گرتنەوە، رفعەتی مەولانزادە کە رۆشنبیرێکی کوردە. وەکو کەسایەتییەکی گرنگ دێتە بەرچاوان.

لەم گۆڤارەدا کە ناوی جیهانی ئافرەتانە، ناوە ناوە بابەتی ئافرەتانی کوردیان لە بابەتی ئافرەتاندا جێ بۆ دیدو بۆچوونی کوردەکان کراوەتەوە. لە ژمارەیەکی گۆڤارەکەدا روو نەپۆشینی ئافرەتانی کورد و جل و بەرگی ئافرەتان و جیاوازییەکانی لە کوردستاندا سەرنج رادەکێشێ[19].
لەم ساڵانەدا ئافرەتێك (کچێك) بە ناوی (بەلقیس خانم) بۆ یەکەم جار کە سواری فڕۆکە دەبێ بە ئاسمانەکانی ئەستەمبووڵدا دەفڕێ. ئەم بابەتە لەو ساڵانەدا دەبێتە رووداوێکی گەورە. لە ژمارەیەکی دیکەی گۆڤارەکەدا ئەوە رادەگەیەنرێ کە رفعەت مەولانزادەی رۆشنبیری کورد و سورەییا بەدرخان، کەوتوونەتە پەیوەندی کردن بە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و ڕێیان بۆ ئەم فڕینەی بەڵقیس خانم خۆش کردووە. لە بارەی ئەم رووداوەوە لە رۆژنامەی (دیجلە) دا کە لە دیاربەکر دەردەچوو، نووسینی کوردێك دەردەچێ کە ناوی عادل بەگی زولفی زادە بووە. جیهانی ئافرەتان، لە پاشکۆیدا کە بە فڕەنسی بڵاوکراوەتەوە، ئەم نووسینەی رۆژنامەی دیجلەیەی وەکو دید و بۆچوونی کوردەکانی بڵاوکردووەتەوە[20]. لە (١٠٠) ژمارەی گۆڤارەکەدا، لە بارەی ئەو ئافرەتە کوردەی ناوی قەرەفاتمەیە و پێشتر باسمان لێوە کردبوو، نووسینێك لەبارەی ئەو سەفەرەی ئەستەمبووڵییەوە دەردەچێ و لە نووسینەکەدا کورد بوونی قەرەفاتمە دیاردەکا.

19-Aynur Demirdirek, Osmanlı, Kadınlarının Hayat Hakkı Arayışının Bir Hikayesi, Ankara, 1993, s.106.
20- Ce qu’on Pense au Kurdistan du vol de Belkis Hanoum, Kadınlar Dünyası, no 127, 1914.



لە لایەکی دیکەوە وێنەیەکی قەرەفاتمە کە ساڵی (١٨٦٧) لە گۆڤاری ( Le Tour de Monde)دا دەرچوو بوو لەم ژمارەیەدا دەبێتە وێنەی سەر بەرگ.

لە هەندێك ژمارەی ئەم گۆڤارەدا کە ناوی (جیهانی ئافرەتان)ـە ناوە ناوە پەندی پێشینان و قسە بەناوبانگەکان بڵاو دەکرێتەوە، بۆ نموونە لە (١٢٣) ژمارەی (ڕۆژنامەدا!) هەندێك قسەی گرنگی هەندێك لە سیما کوردە ناسراوەکانی وەکو عەبدوڵڵا جەودەت، کامەران بەدرخان و ئەحمەدێ خانی بڵاودەکرێتەوە و لێرەدا ئەحمەدی خانی وەك شاعیرێکی کورد دەناسێنرێ. لە (١٢٢) ژمارەی جیهانی ئافرەتاندا نووسینێکی ئافرەتێکی کوردی بە ناوی (فاتۆ نالی)یەوە دەردەچێ. فاتۆ نالی لە نووسینەکەیدا باس لە کوردێکی بەدیل گیراو دەکا. ئەم کوردە بەستەزمانەی ناوی قاسم بووە لە جەنگی بەڵکاندا بەدیل کەوتووەتە دەست بوڵگارەکان. لە رۆژنامەکەدا وێنەی قاسمیشی تێدایە، ئەو نیگەرانییەی تووشی بووە، لە وێنەکەوە بە روونی دیارە. فاتۆ نالی لە نووسینەکەیدا دەیەوێ سەرنج بۆ ئازاری قاسم و ئەو مرۆڤانەی وەکو قاسمن رابکێشێ.

جیهانی ئافرەتان لە روانگەی ئافرەتی کوردەوە شایەنی ئەوەیە ببێتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی دیکە. ساڵی (١٩٩٤) سەرپیل چاکر لە بارەی جیهانی ئافرەتانەوە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری نووسیوەو بە ناوی بزووتنەوەی ئافرەتی عوسمانییەوە لە ئەستەمبووڵ بڵاوی کردووەتەوە. کتێبەکە لە تێزی بۆ دوکتۆرا ئامادەکراوی سەرپیل چاکر پێکهاتووە. چاکر، لەم لێکۆڵینەوە سەرنجڕاکێشەدا بزووتنەوەی ئافرەتی عوسمانی بە شێوەیەکی بەرفراوان شی دەکاتەوە و بە کورتیش باس لە بزووتنەوەکانی ئافرەتانی کۆمەڵگەکانی ئەتنیکیی دیکەش دەکا. بەڵام لێکۆڵەرەوە بە هەر هۆیەکەوە بێ زۆر باسی هەڵوێستی ئەو ئافرەتە کوردانە ناکا کە لەم ساڵانەدا لە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا دەژیان. لەگەڵ ئەم کەموکوڕییەشدا. ئەم لێکۆڵینەوەیەی سەرپیل چاکرە، بزووتنەوەی ئافرەتی عوسمانی، و بەتایبەتی لە روانگەی ئەوانەوە کە دەیانەوێ ئەم گۆڤارەی بە ناوی (جیهانی ئافرەتان)ەوەیە بناسن، تایبەتمەندیی بوونی سەرچاوەیەکی تا دوا پلە (ڕادەیەکی زۆر) بە سوود بەخۆوە دەگرێ.

کە باس لە بڵاوکراوە وەرزییەکان دەکرێ، دەبێ باسی هەندێك رۆژنامە و گۆڤاری دیکەش بکرێ کە لەم ساڵانەدا لە ئەستەمبوڵ دەردەچوون. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەلێك

گۆڤاری ئافرەتانی عوسمانی لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، لەم بڵاوکراوانەش و لەو ئۆرگانە بڵاوکراوانەی کوردیشدا لە بارەی ئافرەتی کوردەوە گەلێك لێکۆڵینەوەی گرنگ بڵاو دەکرێتەوە. بۆ نموونە، جیهانی ئافرەتان، رۆژی کورد، سیاسەت، ژین، وەك لە سەرەوەش باسمان لێوەکرد، ئەو نووسینەی ناونیشانی قەرەفاتمە لە گۆڤاری جیهانی ئافرەتدا بڵاوکراوەتەوە، لە یەکەمی ئەو نووسینانەیە کە لە بارەی ئافرەتانی کوردەوە نووسراون. ساڵی (١٩١٣) لە گۆڤاری رۆژی کورددا کە لەلایەن کۆمەڵەی هێڤیی کوردەوە دەردەکرا بە ئیمزای (ی.ج. ئەرگەنی-مەعدەنلی- Ergani Madenli y.c.) نووسینێك بە ناونیشانی (دۆزی ئافرەت لەلای کورددا) بڵاوکراوەتەوە. لە نووسینەکەدا شوێنی ئافرەت لە کۆمەڵگەی کوردیدا شی کراوەتەوە و سەرنجی خوێنەران بۆ ئەم بابەتە راکێشراوە. ئەم نووسینە وەکو یەك لەو نووسینە بەراییانەیە کە لە بارەی ئافرەتی کوردەوە بڵاوبوونەتەوە[٢١]. لە ساڵی (١٩١٤) دا ئەم جارەیان لە گۆڤاری سیانەت-دا بە ناوی ئافرەتی کوردەوە نووسینێکی دیکە بڵاوکراوەتەوە. نووسینەکە لە لایەن خەلیل حەمیدەوە نووسراوە. لایەنی سەرنجراکێشی نووسینەکە ئەوەیە بۆ یەکەم جارە یەکە یەکە هەندێك لە ئافرەتە کوردە ناودارەکان دەناسێنێ. بۆ نموونە وەك قەرەفاتمە و دایکی میر محەممەد[٢٢]. بەم جۆرە سەنج بۆ رابووردووی مێژینەی ئافرەتە کوردەکان راکێشاوە. لە ساڵی (١٩١٩) دا لە گۆڤاری ژیندا نووسینێکی مەمدووح سەلیم بە ناوی خانمی کوردەوە

21- ergani-Madenli Y.C., Kürdlere kadın Meselesi, Rojî Kürd, no 4, 1913. (Janet klein, Claiming the Nation: The Origins and Nature of Kurdish Nationalist Discourse-A study of the kurdish Press in the Ottoman Empire, June, 1996. A Thesis Presented to the Faculty of Princeton University in candidacy for the Degree of Master of Arts. S.112).

لە بارەی وەرگێڕانی سوێدیی ئەو وتارەی لە سەرەوە باسی لێوەکراوە بڕوانە:

Malmisanij, En Artikle om kvinnofragani “Rojî Kurd”, Jîn Dergisi no 2-3, Stockholm, 1995.

22- Halil Hamid, Alem-İ Nisvan: Kürt Kadınları, Siyanet, no 16, 1914.



دەرچووە[٢٣]. ئەم چوار نووسینە، لە بابەتی نووسینی مێژووی ئافرەتی کورددا وەکو بەڵگەی بەرایی گرنگییەکی گەورە بە خۆوە دەگرن.

کورتییەکەی لە سەرەتای سەدەماندا (سەدەی بیستەم) لە ئەستەمبووڵ لە سایەی مێدیای عوسمانی و کورددا بابەتی ئافرەتانی کورد، بۆ یەکەم جار سەرنجی گرووپە خوێنەرە دیارەکان رادەکێشێ و دێتە سەر باری بابەتێکی مێدیایی. ئەم بابەتە سەرنجی (جانێت کلێن)ی لێکۆڵەرەوەش رادەکێشێ. لە تێزێکی مارتەردا کە لێکۆڵەرەوە ئامادەی کردووە، ئەو بڵاوکراوە کوردییانەی لە ساڵانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا دەرچوون شی دەکاتەوە و بەشێکی کارەکەی لە بابەتی ئافرەتانی کورددا بۆ ئەو گفتوگۆیانە جیا کردووەتەوە کە لەم بڵاوکراوانەدا دەستی پێ کردووە[٢٤].

## کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد

یەك لە گرنگترینی ئەو هەنگاوانەی لە مێژووی بزووتنەوەی ئافرەتی کورددا بێگومان دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیەیە کە بە ناوی (کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد)ەوەیە، ساڵی (١٩١٩) لە ئەستمبووڵ دامەزراوە. تا ساڵانی (١٩٨٠) ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن چەند کەسێکی کەمەوە هەر بەم ناوە ناسراوە. دوای ئەوەی هەندێك بەڵگە کەوتووەتە روو، خوێنەرێکی زۆر لە بوونی کۆمەڵەکەوە بۆ یەکەم جار ئاگادار بووەوە. بە تایبەتی لە بابەتی ئەوانەی لە ریزی پێشەوەی ئەم کۆمەڵەیەدا بوون هەندێك زانیاریی بیۆگرافیکی نوێ هاتووەتە گۆڕێ، کورتییەکەی دەتوانین بڵێین بوونی کۆمەڵەکە، ساڵانێك دوای دامەزرانی لە لایەن کوردانەوە سەر لە نوێ خرایەوە روو، مێژووی ئەم کۆمەڵەیەی کە سفەتی یەکەم کۆمەڵەی ئافرەتی کوردی وەرگرتووە و بە تایبەتی بیۆگرافیای لە بارەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە و پێویستیی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی دیکە روون و ئاشکرایە، کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد لە داهاتوویەکی نزیکدا پێ دەنێتە تەمەنی هەشتا ساڵەیەوە. دوای ساڵانێکی دوور و درێژ لە

23- Memduh Selim, Kürd Hanımı, Jîn, no 14.
24- Janet klein, Claiming the Nation: The Origins and Nature of Kurdish Nationalist Discourse-A study of the kurdish press in the Ottoman Empire, June, 1996. A Thesis presented to the Faculty of Princeton University in Candidacy for the Degree of Master of Arts.

دامەزرانی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد لە ژیانی کۆمەڵەپەروەریی ئافرەتان لە کوردستاندا بێدەنگییەك چاوەڕوانی دەکرێ، ئەم هەڵوێستە لە روانگەی کوردی ئێرانەوە تا ساڵی (١٩٤٦) و لە روانگەی کوردی تورکیاشەوە تا ساڵانی (١٩٧٠) بەردەوام بووە.

وەك لە پەیڕەو و پرۆگرامییەوە دیارە، ئەم یەکەم کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردە لە ئەستەمبوولدا دادەمەزرێ، بەم هۆیەوە لە مێژووی بزووتنەوەی ئافرەتی کورددا، ئەستەمبوولی وەکو شار گرنگییەکی تایبەتیی هەیە. لە گۆڤار و رۆژنامەی وەکو: ژین، ئیستیقلال، زاریا ڤاستۆکا هەندێك تێبینی و زانیاری کە پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە هەیە، بڵاوکراوەتەوە. یەك لە بەڵگە هەرە گرنگەکان کە لە بابەتی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورددا بەرچاومان روون دەکاتەوە. ئۆرگانی بڵاوکراوەی وەرزانەی کوردییە کە بە ناوی (ژین)ەوەیەو لەو ساڵانەدا لە ئەستەمبوول بڵاوکراوەتەوە. بە قسەی گۆڤاری ژین، بە بۆنەی دامەزرانی کۆمەڵەکە کۆبوونەوەیەك لە ئەستەمبوول دەکرێ و مەولوودنامەیەکی تێدا دەخوێنرێتەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا ئافرەتێك بە ناوی (ئەنجوم یامولکی)یەوە، ئامانجی دامەزراندنی کۆمەڵە و شێوەکانی کار، لە بارەی هەڵوێستی کوردەکانەوە لێدووانێك پێشکەشدەکا. لە ژمارەیەکی دیکەی گۆڤارەوە تێدەگەین کە کۆمەڵە، دەسا.. دەستی بەکارکردن کردووە. نەخۆشخانەی شیشلیی منداڵان، منداڵە کوردێکی زۆری بەبێ پارە خەتەنە کردووە و بەم بۆنەیەوە پیشاندانێکی شانۆیی رێکخراوە. لە بارەی ئەم نواندنە نووسینێکی عەزیز یامولکی لە گۆڤاری (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە[٢٥]. پیشاندانی نواندنەکە بە یەکێك لە کارە رۆشنبیرییە بەراییەکانی کۆمەڵەکە دەژمێررێت. لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری ژیندا، هەندێك نووسینی مەمدووح سەلیم، لە بارەی کارەکانی کۆمەڵەکەش و لە بابەتی ئافرەتانی کوردیشەوە بڵاوکراوەتەوە[٢٦]. عەبدوڕڕەحیم رەحمیی یەك لە شاعیرانی کورد بە بۆنەی کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیەوە شیعرێك بە ناونیشانی (ژ بۆ جڤاتا دایکان) دەنووسێ[٢٧]. وەك بینیمان نووسەرانی کوردی وەك عەزیز یامولکی، مەمدووح سەلیم، عەبدوڕڕەحیم

25- Aziz Yamulkî, Kürt kadınları Teali Cemiyeti'nin Müsameresi Dolayısıyla, Jîn, no 25.
26- Memduh Selim, Kürd Hanımı, Jîn, no 14. Kürdlükte ilericilik Akımları, Jîn; no17. İki Hayırlı Eser, Jîn, no 20.
27- Ebdurrehîm Rehmi, Ji bo Civata Dayikan, Jîn, no 22.



رەحمی، دامەزرانی ئەم کۆمەڵەیە بە رووداوێکی گرنگ دەبینن و پیرۆزباییان لێ کردووە. لە گۆڤاری (ژین)دا هەندێك نامەش بڵاوکراوەتەوە کە لە لایەن ئافرەتانی کوردەوە نووسراون. وەك نامەکانی هـ.عەزیز و تەنێ مۆلازادەی میدیایی. کورتییەکەی، ئەم بەڵگە گرنگانەی لە گۆڤاری (ژین)دا کە لە نێوانی ساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) بڵاو کراوەتەوە، لە بابەتی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد زانیاریی بە سوودمان پێ دەگەیەنن.

داخۆ ئەو (ئەنجوم یامولکی)یە کێیە کە لە کۆبوونەوەی دامەزراندنی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورددا لێدووانێکی ئەنجام داوە؟ محەممەد ئەمین بۆزئەرسلان کە سەرلەنوێ کۆی ژمارەکانی ئەم گۆڤارەی سەر لە نوێ ساڵی (١٩٨٦) بڵاوکردووەتەوە، لەم بارەیەوە دەڵێ: ((داخۆ ئەنجوم یامولکی کێیە؟ مخابن لە بارەی کەسایەتیی ئەوەوە هیچ نازانین. یەك لە کوردە دیار و بەرچاوەکان، مستەفا پاشای یامولکییە، یەکێ دیکەش عەزیز یامولکیی یەك لە نووسەرانی (ژین) بووە. بە رێتێچوونێکی زۆرەوە ئەنجوم یامولکی نزیکی یەك لە مانەیە، لەوانەشە هاوسەری مستەفا یامولکی بووبێ))[٢٨]. ئەم دوا رێتێچوونەی م.ئەمین بۆز ئەرسلان بۆی چووە، راست نەبووە. کە لە بیرەوەرییەکانی عەبدولعەزیز یامولکی ورد دەبینەوە، دەردەکەوێ کە ئەنجوم یامولکی هاوسەری مستەفا پاشا نییە، بەڵکو کچیەتی. هاوسەری مستەفا پاشا، ناوی سەفییە خانمە، هاوسەری عەبدولعەزیز یامولکی ناوی گوزیدە خانمە. هاوسەری مستەفا پاشا، خوشکی سەعید پاشایە، وەکو زانراوە، سەعید پاشا باوکی شەریف پاشای بەناوبانگە[٢٩].

داخۆ کێ سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کوردی کردووە؟ لەم بارەیەوە لە ژمارەی رۆژی (١٩١٩/٧/٩)ی رۆژنامەی سەربەخۆیی (ئیستیقلال)دا هەواڵێکی سەرنجڕاکێش بڵاو دەکرێتەوە، بەپێی ئەم هەواڵە، ئەمینە خانمی هاوسەری شەریف پاشا کە لە پاریس بووە، بە سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد قایل بووە. کۆمەڵە، لە تەلگرافێکدا کە بۆ

28- Jîn dergisinin yeni basımı için M. Emin Bozarslan'ın hazırladığı sunuş yazısı, cilt I, 1985, Stockholm, s.64.
29- Bîrewerîyekanî Abdulaziz Yamulkî (elyazmasıdır, Ferhad Şakelî'nin arşivinde bulunuyor).

ئەمینە خانم نێرراوە، لەبەر کۆشش و هەوڵەکانی سوپاسگوزارییەکانی پێ رادەگەیەنێ[٣٠]. لە ئەنجامی ئەم هەواڵەدا دەتوانین بڵێین، لە بابەتی سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورددا یەك لە چالاکترینی ئەندامانی، ئەمینە خانمە، بۆ ماوەیەکی کورتیش بوو بێ، ئەو بەرپێوەی بردووە. لەو هەواڵەدا کە لە سەرەوە باسی لێوەکرا، بە هەڵە لە جیاتی ئەمینە خانم باس لەوەی کە (لەیلا خانمە) کراوە.

ئەمینە خانم کێیە؟ ئەمینە خانم، نەوەی محەممەد عەلی پاشای قەوالەیی والیی ناسراوی میسرە. باوکی ناوی حەلیم پاشایە، سەعید حەلیم پاشا کە ماوەیەك سەدر ئەعزەم بووە، هەر کوڕی ئەم زاتەیە، واتە برای ئەمینە خانمە. ئەمینە خانم، ساڵی (١٨٦٨) لە قاهیرە هاتووەتە جیهان و لە (١٨٩٠)دا ژیانی هاوسەریی لەگەڵ شەریف پاشا دەست پێ دەکا. لە نێوانی ساڵانی (١٨٩٨-١٩٠٨) لەگەڵ شەریف پاشا کە نێرراوی عوسمانی بووە، پێکەوە لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوێددا دەژی. لەو ماوەیەی لەوێ دەژیا، بە پێودانگێکی گرنگ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بزووتنەوەی ئافرەتی سوێدییەوە. ئەمینە خانم کە کەسێکی بەهێز و توانا بووە، ساڵانی بە خوێندنەوە بەسەر دەبا. بەتایبەتی کارەکانی دوو نووسەری سوێدی و فریدریك بریمەر (١٨٠١-١٨٦١)ی بەرگریکاری مافەکانی ئافرەتان و پرۆفیسۆر ئان-مارگریت هۆلمن (١٨٥٠-١٩٤٠)، زۆرکار لە ئەمینە خانم دەکەن. ئەمینە خانم کە ئینگلیزی و فەرەنسی و سوێدیی وەك زمانی نووسینیش و وەك زمانی ئاخاوتنیش بە چاکی دەزانی، وەکی دی وەکو کەسێکی بە زانست، سەنگین و خاوەن رەوشت دەناسرا. ئەوانەی ئەمینە خانمیان دیوە بە پێداهەڵدانەوە باسی لێوە دەکەن[٣١]. لەگەڵ شەریف پاشای هاوسەریدا ساڵی (١٩٠٩) پێکەوە دەچنە پاریس و لەوێ نیشتەجێ دەبن. شەریف پاشای هاوسەری ئەمینە خانم لە نێوانی ساڵانی (١٩١٩-١٩٢٠)دا وەکو زانراوە لە کۆبوونەوەکانی ئاشتیی سیڤەردا وەك نوێنەری کورد ئەرك بەجێ دەهێنێ و لە فەرەنسا بەرگری لە داواکارییەکانی کورد دەکا. لەم ساڵانەدا کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، پشتگیریی شەریف پاشا دەکا، لە سەردەمێکی وەها ناسکدا ئەمینە خانم

30- Zeki Sarıhan, Kurtuluş savaşı Günlüğü, Ankara, 1993, s.373.
31- Rohat Alakom, Bir kürt Diplomatının Fırtınalı Yılları: General Şerif Paşa, Stockholm, 1995, s. 28-31.



بە پێی رێتێچوونێکی زۆر ئەمینە خانمیش وەکو هاوسەرەکەی ئارەزووی تێکەڵیی دۆزی کوردی دەبێت و بەم هۆیەوە پێشنیاری سەرۆکایەتیی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد قبووڵ دەکا.

وەکو لە سەرەوەشدا بینرا، بە تایبەتی ئەوانەی وەکو مستەفا کەمال یامولکی و ئەندامانی خێزانەکانی ئەو کوردانەی کە لە کوردستانی باشوورەوە هاتبوون، سەعید پاشا، پێشەنگایەتیی بزووتنەوەی ئافرەتی کوردیان کردووە. دوای ساڵانی (١٩٢٠) کەسانی ریزی پێشەوەی کۆمەڵی کورد لە ئەستەمبووڵ، ناچاری کۆچکردنەوە دەبن، بەشێك لەمانە لەگەڵ خاوخێزانیان دەچنە کوردستانی عیراق و لەوێدا نیشتەجێ دەبن. ئەمجارەیان لە روانگەی بزووتنەوەی ئافرەتانی کوردەوە وەکو ناوەندێکی تازەی لێ دێ. بزووتنەوەی ئافرەتی کورد کە لە ئەستەمبووڵ پێکدێ لەم بەشەی کوردستاندا خەباتی خۆی درێژە پێ دەدا. فاتمە مجێددین، لە شاری سلێمانیدا بەناوی (ئەلزەهرا)وە قوتابخانەیەك بۆ کیژە لاوەکان دەکاتەوە. ئەم قوتابخانەیە بە ناوی (دایك)ەوە شانۆگەرییەك ئامادە دەکا. ئەم نواندنە شانۆییە، بە یەکێك لەو نواندنە بەراییانە دەژمێررێ کە لە لایەن ئافرەتانەوە نوێنراوە. گوزیدە خانمی هاوسەری عەبدولعەزیز یامولکی و زەهرا خانمی کچێکی دیکەی مستەفا پاشا لەم قوتابخانەیەدا کاردەکەن[٣٢]. وەك لە سەرەوەش باسمان لێوە کرد، ئەنجوم یامولکیی یەك لە کچەکانی مستەفا پاشا یەکێکە لە رابەرانی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد. کورتییەکەی، ئافرەتانی کوردستانی باشوور رۆڵێکی گەورە لە مێژووی بزووتنەوەی ئافرەتانی کورددا دەبینن.

لە بەڵگەیەکی گرنگی دیکەدا لە بابەتی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورددا، پەیڕەو و پرۆگرامی ئەم کۆمەڵەیە، کە بە ناوی (نیزامنامەی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد)ەوە بڵاوکراوەتەوە بە پێی پەیڕەو و پرۆگرامەکە، کۆمەڵەکە ساڵی (١٩١٩) لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە. بە پێی تێبینییەکی سەر بەرگ پەیڕەو و پرۆگرامەکە لە چاپخانەی جیهانی ئافرەتاندا چاپکراوە کە لە (دیوان یۆلو)دا بووە، وەکو لە سەرەوەش گوتمان گۆڤاری جیهانی ئافرەتان یەکێکە لەو گۆڤارە ناسراوانەی لە نێو گۆڤارەکانی ئافرەتانی عوسمانیدا جێی خۆی کردووەتەوە. بەمجۆرە لە ناو کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد و کۆمەڵەکانی دیکەی

32- Kemal Mezher Ehmed, Çend Rûpel Ji Dîroka Gelê Kurd, Stockholm, çeviren: Elî Şêr, s.719.

ئافرەتانی عوسمانیدا بوونی پەیوەندیی جۆرا و جۆرمان بۆ دەردەکەوێ. پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد بۆ یەکەم جار لە لایەن عەبدولسەتتار شەریفەوە لەو کتێبەدا باس کراوە کە لە بارەی ڕێکخراوە کوردییەکانەوە ئامادەی کردووە و ساڵی (١٩٨٦) لە عیراق لە چاپ دراوە[٣٣]. پەیڕەو و پرۆگرامەکە لە (٤٨) ماددە پێکهاتووە. ماددەی یەکەم دامەزرانی کۆمەڵەیەك بە ناوی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کوردەوە لە ئەستەمبووڵ دەردەخا. لە ماددەی دووەمدا بە شێوەیەکی گشتی ئامانجەکانی کۆمەڵە ریزکراوە. گرنگترین خاڵ کە لەم ماددەیەدا دانراوە ئەوەیە کە پێگەیاندنی ئافرەتانی کورد بە زەینییەتێکی هاوچەرخانە بە ئامانج دەگرێ: ((بەرزکردنەوەی ئاستی ئافرەتانی کورد و دابین کردنی پەرەسەندنی بە چەمکێکی هاوچەرخانە و لە ژیانی خێزانیشدا هێنانەدیی چاکسازییەکی بنەڕەتیی کۆمەڵایەتی، کار پەیدا کردن بۆ ئەو هەتیو و بێوەژنە کوردانەی کە لە ئەنجامی کۆچ پێ کردنی بە تۆبزی و کۆمەڵکوژییەوە تووشی پەرێشانی هاتوون و لە ڕێگەی یارمەتی بە دراو و رزگارکردنیان لە هەژاری)). ئەم ماددەی دووەمەی پەیڕەو و پرۆگرامەکە لە نووسینێکی مەمدووح سەلیمیشدا کە لە گۆڤاری ژیندا بڵاوکراوەتەوە دانراوەتەوە، بەڵام لە نووسینەکەدا ئەوە روون نەکراوەتەوە کە ئەم باسە لە چەندەمین ماددەی پەیڕەو و پرۆگرامەکەوە وەرگیراوە. لەم قسانەوە تێدەگەین کە رۆشنبیرکردنی کورد لەم ساڵانەدا لە دەرەوەی بیرێکی هاوچەرخانەدا، چیی دیکە بیرێکی دی بە ڕێگەیەکی رزگاربوون نابینێ. ئەم خاڵە زۆر گرنگە.. کۆمەڵەکە لە یەکەم پلەدا خزمەتکردنی سێ چینی کۆمەڵایەتی بە ئامانج دەگرێ: کۆچەرەکان، هەتیو و بێوەژنان، لە روانگەی ڕێکخستنی کۆمەڵگاوە ئەم هەنگاوانە بێگومان گرنگییەکی گەورە بە خۆیەوە دەگرێ. لە ماددەی سێیەمی پەیڕەو و پرۆگرامەکەدا کۆمەڵە بەکام ڕێباز درێژە بە کارەکانی خۆی دەدا. باس لە بارەی ئەم بابەتەوە دەکرێ. کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد، زنجیرەیەك کارو چالاکیی وەکو رۆژنامە، گۆڤار، کتێب و نامیلکە بڵاوکردنەوە و قوتابخانە و دامەزراندنی کتێبخانە و کۆنفرانس و وانە گوتنەوە ئەنجامدان بەئامانج دەگرێ. لە کۆتاییی ماددەی چوارەمدا باس لە گرنگیی وشیاریی نەتەوەیی دەکا. لە ماددەی شەشەمدا، باس لەوە کراوە جگە لە ئافرەتانی کورد. ئافرەتانی نەتەوەکانی دیکە، ئەوانەی ڕێزیان بۆ کورد هەیە،

33- Kürt Kadınları Teali Cemiyeti'nin tüzüğünü Osmanlıcadan latin harflerine Ethem Coşkun transkripite etmiştir, kendisine teşekkür ederim.



بۆیان هەیە ببنە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە. لە ماددەی پانزدەهەمی پەیڕەو و پرۆگرامەکەوە تێدەگەین بەڕێوەبەرایەتیی کۆمەڵە کە لەم کەسانە پێکهاتووە: سەرۆك، دوو یاریدەدەری سەرۆك، شەش ئەندامی رەسەن و سکرتێر و بەرپرسی دارایی. بە پێی ئەم ماددەیە دەتوانین بڵێین یەکەم بەڕێوەبەرایەتی کە دامەزراوە، لە (١١) ئافرەت پێکهاتووە. بەداخەوە ناوی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە لە ژێر پەیڕەو و پرۆگرامەکەدا بە نووسین ئاشکرا نەکراوە، ئەم خاڵە، واتە وەڵامی پرسیاری ئەوەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە کێ بوون؟! بەڵکو روونکردنەوە و پێویستیی پتر لێکۆڵینەوە، لەم بارەیەوە لە بابەتە هەرە گرنگەکانە.

سەرچاوەیەکیش کە لە بابەتی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورددا هەندێك روونکردنەوەی تێدایە، رۆژنامەیەکە، ناوی (زاریا ڤاستۆکا)یەو لە تفلیسی پایتەختی گورجستان (جۆرجیا)دا دەردەچێ. لە ژمارەیەکی (کۆمیتەی ئافرەتی کورد)ی ساڵی (١٩٢٨)دا هەواڵێك دەگرێتە خۆ، ئەم هەواڵە دە ساڵ دوای دامەزراندنی کۆمەڵە نووسراوەتەوە، هەواڵەکە لە لایەن کێوە نووسراوە؟ لێرەدا روون نەکراوەتەوە. بەڵام بە ڕێتێچوونێکی گەورەوە لە لایەن کامل بەدرخانەوە نووسراوە، کە لەم چەندانەدا لە تفلیس ژیاوە. چونکە لەم دەمانەدا هەر لەو رۆژنامەیەدا کامل بەدرخان نووسینی دیکە بڵاو دەکاتەوە. کامل بەدرخان لەم ساڵانەدا لە تفلیس دەژیا. دلبەر خانمی هاوسەری لە ساڵانی دامەزرانی کۆمەڵەکە لە ئەستەمبووڵ بووە. ڕێی تێ دەچێ دلبەر خانم، لە ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد بووبێ. یانیش یەکێك بێ لە دامەزرێنەرانی. بەوەی کە لەم هەواڵەدا دیارە، ئەو کەسەی هەواڵەکەی نووسیوە، بەلای کەمەوە کەسێکی ئاگادار بووبێ لە پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەکە. چونکە هەندێك شت کە لەم هەواڵەدایە، نزیکی ئەو شتانەن کە لە پەیڕەو و پرۆگرامەکەدا هەیە. ناوی کۆمەڵەکە لەم هەواڵەدا بە ((کۆمیتە)) ناوبراوە. بە هۆی گرنگیی مێژووییەوە هەواڵەکە لێرەدا هەروەکو خۆی بڵاودەکەینەوە. ((ئەو رووداوە گەورانەی ساڵی (١٩١٩) هاتووەتە گۆڕێ، رۆشنبیرانی کورد بۆ دامەزراندنی چەند ڕێکخراوێکی رۆشنبیری کۆششیان کردووە. یەك لەو هەنگاوانەی بەرەو پێشەوە هاوێژراون، دامەزرانی کۆمیتەی پێشکەوتنی ئافرەتانی کوردە. ئەم کۆمیتەیە، پێکهێنانی ڕێکخستنی هێزو توانای ئافرەتانی کورد و یارمەتیدانیان بۆ گۆڕینی بارودۆخی دارایی و گۆڕینی ژیانی کۆمەڵایەتییان بە ئامانج دەگرێ. وەکی دی، ئامانجەکانی کۆمەڵە، بابەتی یارمەتیدانی کەسوکاری شەهیدان و هەتیو و بێوەژنانیشی تێدایە. بۆ گەیشتن بە

ئامانجەکانیان، کۆمیتە، جگە لە پارە کۆکردنەوە، بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکە و بۆ کردنەوەی سالۆنگەلی خوێندن و کتێبخانە هەوڵی داوە. بەم بۆنەیەوە راپۆرتگەلێك خوێندراوەتەوە. کۆمیتە بۆ ئەنجامدانی پروپاگاندەی بیری پێشکەوتنخواز، لەناو کرێکارانی کورددا لە هەموو بوارەکاندا، هەموو خوێندەوارێکی کورد بە بەرپرسیار دادەنێ. بە پێی پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمیتە، نەك تەنیا ئافرەتانی کورد، هەر بەو شێوەیە خوشکانی خەڵکانی کورد و خێرخوازان و کەسانی میللەتانی دیکە و ئایینی دیکەش دەتوانن لەم کۆمەڵەیەدا ببنە ئەندام. بەڵام کارەکانی ئەم کۆمیتەیە زۆری پێ نەچووە. لەبەر فێڵبازیی نەتەوەپەرستانی کۆنستانتینۆبڵ (ئەستەمبووڵ) و لە رووی لێپرسینەوەی زۆرەوە کۆمەڵە بە هەموو بەشەکانییەوە داخرا))[٣٤]. هەروەها لەم هەواڵەوە ئەوەش تێدەگەین کە کۆمەڵەی تەعالیی ئافرەتانی کورد چەند بەشێکیشی هەبوو بێ.

## هەندێک لێکۆڵینەوەی دیکە

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لە نێو کوردەکانی ئەستەمبووڵدا، ژیانی (کۆمەڵە) خوازی، پەرەسەندنێکی گەورە دەردەخا. دەیان کۆمەڵە دروست کراوە، گۆڕانی گرنگ لەم ساڵانەدا گۆڕانێکی چۆنیەتی بووە. بوونی بەشداریکردنی ئافرەتانی کورد لەم ژیانی (کۆمەڵە) خوازییە و بەشداری لە تەواوی کۆمەڵە کوردییەکانی دیکە، دەبێ بایەخی پێ بدرێ.

لە سەرەتاکانی سەدەماندا (سەدەی بیستەم) سەدان کەسی سەر بە بەدرخانییان لە ئەستەمبووڵ دەژیان، لە کۆتاییدا کۆمەڵەیەك بە ناوی (کۆمەڵەی بنەماڵەی بەدرخانی) دادەمەزرێ. دەبینین هەندێك ئافرەتی بنەماڵەی بەدرخانییان، هەفتانە بەشداریی ئەم کۆبوونەوانە دەکەن. کۆمەڵەکە ساڵی (١٩٢٠) دادەمەزرێ و (١٨) هەژدە کۆبوونەوە ئەنجام دەدا. لە کۆتاییی هەر کۆبوونەوەیەکدا تۆمارێکی کۆبوونەوەکە دەنووسرا. بە پێی ئەم تۆمارە، ئەو ئافرەتە بەدرخانییانەی بەشداری کۆبوونەوەکان بوون، ئەمانەن: عەدەوییە خان، بەلقیس خان، ئەدیبە خان، زەینەب خان، خالیدە خان، نازلی خان، یەکەم کۆبوونەوەی کۆمەڵەی بنەماڵەی بەدرخانییان تەنیا پیاوان بەشدارییان تێدا کردووە. لە دووەم کۆبوونەوەدا، لە لایەن ئەمین عالی بەگەوە پێشنیاری بەشداریکردنی ئافرەتان لە کارەکاندا دەکرێ و هەندێك گفتوگۆ لەم بارەیەوە

34- Kürt kadın komitesi (Rusça), Zara vastoka, no 297, Tiflis, 1928.



بەرپادەبێ. لە کۆبوونەوەی نۆیەمەوە بەشداریی ئافرەتان لەم کۆبوونەوانەدا بەرچاو دەکەوێ. تا دوا کۆبوونەوە، کە هەژدەم بووە، هەندێك لەوانەی ناویان دراوە لە کۆبوونەوەکاندا ئامادەبوون. ئەم کۆمەڵەیە سەرنجڕاکێشەی ژن و پیاو بەشدارییان لە کۆبوونەوەکانیدا دەکرد، دوای ماوەیەکی دیار کارەکانی سست دەکا. ساڵی (١٩٢٢) کۆمەڵەکە دیسانەوە لە لایەن ئافرەتانەوە بەگەڕ دەخرێتەوە و دەژیێنرێتەوە. دوای ئەمە درێژەدان و درێژە نەدان بە کارەکانی کۆمەڵەکە دیار نییە. وەکو زانراوە، زۆربەی نێرینەکانی بەدرخانییان لەم دەمانەدا پایتەخت بەجێ دەهێڵن و وا دیارە کارەکانی کۆمەڵە بە پێودانگێکی گەورەوە بەسەر ئەستۆی ئافرەتانەوە بار دەکرێ[٣٥].

هەندێك ئافرەت لە بنەماڵەی بەدرخانییان هەموو تەمەنیان لە ئەستەمبووڵ بەسەر بردووە. دوای دامەزرانی رژێمی کۆماری، یەك لەم ئافرەتانەی نازناوی چناری لێدەنرێ، نەسرین چنار بووە، کە هاوسەری عوسمان پاشای یەك لە کوڕانی بەدرخان پاشایە. نەسرین چنار کە لە ناوچەی (فەنەر یۆڵۆ)ی ئەستەمبووڵدا دادەنیشت، سەرەڕای ئەوەی نزیکەی شەست و پێنج ساڵ لە ئەستەمبووڵ ژیابوو، فێرە تورکی نەبوو بوو. نەسرین چنار کە ساڵی (١٩٤٩) کۆچی دوایی کرد (٨٠) هەشتا ساڵی تەمەن بوو. عوسمان پاشای هاوسەری (باش مابەینجی)[*٢] بیەتیی سوڵتان عەبدولحەمیدی کردبوو. ئافرەتێکی دیکەی بەدرخانی کە ساڵانێکی درێژ لە ئەستەمبووڵ مابووەوە، هیدایەت خانە. هیدایەت خان کچی عەزیز بەگی بەدرخانی بوو، قوتابخانەی مامۆستایانی (فێرکار) تەواو کردبوو و وەکو فێرکار لە ئەستەمبووڵ کاری کردبوو. هیدایەت خان کە ساڵی (١٩٧٥) مردووە، بە یەکەم ئافرەتی کورد دەژمێررێ کە لە ئەستەمبووڵ مامۆستایی کردبێ. ئافرەتێکی کوردی دیکە، ساڵانی تەمەنی لە ئەستەمبووڵ بەسەر بردووە، مەزییەت چنارە. مەزییەت چناری خوشکی سورەییا، جەلادەت و کامەران بەدرخانە، کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەر پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی مۆدێرنی کورددا بووە، لەگەڵ ئەو کوردانەدا کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان، پەیوەندییەکی گەرم دەبەستێ. ماڵی

35- Mehmed Uzun, Bedirhanilerin Haftalık Aile Toplantıları, 1-11, Özgür Gündem 21-22.3.1994. Aynı şekilde bak. Malmisanij, Cızira Botanlı Bedirhaniler ve Bedirhani Ailesi Derneği’nin Tutanakları, Stockholm, 1995. s.12-39.

[*٢] باش مابەینجی: یاوەری سوڵتان .. (وەرگێڕ).

مەزیبیەت چنار لە تەلارێکی پشت گۆڕستانی رۆمی شیشلیدا بووە، ساڵانی دواتر ماڵەکەی بووە یەکێك لەو شوێنانەی کە ئەو لاوە کوردانەی بۆ خوێندن دەهاتنە ئەستەمبوڵ، هاتوچۆیان کردووە.

نەجیبە خانی کچی خەلیل خەیالیی یەك لە زانایانی زمانی کوردی، دوای ئەوەی کۆلیژی سانت بینوا، کە لە ئەستەمبوڵ بوو تەواوکرد، ساڵانێکی درێژ لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا کاری کردووە. ئافرەتێکی دیکە، کە هەر لەو قوتابخانەیەوە دەرچووە: ((زەهرا بوجاك)ە، زەهرا خانم کە شووی بە مستەفا رەمزی بوجاکی یەك لە رۆشنبیرە کوردەکان کردووە و دواتر لەگەڵ هاوسەریدا لە ئەمریکا گیرساونەتەوە.

وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد، بابەتی پەروەردەی منداڵە کیژەکان بە تایبەتی لە روانگەی بڕی پیاوە خوێندەوار و رۆشنبیرەکانەوە، بایەخێکی گەورە وەدەست دەهێنێ. نوێنەرانی کورد لە ئەستەمبوڵ بۆ دابین کردنی ئەم ویستە، بۆ ئافرەتان تێدەکۆشێ. ساڵی (١٩١٩) لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵەیەکی دیکە بە ناوی- تەعمیمی مەعاریفی کورد و نەشرییات (کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانست و بڵاوکراوەکان)ەوە دامەزراوە، پەیڕەو و پرۆگرامەکەی هەژدە ماددە بەخۆوە دەگرێ پێشنیازی قوتابخانەیەکی شەوانە بۆ کچانی کوردی تێدا کراوە. لە نۆزدە ماددەشیدا باسی پێویستیی کردنەوەی پیشانگایەك دەکا کە، ئەو کەلوپەلانەی تێدا پیشان بدرێن، ژنان و پیاوان بەکاریان دەهێنن[٣٦].

لەم ساڵانەدا، تەنانەت بە تەنیا بەکارهێنانی وشەی ئافرەت لە پەیڕەو و پرۆگرامەکانی کۆمەڵەکاندا، دەبێ بە رووداوێکی گەورەی سەربەخۆی سیمبولئامێز دابنرێ، رێی تێ دەچێ لەم ساڵانەدا کارو لێکۆڵینەوەی کەم ئەنجام درابێ، بەڵام هەنگاوە هاوێژراوەکان و ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون، لە سەردەمی خۆیدا خاوەنی گرنگیی مێژوویی خۆیەتی. لە داهاتوودا کە مێژووی ئافرەتی کورد نووسرا، بێگومان ناوی ئەستەمبوڵ وەکو شار هەر دەبێ یاد بکرێتەوە؟.

* * *

36- Kürd Tamim-i Maarif ve Neşriyat Cemiyeti Beyannamesi, Jîn, no 10.

# بەشی چوارەم

## کۆمەڵەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبووڵ

پیشەی کۆڵهەڵگری (حەماڵی) وەکو دیارە، بە درێژایی مێژوو لە ژینگەی کاردا گرانترین و ماندووکەرەوەترین پیشەیەك بووە. وشەی حەماڵ لە زمانی عەرەبیدا لە (حمل- حەمەلە)وە هاتووە کە واتای هەڵیگرت و هەڵگرتن هاتووە. ئەم پیشەیەی گەلێك جار دیلیێتی بە بیردەخاتەوەو ئەم پیشەیە لە گشت کۆمەڵگاکاندا هەمیشە هەر مرۆڤی چینی هەرە خوارەوە بەجێی هێناوە. ئەم مرۆڤانە بە پارە، بارێك لە شوێنێکەوە دەبەنە شوێنێکی دیکە، لە کۆمەڵگای عوسمانیدا ئازارێکی زۆر دەچێژن. لەبەر ئەم هۆیەیە، لە کاردابێ یان لە ژیانی ناو کۆمەڵدا بێ مرۆڤ کە تووشی هەر کارێکی گران و ماندووکەرەوە، یان کاری کرێ نزم بێ هەر هەموو ناوی (حەماڵی یان حەمماڵییە)ی لێ دەنرێ، بۆ نموونە لە پیشەکانی دیکەدا ئەو مرۆڤانەی شەو و رۆژ بەردەوام کاردەکەن، ئەوەندەی لە بەرامبەر کارەکەیاندا دەست ناکەوێ دەڵێن: ((ئەوەی ئێمە دەیکەین حەماڵییە..)) و هەر سکاڵا دەکەن. بەمجۆرە دەوروبەری کۆڵهەڵگری لە زمانی ئاخاوتنی تورکیدا وەك هێمایەکی چەوسانەوەی لێ هاتووە. کۆڵهەڵگرەکان بۆ گواستنەوەی باری قورس، دەبوو گوریسێکیان هەبێ، بەهۆی ئەم گوریسەوە دەیانتوانی بارەکان بەسەر پشتیانەوە رابگرن لە لایەکی دیکەوە شتێکیان لەسەر پشت دادەنا کە بەرگەکەی پێستەی خۆشەکراو و پڕ دەکرا لە گیا، یان لە کا[*1]. بەمانە دەگوترا کۆڵهەڵگری سەرشان. ئەو بارەی کە دەبوو بیگوازنەوە، ئەگەر زۆرگران بووایە، دارێکی ئەستووریان بەکاردەهێنا و بارەکەیان بە ژێر دارەکەوە دەبەست و بە چەند کەسێك پێکەوە هەڵدەگیرا، ئەمانەش پێیان دەگوترا حەماڵی سرك (داری ئەستوور)، لەگەڵ پەرەسەندنی

[*1] دواتر لە ناو وەرگێڕانەکەدا وشەی (کۆپان)م بۆ داناوە .. (وەرگێڕ)



تەکنیکدا گواستنەوەی کاڵا بۆ کۆڵهەڵگران ئاسانتر دەبێ. لە هەندێ لای ئەستەمبووڵدا کۆڵهەڵگرە کوردەکان کۆپان (پشتەوانە)کانیان بەکارهێناوە و ئەم پیشەیە تا ئێستاش بە شێوەکۆنەکەی درێژەی هەیە. لەم سەردەمانەدا وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆ گواستنەوەی بارە قورسەکان لە سایەی هەنێ مەکینە و ئامێرەوە ئەنجام دەدرێ. بە تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا بەکارهێنانی گالیسکەی دوو چەرخیی گەورەی دەستییەوە باری ئەو کۆڵهەڵگرانەی ئەستەمبووڵ کەمێکی دیکە سووك بووەتەوە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەزاران کۆڵهەڵگری کورد لە ئەستەمبووڵی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا هەبوو. ئەم کۆڵهەڵگرانە بەشێکی زۆری ئەو کۆمەڵە کوردەیان پێکدەهێنا کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان. کرێکاری دیکەی کوردیش هەبوون، لە دەرەوەی پیشەی کۆڵهەڵگریدا کاریان دەکرد، بەڵام ژمارەی ئەوان لە چاو کۆڵهەڵگراندا کەمتر بوو. دەبێ بەم هۆیەوە بێ کە ئەوانیش لەم ساڵانەدا بە کۆڵهەڵگر دەژمێررێن، یان وایان پێ دەگوترا. ئەو کرێکارە کوردانەی لە دەرەوەی کۆڵهەڵگراندا بوون، لە ئەستەمبووڵ کاری چاودێری و فەڕاشی و خزمەتکاری و دارفرۆشی و رەژووفرۆشی و شاگردی و کەناسییان دەکرد، یانیش لە دەزگای بچووك و کارگوزارییەکاندا کاریان دەکرد. تەنانەت لە سەرچاوەکاندا باس لەوە کراوە کە پارتییەکی کرێکارانی کوردیش هەبووە[1]. بابەتی ئەو لاوە کوردانەی لە ناوچەی (وان)ـەوە هاتبوون ناوی (ئەیواز)یان لە خۆیان نا بوو و لە میوانخانە گەورەکانی ئەستەمبووڵدا کاریان کردووە، شایانی لێکۆڵینەوەن. ((ئەو لاوانەی زۆریان لە دەڤەری (وان)ـەوە هاتبوون و بە رەسەن ئەرمەن یان کورد بوون و لە میوانخانە گەورەکانی

[1] نووری دەرسیمی لە بیرەوەرییەکانیدا بێ ئەوەی درێژەی بداتێ باس لە حزبێکی کرێکاران دەکاو دەڵێ: ئەم حزبە یارمەتیی ماددیی کۆمەڵەی قوتابییانی هێڤیی کوردی داوە. بڕوانە:

Nuri Dersimi, Hatıratım, s.42.

لە لایەکی دییەوە لە سەرچاوەکاندا باسی ئەوە دەکرێ، سەرۆکی حزبی کرێکاران رەشید ئاغا بووە:

Tarık Zafer Tunaya, Türkiye’de Siyasal Partiler 11, s.186.

بە پێی ئەم زانیارییانە، دەتوانین بڵێین کۆمەڵە کرێکارێك لە ئەستەمبووڵ هەبووە، زۆرینەی لە کۆڵهەڵگران پێکهاتووە.

ئەستەمبوولدا خزماتیان دەکرد. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا. ژمارەی ئەیوازەکان لە ئەستەمبوولّ تا دەهات پتر دەبوو. بەرامبەر بەمە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمی دوای سالآنی جەنگ، ئەیواز لە میوانخانەکاندا نەمابوون. لە دائیرە فەرمییەکاندا بەم ناوەوە کارگوزار رادەگیران))[2][*2]. دیارە کۆمەڵە کوردێك کە بە گەورە دەژمێررێ، بە بازووی خۆیان گوزەرانیان دەکردو لە ئەستەمبوولّ دەژیان.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە بابەتی ئەو کۆڵهەڵگرە کوردانەی ژمارەیان بە هەزاران بوو، تا ئێستا وەکو ئێمە دەزانین هیچ لێکۆڵینەوەیەك، یان لێ وردبوونەوەیەکی لەبارەوە نەنووسراوە. ئەم مرۆڤانەی هێزێکی دینامیکیان پێکدەهێنا، زۆرجار لە لایەکەوە دەبنە ئامانجی هەندێك هێرشی ئابووری، سیاسی و ئەتنیکی و لە لایەکی دیکەشەوە بە خۆیان لە رووی بێچارەیی و نەزانییەوە ناچاری بەشداریی هەندێك رووداو دەبن لە روانگەی فیزیکییەوە، ئەم مرۆڤانەی لە روانگەی فیزیکییەوە بەهێزن و وەکی دیکە بەتایبەتی لە نەدارییەوە، لە ژێر کاریگەریی نەزانی و ژیانی ئاوارەییاندا، گەلێك جاران بە هۆی لەتلەت بوونیانەوە دەبنە یەکێك لە چینەکانی هەرە ژێرەوەی کۆمەڵ، دەبنە ئامانجی هەموو جۆرە ناهەقییەك. لەبەر ئەم هۆیە نێگەتیڤە، کۆڵهەڵگرەکان مەرجی بەشدارییان لە رووداوەکاندا هەمیشە لە ئارادا بووە. لە بابەتی کۆڵهەڵگراندا لە ناوچە جیاجیاکاندا لەم کێشانەدا لە دووی هەندێك حیساباندا بەرچاو دەکەون. ئەوجا ناچار دەبن بەرامبەر ئەو دنیایەی دوژمنی خودی خۆیانەو بەرامبەر مەرجەکانی ژیان کاردانەوە بنوێنن. هەندێك ناوەند کە بەردەوام کۆڵهەڵگرانی بە جووڵە هێناوەو بەمجۆرە ئەمانەیان کردووەتە داردەستی ئامانجەکانی خۆیان. دەبێ هەمیشە بە بەرچاوەوە نەگرتنی ئەم حیسابانە روون بکرێنەوە. محەممەد تۆفیق-ی سلێمانی (پیرەمێرد)ی شاعیری کورد لە ئەستەمبوولّ ژیاوە، ئەم بارودۆخە دژوارەی وا کۆڵهەڵگرە کوردەکانی تێدا دەژیان، لە

2- Nejdet Sakaoğlu, Tanzimat’tan Cumhuriyet’e Tarih Sözlügü, İstanbul, 1985, s.13.

وشەی ئەیواز بۆ سوککردنەوەی کوردەکانیش بەکارهێنراوە.

(*2) ئەیواز: خزمەتکاری ئاسایی هەمە جۆری دائیرەو میوانخانەکان، بە تایبەتی خزمەتکاری ناو چێشتخانە و سفرەدانان. (وەرگێڕ)



شیعرێکیدا رەنگدەداتەوەو لە رۆژنامەی تەعاون و تەرەققیی کورددا بڵاوی دەکاتەوە کە لە ئەستەمبوولّ دەرچووە:

باوەش بە یەکدیدا گرتن!؟

**شەوێکی تاریك تاریکی، ئێجگار تاریکی میللەت بوو**

**هێشتا کوردەکان، ئەو حەماڵە بەستەزمانە بە نەزانی ماندووانە**

**ئەو بەژن و باڵا مەردانەی بە باری گران ئازاریان چەشتبوو**

**سینەی بەرزی جێی شانازی، شان بە دەستکورتی نەوی[*3]**

هەندێك وشەی ئەوتۆمان بەرچاو دەکەوێ ئاماژە بە چەمکی رێکخستنەوە دەکەن و پەیوەندییان بە کۆڵهەڵگری کوردەوە هەیەو لە ئەدەبییاتدا بەکارهاتووە وەکو: حەماڵ باشی، حەماڵ کەهیەسی، حەماڵ رەئیسی، حەماڵ تەحصیلداری، حەماڵ لۆنجالاری[*4]. لە بارەی خۆرێکخستنەوەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوولەوە، مخابنە کە زانیارییە تەکنیکییەکان و ئەو روونکەرەوانەی بەردەستمان تا دوا رادە سنووردارەو کەمن. بەڵام تەنانەت ئەم روونکەرەوانەش کە لە سەرەوە ریزمان کردن لە نێو خودی کۆڵهەڵگرە کوردەکان بە خۆیان، ئاماژەیەکی ئاشکراو روونە کە ئەم وشە و روونکردنەوانە داب و نەریتئامێزانە چوونەتە ناو رێکخراوی فەرمی و نیمچە فەرمی، یان نافەرمییانەوە. وەك لەمەودوا دەبینین، بە تایبەتی

(*3) دەقی شیعرە تورکییەکە بەمجۆرەیە:

**Kucaklaşma ..**

**…**

**Karanlik, pek karanlikti, milletin bir Karanlik gecesiydi.**

**O mertçe boy- boslar ağir yüklerle incinmişti**

**Kivancimiz yüksek göğüs, omuzlar yoksullukla alçalmişti.**

(*4) لونجا یان لۆنجە: ئەو وشەیە لە لای خۆمان بە شێوەی (لۆج) بەکارهاتووە، وەك (لۆجی سینەما)، لێرە بۆ (بارەگای رێکخراوی کۆڵهەڵگران) یان با بڵێین (بارەگای سەندیکا) بەکارهاتووە ..(وەرگێڕ).

دوای ساڵی (١٩١٨) کۆڵهەڵگرە کوردەکان پتر بە یەکدییەوە دەبەسترێن، هەندێك پەیوەندیی کۆمەڵە پێکهێنان لە نێودا دەستپێدەکا و کەسێتیی ئەتنیکییان بەهێزتر دەبێ.

## ژمارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکان و ئەو ناوچانەی لێیانەوە هاتوون

کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، لەبارەی ژمارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانەوە کە هەر لە پتر بووندا بووە، باس لە ژمارەیەکی پشت پێ بەسراو، تا دواڕادە دژوارو زەحمەتە. ژمارەیان هەزارانی ڕەت کردووە، تەنانەت سەرچاوەی ئەوتۆ هەن کە دەیگەیەنێتە دەیان هەزار. ئەم دیارنەبوونەی لە ژمارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوڵە، لە سەرچاوەی نەبوونی سەرژمێرییەکی گشتیی ئەو کوردانەوە ئاودەخواتەوە کە لەو سەردەمەدا لە ئەستەمبوڵ دەژیان. ئەم بابەتە گەلێك دیدی جودا جودای تێدایە. لە ساڵی (١٩١٨)دا لە نووسینێکدا کە لە بارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانەوەیە، بە ((پێنج شەش هەزار کەسێك))ی داناون[٣]. سەرچاوەیەکی دیکە، وای باس دەکا کە ئەو کوردانەی لە ئەستەمبوڵ دەژیان و زۆربەیان لە کۆڵهەڵگر پێکهاتووە، لە تەك (ئونکاپانی)دا دەژین و ژمارەیان نزیکەی دە هەزار کەس دەبن[٤]. لەم زانیارییە سەرەتاییانەوە دەتوانین بڵێین کۆڵهەڵگرە کوردەکان ئەستەمبوڵ لە نێوان پێنج تا دە هەزار کەس بوون.

هەر لە مێژە، بوونی کۆمەڵە کوردێکی دینامیکی لە ئەستەمبوڵ، لە هەندێك سەرچاوەی دیکەوە تێدەگەین، ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان هەیە، بۆ نموونە بەشداری کردنی عەلی شامل بەگی بەدرخان لەو جەنگەی ساڵی (١٨٧٧) لە نێوان ڕووس و عوسمانیدا بەرپابووە، لە ئەستەمبوڵەوە بە خۆویست نزیکەی سێ هەزار کوردی کۆکردووەتەوەو دەیانباتە جەنگ و زۆری ئەمانە لە جەنگدا دەمرن[٥]. زەحمەت نییە بڕیاری ئەوە بدرێ کە ئەوانەی لەو هێزو تەمەنەدا بوون کە بتوانن بەشداریی جەنگ بکەن، هەر لەو کرێکار و کۆڵهەڵگرە کوردانە بوونە کە لە ئەستەمبوڵ دەژیان. سەعید نوورسی کە یەکێك بووە لە پیاوە ئایینییە کوردەکان، لە

3- İstanbul'da Kürd İşçileri, Jîn, no 25, 1918-1919. Arap harflerinden latin harflerine çeviren: M.Emin Bozarslan, Uppsala, 1988.
4- Metin Toker, Şeyh Said ve Isyani, Ankara, 1966. s.59.
5- Nazmi Sevgen, Doğu ve Güneydoğu Anadolu'da Türk Beylikleri, Ankara, 1982. s.119.



سەرەتای سەدەی بیستەمدا تێکەڵی کۆڵهەڵگران بووەو لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەر بووە بۆ گیروگرفتەکانیان، ژمارەی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوڵی لە شوێنێکدا بە بیست هەزار و لە شوێنێکی دیکەدا بە چل هەزار دادەنێ[٦]، بەشێکی زۆری ئەو کوردەی لە ئەستەمبوڵ بوون کۆڵهەڵگرەکان پێکیان دەهێنا، ئەم ژمارانەی سەعید نوورسی ڕایگەیاندوون، بە ڕێتێچوونێکی زۆرەوە لە ژمارەی کۆڵهەڵگران پتر، دەبێ ژمارەی هەموو ئەو کوردانە دەربخەن کە ئەو دەمانە لە ئەستەمبوڵ ژیاون. چونکە ئەم ژمارانە گەلێك بەرز دێنە بەرچاو.

لەو ساڵانەدا لە هەموو لایەکی ئەستەمبوڵدا کۆڵهەڵگر هەبووە، تەنانەت لەو نامیلکانەدا کە بۆ توورێستان (گەڕیدەی گەشت و گوزار) بڵاودەکرانەوە، ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە لە سەر هەر شەقامێکی ئەستەمبوڵدا کۆڵهەڵگر پەیدا دەبن. ئەسکەلەی ڕۆخ دەریاکان و دەروازەکانی گومرگ، گۆڕەپانەکان، سەرە کۆڵانان، قاوەخانەکان، چەشمەو[*٥] بەردەمی مزگەوتان، جێی سەردانی کۆڵهەڵگران بوون. کۆڵهەڵگرە کوردەکان لە گەڕەك و ناوچەکانی وەکو: گەدك پاشا، ئونکاپانی، غەڵەتە، سرکەجی و شوێنانی دیکەی ئەستەمبوڵدا دەژیان. لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە شوێنانێك کۆبوونەتەوە چاوەڕێی کاریان کردووە. لەم ساڵانەدا بڕە کوردێکی گەورەی دەستکورت لە ئەستەمبوڵ هەبووە: ((مزگەوتی بەشکۆی سینان پاشا، وەك دەمی ئەشکەوتێکی بێ دەرگا، بە دەروازەی گەورەیەوە فەرمانی بەسەرمەیداندا رادەگەیی. لە یەکەم تیشکی خۆری بەیانەوە تا تاریکیی شەو، سەرتاسەر ئاپۆرە جۆشی دەدا. هەموو بە پێوە، شان بە شان، لەو شەقامەدا کە هەر لە (بێشکتاش)ـەوە تا (ئۆرتەکوێی) درێژەی هەبوو، تا قەرە قۆڵی[*٦] حەسەن پاشا، لە دوو لایدا تەنانەت چەشمەکانیش هەر بە سەر پێوەبوون. ئەم چەشمانە ئەوەی لای دەستە ڕاستیان بە حەنەفییە بوو، ئەوەی لای چەپی بێ حەنەفییە بوو، شەو و ڕۆژ ئاوی لێ دەچۆڕا. ترامواییەکان دە پانزدە دەقیقە جارێك، بەخۆ لە گیاوگۆڵ پاراستنەوەوە ڕەت دەبوون، شەوانە نەکو لەسەر هێڵە ئاسنینەکانی نوقمی گیادا مرۆڤێك هەبێ، بۆ ئەوەی ڕێ چۆڵ

6- Bediüzzaman Said Nursi, Divan-i Örfi-İki Mekteb-i Musibetin Şehadetnamesi, İstanbul, 1992, s.10.

(*٥) چەشمە: سەرچاوە، کانی، لێرە ـ مەبەست لەو حەوزە بە بۆڕی و حەنەفییە (شێرە)یە یە بە زۆری لە مەڕمەڕ وەك بەشێکی هونەری بیناسازی، بۆ کاری خێر بنیات دەنرێ.. (وەرگێڕ).

(*٦) قەرەقۆڵ: جێی حەسانەوەی سەربازی دەورییە (وەرگێڕ).

بكرێ، زەنگی لێ دەدا. زۆربەی مرۆڤی ناو ئاپۆرەكان كورد بوون، كوردی ویلایەتەكانی ئەرزەرۆم، بتلیس و وان، بە جلوبەرگی تایبەت بە خۆیان، شەرواڵی بەرینی رەنگاو رەنگ، سەڵتەی كورتی دیسانەوە رەنگاو رەنگ، جلی تازەپۆشیان لە نێودا وەك نەبێ وا بوو، شەرواڵەكانیش و سەڵتەكانیش بە پینەی هەموو رەنگێك پینە كرابوون. چاوەڕێی ئەوەیان دەكرد بانگ بكرێن بۆ كار. هەر كارێك بێ بابێ ..))[٧].

لە هەموو لایەكی كوردستانەوە كۆڵهەڵگر دەڕژانە ناو ئەستەمبووڵ و بەشی زۆری ئەمانە لە ناوچەی وەكو: ئەرزەرۆم و بتلیس و وان و مووش و ئەلازگەوە دەهاتن، لە ئەستەمبووڵ كۆڵهەڵگرە ئەرمەنییەكانیش هەر لە نزیك ئەو ناوچانەوە دەهاتن، ئەو ئەرمەنی یان كوردانەی لەوە پێشتر چوونەتە ئەستەمبووڵ، دواتر كە سەریان لە شارەكانی خۆیان دەدایەوە، بە ئاگاداركردنەوەی مرۆڤانی ناوچەكانی خۆیان لە بوونی هەلومەرجی كاركردن لە ئەستەمبووڵ، زەمینەیان بۆ دروستكردنی كۆلۆنیلە (جالیە)ی هاوشاری خۆش دەكرد. هەندێكیان لە مانگەكانی زستاندا بۆ كاركردن دەهاتنە ئەستەمبووڵ، هەندێكیشیان تا پڕكردنەوەی پێویستییە بنەڕەتییەكانیان. بۆ نموونە: دوو سێ ساڵ لە ئەستەمبووڵ دەمانەوە. كۆڵهەڵگری كوردی وەك زارۆ ئاغا یەك لە نموونەی هەرە كۆنەكانیان، كۆڵهەڵگری دیكەش هەن كە ژیانیان لە ئەستەمبووڵ بەسەر بردووە. لەبەر ئەوەی كوردەكان و ئەرمەنییەكان كە هەر یەكەیان لە ناوچەی خۆیەوە هاتبوونە ئەستەمبووڵ، مرۆڤگەلی ناو كۆمەڵی هەردوو لایان بەمجۆرە رێی ئەستەمبووڵیان بە یەكدی پیشان دەدا و هەندێك راسپێرییان لە بارەی كاركردن و مەرجەكانی كارو ژیانەوە لەم شارە گەورەیەدا بە یەكدی دەكرد. كورتییەكەی ئەوەیە كە، لە نێو خەڵكی ئەو ناوچانەدا تۆڕێكی چالاكی سەرزارەكیی هەواڵ و زانیاری لە بارەی ئەستەمبووڵەوە پێكهاتبوو.

### هەندێك دیمەن كە پەیوەندییان بە كۆڵهەڵگرانەوە هەیە

ئەو دیمەنە رەنگاو رەنگ و زیندووەی ژیانی ناو كۆڵانی ئەستەمبووڵی كۆن پیشانی دەدا، سەرنجی ئەو گەڕیدانەش رادەكێشێ كە سەر لە ئەستەمبووڵ دەدەن، فرۆشیارە گەڕۆكەكان، دەرۆزەكەرەكان، كۆڵهەڵگرەكان، دەروێشەكان، سەگە بێ خاوەنەكان، ئەمانە بابەتە هەرە

7- Hagop Mıntzuri, İstanbul Anıları 1897-1940, İstanbul, 1993, s.35.



بەرچاوەكانن كە ئەم ژیانی ناو ئەو كۆڵانانە پێكدەهێنن. لە سەرووی ئەو كۆمەڵانەوە وا ئازارێكی زۆر گەورەیان چەشتووە كۆڵهەڵگرەكانن. ئەو كۆڵهەڵگرانەی باری وایان لەسەر شان هەڵگرتووە كە تاڕادەی باوەڕ نەكردن قورس و گران بووە، ناوی ((هەرقل- هێركول)) یان لێ دەنرێ. ئەو گەڕیدانەی وا باری كۆڵهەڵگرێكیان دیوە، بە یەكجار بە چوار مرۆڤ ئەو بارە هەڵنەگیرێ، بەرامبەر ئەم دیمەنە بە حەپەساوی رادەوەستن. ئەو كۆڵهەڵگرانەی پیانۆیەكی گران بە یەك جووڵە لە كۆڵی دەگرن و رەوتی ناو كۆڵانانی ئەستەمبووڵیان، ئەو كۆڵهەڵگرانەی لە ژێر بارەگرانەكاندا پلیشانەوەو گۆڕانی ئەناتۆمیك (پێكهاتەی تەنی مرۆڤ و شێوەی) جەستەییان، بەتایبەتی ئاوسانی ئەو دەمارانەیان گەیشتووەتە پلەی تەقینەوە، بیەوێ و نەیەوێ سەرنجی مرۆڤەكانی ئەستەمبووڵ رادەكێشێ. هەندێك گەڕیدە ناو لەو كۆڵهەڵگرانە دەنێ ((كەرگەلی مرۆڤانە)).

بیرگەر مۆرنەر ناوێكی سوێدی گەڕیدەیەكی دیپلۆمات بووە، تێكەڵی كۆڵهەڵگرە كوردەكان بووەو لە نزیكەوە لە كاتی دەستبەتاڵییان وردبووەتەوە، ئەو بارانەی كۆڵهەڵگران هەڵیانگرتوون بەو رادەیە بە گرانیان دادەنێ كە ((پشتی گایەك دەشكێنن)). بیرگەر مۆرنەر ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو هەڵپەڕكێیانە پەیدا دەكا كە كۆڵهەڵگرە كوردەكان بۆ رەواندنەوەی ماندوویەتییان شەوانە لە مانگی رەمەزاندا لە قاوەخانەیەكی ئەستەمبووڵ ئەنجامیان داوەو ئەم هەڵپەڕكێ كوردییانە بە دانسەكانی ((زارداناس))ی (كەتالۆنیا)ییان دەشوبهێنێ[٨].

ئەوەی كۆڵهەڵگران دەیانگواستنەوە تەنیا باری بێ گیان و كەلوپەل نەبووە. لەو ساڵانەدا بەتایبەتی لەو سەردەمەدا كە گواستنەوەی بە كۆمەڵ پەرەی نەسەندبوو، كۆڵهەڵگران لە پاڵ ئەم كارانەدا، نەخۆش و ناتەواو و بەساڵداچووان و منداڵانیان بە كۆڵ لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە دەبرد. ئەمانە، خالیدە ئەدیب ئادیواری نووسەری ناوداری توركیشیان تێدا بووە. لە بیرەوەرییەكانیدا ئەم بابەتە بەمجۆرە دێنێتە زمان: ((بیرم نایێ چۆن منی لە بێشكتاشەوە تا سەرپردەكە هێنایە خوارێ. بەڵام لە پردەكەدا كە منی دایە باوەشی كۆڵهەڵگرێك، شەرمێكی ئەوتۆی هەرگیز لە بیرنەچووەوەو هەست بە بچووكیی لە ناخمدا ورووژاند. رێگایەكی زۆر تا سولەیمانییە، بەتایبەتی شەرابی وەك مەرجان و هەورازێكی رك هەبوو. ئەوسا دایە گەورە كەمنی دەبردە جێیەك یا بە تراموایی بە ئەسپ یانیش سواری

8- Birger Mörner, Under Halfmänen, Stockholm, 1906. s.79-80.

گالیسکەی دەکردم. لە بەرزاییەوە سەیری ئەو منداڵانەم دەکرد کە لە باوەشی کۆڵهەڵگرەکانمدا دەبینین، لەو رۆژە بە دواوە بەرامبەر بە منداڵانی باوەشی کۆڵهەڵگران هەستم بە خۆشەویستییەکی زۆر نزیك کرد. کۆڵهەڵگرەکە باڵابەرز، گەنمڕەنگ، بەڵام بە هەر بارێکدا بێ کوردێکی دڵنەرم بوو. هەروەها دەستی بە روومەت و قژمدا دەهێنا، هەوڵی دواندنمی دەدا. تەنانەت لە شوێنێکدا وەستا، ئەگەر باجی رێی بدایە لە کیسەی بەستەزمانی خۆی تەنانەت شەکریشی بۆ دەکڕیم. بۆنی ئارەقەی ئەو لەشە درشتەی لووتی پڕکردم، تەنانەت خۆشەویستیی سەر نێوچەوانی ئەو پیرەمێردەش راینەکێشام. کەوتبووە هەڵوێستێکی وەها رێزشکێنەوە، لە ناخمدا شەرمێکی وادایگرتبووم، وەکو بڵێی هەموو ئەستەمبووڵ هاتووە بۆ سەیرکردنی من، بە هەموو توانامەوە قێزم لەم کۆڵهەڵگرە دەهاتەوە، کەچی ئێستا، لە ئاستی ئەو و ئەوانەی لەو دەچن، ددان درشت و ئاژەڵانە، ناوەوەی سادە، بەڵام ئافەریدەی مرۆڤایەتی دەگەیەنن هەست بە نزیکییەکی زۆر زۆر دەکەم))[9].

## لەناوبردنی کۆڵهەڵگرە کوردەکان - ساڵی (١٨٢٦)

بە شێوەیەکی دروست، نازانین کۆڵهەڵگرە کوردەکان کەی هاتوونەتە ئەستەمبووڵ، بەڵام سەرچاوەی جیاجیا باسیان لەوە کردووە کە کۆڵهەڵگرە کوردەکان لە سەدەی هەژدەهەمەوە لە ئەستەمبووڵدا هەبوون. ئەو کوردانەی بۆ یەکەم جار وەك کۆمەڵ پێیان نابێتە ئەستەمبووڵ، دەتوانین بڵێین کۆڵهەڵگرەکانن. ساڵی (١٨٢٦) کە وەجاخی یەنیچەری لەناو دەبرێ، چەند کۆڵهەڵگرێکی کوردی تێدا ناونووس کراوە، لە چەند یاخیبوونێکدا وەك هێزی دەستوەشێن لە ریزی پێشەوەدا شەڕیان کردووە. بە لە ناوبردنی وەجاخی یەنیچەری لە ساڵی (١٨٢٦)دا، کۆڵهەڵگرە کوردەکان بە پێودانگێکی بە بایەخ کاریان لە دەست دەدەن و ئەو کاریگەرییەی بە درێژایی ساڵانێکی درێژ هەیانبووە نامێنێ[10]. کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییەکان جێی کۆڵهەڵگرە کوردەکان پڕ دەکەنەوە: ((هەموو کۆڵهەڵگرە تورك و کوردەکان لە لۆنجەکانیان (بنکەی رێکخستنی کار) دەکران و بەشێکیان بەوەی کە جارێکی دیکە نابێ بێنەوە

9- Halide Edib-Adıvar, Mor Salkımlı Ev, İstanbul, 1992, s.45.
10- Donald Quataert, Osmanlı İmparatorluğunda İşgücü politikası ve siyaset: Hamallar ve Bâbiäli 1826-1896, Tarih ve Toplum, no 33, 1986.



ئەستەمبووڵ یەکسەر بە کەشتی گوێزرانەوە بەری ئاسیا))[11]. بەڵام هەن لەگەڵ ئەم دیدو بۆچوونەدا نین: ((لە گۆڕێدا نەهێشتنی تەواوی کۆڵهەڵگرە کورد و تورکەکانی پایتەخت دەبێ راست نەبێ، بەڵام لەبەر پەیوەندیی نزیکیانەوە بە یەنیچەری و بەکتاشییەکان، بە ئاشکرا دیارە ئەو کارانەی بە دەستیانەوە بووە لە دەستیان داون))[12]. عەبدولحەمید کە ساڵی (١٨٧٦) دەسەڵاتی گرتووەتە دەست کە بیر لە سیاسەتی (کورد- ویست= Pro-Kürt)ی دەکەینەوە، سەردەمێکی وا درێژخایەنی ئەستەمبووڵی پایتەخت بەشیاو نابینین کە لە رووی کۆڵهەڵگرە کوردەکاندا داخرا بێ.

## رژانە ناو ئەستەمبووڵی (١٨٩٦)ی کۆڵهەڵگرە کوردەکان

ئەو رووداوەی لە لایەن بەشێك لە شۆڕشگێڕە ئەرمەنییەکانەوە لە (٢٦ی ئابی ١٨٩٦)دا بە هێرش بردنە سەر بانکی عوسمانیی لای غەڵەتە دەستی پێ کردووە گەلێك خوێناوی کۆتایی دێ. هەزاران ئەرمەنی، بەتایبەتی گەلێك لەو کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییانەی لە ئەستەمبووڵ لە کارکردندا بوون دەکوژرێن. جێی ئەو کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییانەی کوژراون یان کاریان بەجێ هێشتوون و هەڵاتوون کۆڵهەڵگرە کوردەکان پڕیان کردووتەوە. کۆڵهەڵگرە کوردەکان کە ساڵی (١٨٢٦) جڵەوی پیشەی کۆڵهەڵگرییان لە دەست دابوو، بەمجۆرە دوای (٧٠) حەفتا ساڵ لە ساڵی (١٨٩٦) دیسانەوە دەست بەسەر ئەم پیشەیەدا دەگرنەوە[13]. بە تایبەتی کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەو کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییانە دەهێنرێ کە بە چڕی لە کومکاپی (قومقاپی)دا هەبوون[14]. کۆڵهەڵگرە کوردەکان کە لە لایەن عەبدولحەمیدەوە هێنرابوونە ئەستەمبووڵ، وەکو هێزێکی سیاسی بەرامبەر ئەرمەنییەکان دادەمەزرێنرێن و ناوی کۆڵهەڵگرە کوردەکان لە مێدیای جیهاندا بە خراپە باس دەکرێ. ئەو شۆڕشگێڕە ئەرمەنییانەی پەلاماری بانکی عوسمانی دەدەن، دواتر رێیەك دەدۆزنەوەو بۆ یۆنانستان هەڵدێن. ئەو رووداوانەی لە (٢٦ی ئابی ١٨٩٦)دا دەست پێ دەکا، چەندین رۆژ درێژە دەکێشێ، هێرشی دژ بە ئەرمەنییان بۆ گەلێك ناوچەی شار دەتەنێتەوە. رۆژنامەکانی (٢٨ی ئاب) ژمارەی کوژراوان بە هەزار تۆمار

11- Tarih ve Toplum, no 33, 1986.
12- Tarih ve Toplum, no 33, 1986.
13- Edwin Pears, Forty Years in Constantinople, london, 1916. s.162.
14- Edwin Pears, Life of Abdul Hamid, London, 1917, s.257.

دەکەن[١٥]. لە دەمە دەمی ئەم رووداوەدا ژمارەی ئەو کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییانەی مردوون یان ناچاری بەجیٚ هێشتنی کارەکانیان بوون لە نێوانی (٤٠٠-٥٠٠) بووە[١٦].

ساڵی (١٨٩٦) ئەوانەی بەشدارییان لەم رووداوە کردووە، تەنیا کۆڵهەڵگرە کوردەکان نەبوون، کۆڵهەڵگرە تورکەکان و مرۆڤی کەمینە موسڵمانەکانی دیکەش بەشدارییان لە رووداوەکە کردووە، بەتایبەتی ئەو ناوەندە رەسمی و سەربازییانەی ئەم رووداوەیان بە هەل زانیوە، بە مەبەست پشتگیریی ئەم هێرشانەیان کردووە کە دژ بە ئەرمەنییان لە ئەستەمبووڵ پەرەی سەندووە. بەڵام دیسانەوە ئەوەی بەدناو دەبیٚ دیسانەوە هەر کوردە. لەم ساڵانەدا باوێکی دژە کورد دەست پیٚ دەکا و بە ئەوروپادا بڵاودەبێتەوە. ماریا یۆردانیدو، لە رۆمانیکیدا کە بە ناوی (لۆکساندرا)یەو تێیدا ئەستەمبووڵی کردووەتە بابەت، باسی ئەو ((کوردە دەست بە تەورانە دەکا کە سوڵتان عەبدولحەمید لە کوردستانەوە هێناونی))، بەڕای نووسەر، ئەم کوردانە بەرامبەر ئەرمەنییەکان وەك هێزێکی دەستوەشێن، بەکارهێنراون. ئەم کوردانەی دارکەر بوون و لە ئەستەمبووڵ کاریان دەکرد، نووسەر لە رۆمانەکەیدا بەمجۆرەیان باس دەکا: ((لەگەڵ بەیاندا سی پێودانگی هێزم (داری سووتەمەنی)ی ئەستووریان رشتووەتە ناوەڕاستی کۆڵانەوە، دواتریش دەسرۆکەیان بە دەوری فێستەکەیاندا بەستووە، کوردگەلی مەچەك بە هێزی وەك دێو، بە تەورە بریقەدارە تیژەکانیان بۆ بڕینەوەی دار هاتوون، کورد مەراقی تەورەکانیانن، لە گوندەکانی کوردستانیانیشدا کورد تەورەکانیان لە خۆیان دوور ناخەنەوەو کە دەچنە دوور وڵاتییش، ئەوانە وەك ئەو ئافرەتە (ئسپارتەیی)یانەی مەتاڵیان دەدایە رۆڵەکانیان، تەوریان دەدەنە دەست. منداڵە کورد کە دەگەنە چواردە، پانزدە ساڵان کە هەست بە یەکەم هەڵچوونەوەی لاوێنی دەکەن، گوڵ ناگریٚ بەدەستەوە، ئەگەر تەورەکەی دەنێتە سەرشان و هاوار دەکا و دەڵیٚ: دەردم هەیە دەرد..و دەست دەکا بە گەڕانی گەڕەکەکان، بە پەنجەرە بە قەفەسەکاندا دەڕوانیٚ، ئەو کچەش کە قایل بیٚ ببێتە دەرمانی دەردی، پەنجەرەی دەکاتەوەو دەڵیٚ: ((دەبمە قوربانی دەردت)) و وەڵامی دەداتەوە. ئەو داواخوازەی ببێتە زاوا کە دەیوت، لەسەر ئەمە (منیش تەورەکەم لێرە دەدەم)، تەورەکەی بە دەرگای ماڵی کیژەدا

15- Revolten i İstanbul, Svenska Dagbladet 19.8.1896.

16- Donalt Quataet, Osmanlı İmparatorluğunda İşgücü Politikası ve Siyaset: Hamallar ve Babiãli, Tarih ve Toplum, no 33, 1986.



دەوەشێنیٚ. دوایی دەچێتە ماڵەوەو بۆ گەڕاندنەوەی تەورەکە، دایکی دەنێرێت و لەم هەلەدا دایکەکە، کچەش دەبینیٚ. تەور بۆ کورد چەمکێکی گەورەی هەیە. قسە بە تەوری کورد گوتن لە قسە بە پێغەمبەرەکەی وتن خراپترە))[١٧].

لە ئەنجامی ئەم رووداوانەی کوتەکی بە تایبەتی لە (ئەتۆلیە)کانی تەلار (سەرا)ی یڵدزدا ئامادەکراوی تێدا بەکارهێنرابوو، سوڵتان عەبدولحەمید ناوی (سوڵتانی سوور)ی لیٚ نرا[١٨].

کۆڵهەڵگرە کوردەکان لە نزیکەی سەد ساڵێك لەمەوبەرەوە دەسەڵاتی پیشەی کۆڵهەڵگرییان بە دەست خستبوو، وەکو لەمەودواش دەبینین لە سەرەتای سەدەی بیستەمماندا جارێکی دی دەبنە قوربانیی فشار و پیلانی جۆراو جۆری دیکە.

## چاوشکاندنە گەورەکەی (١٩٠٦)

لە ئەستەمبووڵ کە رووداوێك بەرپا دەبیٚ، وەك بزنی بەستەزمان ئەوەی یەکسەر بەبیردابێتەوە، کۆڵهەڵگرە کوردەکانە. ساڵی (١٩٠٦) لە رووداوەکەی کوژرانی ریدوان پاشای سەرۆکی شارەوانی وا پیشان درا، کە لە لایەن بەدرخانییانەوە ئەنجام دراوە. لە ئەنجامی رووداوەکەدا کوردێکی زۆر دەگیرێن. لە ناو ئەمانەدا کۆڵهەڵگر و تەحصیلدارانی[*٧] کۆڵهەڵگرانیش هەبوون[١٩]. وا دانراوە کە ئەو چەکدارانەی ریدوان پاشایان لە (گوێزتەپە)دا کوشتووە، بەتایبەتی لە لایەن بەدرخانییان، عەلی شامیل پاشا و عەبدوڕڕەززاق بەگی برازایەوە چەکیان دراوەتیٚ و پشتگیرییان لیٚ کراوە.

کوژرانی ریدوان پاشا بووە هۆی هەڵکردنی رەشەبایەکی تیرۆر بەسەر بەدرخانییاندا کە ژمارەیان لە ئەستەمبووڵ گەلێك زۆر بووە. گەلێك لە بەدرخانییان کە عەلی شامیل پاشا لە ریزی پێشەوەیاندا بووە بەرەو تەرابولسی خۆراوا (لیبیا) دوورخراونەتەوە. نەك تەنیا و هەر بەدرخانییەکان، ناوی کوردی دیکەش کە لە ئەستەمبووڵ دەژیان تێکەڵی رووداوەکە کراوەو هەندێك لەمانە سزای قوڕسیان بەسەردا دراوە. لە ناو ئەوانەدا کە حوکمی لە سێدارەدانیان

17- Maria Yordanidu, Loksandra-İstanbul Düşü, İstanbul, 1990, s.115.

18- Michel de Gréce, ll. Abdülhamid-Yıldız Sürgünü, İstanbul, 1995, s.221.

[*٧] تەحصیلدار: کۆکەرەوەی باج و داهاتەکان (وەرگێڕ).

19- Nazmi Sevgen, Doğu ve Güneydoğu Anadolu’da Kürt Beylikleri, Ankara, 1982, s.125.

بەسەردا دراوە، هەندێك كوردی خەڵكی وان و بتلیس و هەكاریشیان تێدایە. نازانین ئەمانە كۆڵهەڵگربوون یان نا، بەڵام ئەو سەرچاوانەی بابەتەكەیان باس كردووە، روون كردنەوەی وەك: ((بەشداربوونی گەلێك كۆڵهەڵگری كوردیش)) یان تێدایە[٢٠].

لە ئەنجامی ئەم رووداوەدا لە ئەستەمبووڵ ئەو راوە بەردەوامەی دژە كوردە، تا دوا رادە گشتگیر دەبێ. خەتا لە كەسایەتیی تاكەوە دەردەچێ، كە دەڕوانینە قەوارەی دوورخستنەوەكان.

بە خاو و خێزانەوە، پێكەوە بە كۆمەڵ سزادانی ئەو پێشەوا كوردە گرنگانەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان بەرچاو دەكەوێ. ئەم بارودۆخە لە سیاسەتی بەرامبەر بە كوردی سوڵتان عەبدولحەمیدەدا خاڵێكی گرنگە. ئەو تێزەی لە شێوەی ((پاراستنی كوردان لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە)) كە لە سەرچاوە جیاجیاكاندا باسكراوە، بەمجۆرە روون دەبێتەوە كە، چی دەگەیەنێ. بە گشتی ئەو كۆمەڵە كوردەی لە ئەستەمبووڵ دەژیان و بەتایبەتیش ئەو كۆڵهەڵگرە كوردانەی لێرە دەژیان، كاریگەریی خراپی ئەم رووداوەی كە بۆ كۆڵهەڵگرە كوردەكان بە گران كەوتەوە، تا لە ساڵی (١٩٠٨)دا دوای ئەوەی مەشرووتییەتی دووەم جاڕدەدرێ ئینجا لە ناوەوە هەڵدەگیرێ. ئەم فشارانەی ساڵی (١٩٠٦) بەرەتبوونەوەی كات و لە ناو كوردەكاندا بۆ پەرەپێدانی دژایەتیی سوڵتان عەبدولحەمید، كاریگەریی دەست پێ دەكا.

## هەندێك هەوڵی بایكۆتی[*٨] كۆڵهەڵگران

ساڵی (١٩٠٨) نەمسا هەندێك لە خاكەكانی عوسمانی، بۆسنەو هەرسەك. دەخاتە سەر خاكی خۆی و لە ئەنجامدا پەیوەندییەكانی نەمسا- عوسمانی بەرەو خراپی دەچن و لە ئەستەمبووڵ بەرامبەر بە كەلوپەلی بازرگانیی نەمسا بایكۆتێك دەست پێ دەكا. بە لای ئیتتیحادییەكانەوە ئەم كردەوەیەی خراوەتە گۆڕێ، ئەو كۆڵهەڵگرە كوردانەی لە ئەستەمبووڵدا بوون، بە كۆمەڵ پشتگیریی لێ دەكەن، كەلوپەلی نەمسایی لە گومرگەكاندا دەمێنێتەوە، لە لایەن كۆڵهەڵگرانەوە گواستنەوەیان رادەگیرێ. كەلوپەلی نەمسایی كە لە دووكانەكاندا دەفرۆشران بایكۆت دەكرێ. جلەوی كۆڵهەڵگرە كوردەكان بە دەست (عەلیی كورد) ناوێك بووە.

20- age., s.120.

[*٨] بایكۆت: پساندنەوەی پەیوەندی و هاریكاری لەگەڵ كەسێك یان لایەنێك بە نیازی زیان لێ خستن. (وەرگێڕ)



هەڵسوكەوتی عەلیی كورد و خۆراگریی كۆڵهەڵگرە كوردەكان بە مێدیای ئەوسای ئەورووپادا بڵاو دەبێتەوە، تەنانەت رۆژنامەیەكی نەمسا چاوپێكەوتنێك لەگەڵ عەلیی كورددا دەكا[٢١]. عەلیی كورد كە جڵەوی كۆڵهەڵگرانی غەڵەتەی بە دەستەوە بووە، بەمجۆرە پێناسە دەكرێ: ((خوێندەواریی نییە، كورتە باڵا، تەن دروست، كوردێكی كۆستەیە))[٢٢]. ئەو بایكۆتەی كۆڵهەڵگران دژ بە كەلوپەلی نەمسایی دەستیان پێ كرد لە (٢٧ی شوباتی ١٩٠٩) كۆتایی پێ دێ و سەر لە نوێ لە لایەن كۆڵهەڵگرانەوە كالای نەمسایی دەست بە گواستنەوە دەكرێتەوە. لەم چەندانەدا ئەوە دەورووژێنرێ كە ئەو پارەیەی عەلیی كورد لە كۆڵهەڵگرانی كۆكردووەتەوە هەمووی دەخاتە سەر، مایەی خۆی: ((عەلیی كوردی سەركردەی كۆڵهەڵگران، لەم ماوەیەدا بە هۆی بێجێییگەلێكەوە دەردو بەڵای هاتووەتە سەر. لەو ریكلامانەدا كە دراونەتە رۆژنامەكان عەلیی كورد لە لایەن ئەندامانی رێكخراو (ئەسناف)ی كۆڵهەڵگرانەوە تاوانبار كراوە. بە پێی ئەمە، عەلیی كورد بەرامبەر بەو ئازایەتییەی كۆڵهەڵگران لە بایكۆتدا نواندوویانە، وەكو پاداشت بە ناوی رێكخراوی كۆڵهەڵگرانەوە پارەی كۆدەكردەوە، بەڵام لەو لێكۆڵینەوەیەدا كە لۆنجە (بارەگای رێكخراو) ئەنجامی داوە، دەركەوتووە كە ئەندامانی كۆڵهەڵگر ئاگاداری ئەم رووداوە نەبوون. سێ كەس لە سەركارانی بارەگای كۆڵهەڵگران ناونووس كران و بە بەرچاوەوە گرتنی داهاتی خودی عەلیی كورد تاوانباریان كردووە))[٢٣].

یەك لەوانەی هەوڵی هێوركردنەوەی كۆڵهەڵگرە كوردەكانی دابوو، سەعید نوورسی (سەعیدی كورد) ناوی پیاوی ئایینی بووە. سەعید نوورسی كە بەو ناوچانەدا ((هەر هەموو شوێنەكان و قاوەخانەكان))دا گەڕاوە كە بە چڕی كۆڵهەڵگرە كوردەكانی لێ بووە. كۆڵهەڵگرەكان بە تەنیا جێ ناهێڵێ، ئەوانەی بەرامبەر هێزە تۆقێنەرەكان بانگهێشتی بە ئاگاهاتنەوە دەكا. سەعید نوورسی لەم دەمانەدا كە بۆ كۆڵهەڵگرە كوردەكان بە دەنگ دێ، بۆ ئەرمەنییانیش ئاگاداریی

21- Ein Besuch beim Boykotsundikat, Neue Freie Presse, 24 Januar 1909.
22- Donald Quataert, Social Disintegration and Populer Resistance in the Ottoman Empire 1881-1908, New york University Press, 1983, s.130.
23- Mehmet Emin Elmacı, 1908 Avusturya Boykotunda Liman İşçileri, Kebikeç, no 5, 1997.

هەر لەم شوێنەدا وێنەیەكی كاریكاتێریی عەلی-ی كورد (كویرت عەلی) بڵاوكراوەتەوە.

به بایەخی لە شێوەی: ((...دەبێ دۆست بن و دەستتان لە ناو دەستی یەكدیدا بێ..)) دەردەبڕێ. سەعید نوورسی بەم قسانە دەیەوێ رابوردوو بەجێ بهێڵێ. دوور نییە بە گەڕانەوە بۆ رابوردوو بیەوێ ئەنجامی خراپی رووداوە خوێناوییەكانی ساڵی (١٨٩٦) و ئەو گرژییەی لە نێوانی كۆڵهەڵگرە كورد و ئەرمەنییەكاندا رووی دابوو، بە بیر كۆڵهەڵگرە كوردەكان بهێنێتەوە، سەعید نوورسی ئەوە رادەگەیەنێ كە باوكی خۆیشی كۆڵهەڵگربووە[٢٤]. وا دەردەكەوێ چینی رۆشنبیری كورد لە ئەستەمبووڵ پشتگیرییان لەم كردەوەیەی كۆڵهەڵگرانیان كردبێ. هەواڵێك كە لە ژمارە دووی رۆژنامەی (تەعاون و تەرەققی)ی كورددا كە ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستەمبووڵ دەرچووە، پشتگیریی راستیی ئەم بۆچوونە دەكا: ((بۆ رێزنان لەو دڵسۆزییەی كۆڵهەڵگرانمان نواندوویانە كە گەورەترین خزمەتیان بەو جەنگە كرد كە دژی شتومەكی نەمسایی بەرپا بوو. بەو (١٠٥٩) قرووشەی لە لایەن هەندێك لەو ئازادیخوازانەی لە ناوچەی دۆڵمەباخچەدا دانیشتوون كۆكراوەتەوە، كاتژمێرێكیان كڕیوەو بە دیاری دراوەتە عەلی ئاغای (ئۆنباشی)ی[*٩] كۆڵهەڵگرانی گومرگ))[٢٥].

## ڕۆشنبیرانی كورد و كۆڵهەڵگرەكان

لە سەرەتای سەدەی بیستدا رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرە كوردە رێكخراوەكانی ئەستەمبووڵ، با درەنگیش بێ، بە زمان هێنانەوەی ئەو بارودۆخە سەختەی كۆڵهەڵگرە كوردەكانی تێدا دەژیان و نائارامییان بەرامبەر چەوساندنەوەی گراندا، دەبنە هاوسۆزیان. ساڵی (١٩١٨) دامەزرانی رێكخراوی وەكو كۆمەڵەی تەعالیی كوردستان و كۆمەڵەی بنەماڵەی بەدرخانی و كۆمەڵەی بڵاوكردنەوەی زانست و بڵاوكراوەی كوردی، بە گشتی لەم بارەیەوە هەندێك چالاكییان نواندووە.

لە گۆڤاری (ژین)ی ئۆرگانی كۆمەڵەی تەعالیی كوردستانی نیمچە فەرمی، كە ساڵی (١٩١٨) لە ئەستەمبووڵ دامەزراوە، لەم بارەیەوە هەندێك نووسینی بڵاوكردووەتەوە. لە ژمارە (٢٤)ی گۆڤارەكەدا نووسینێك كە ناوی نووسەری لەسەر نییە، بە ناوونیشانی-سنوور بەزاندن-ەوە

24- Bediüzzaman Said Nursi, Divan-1 Harbi Örfi, s.18.

(*٩) ئۆنباشی: سەركردە، لە بنەڕەتدا پلەیەكی سەربازییە واتای سەركردەی دە سەرباز دەگەیەنێ .. (وەرگێڕ).

25- Kürt Teavün ve Terakki Gazetesi, Kürdçe-Türkçe Dergi 1908-1909. Arap Harflerinden Latin harflerine çeviren: Mehmed Emin Bozarslan, Uppsala, 1998.



بڵاوكراوەتەوە. لەم نووسینەدا بارودۆخی ئەو كۆڵهەڵگرانە كراوەتە بابەت كە لە بەندەری سركەجی-دا كاریان كردووەو دژ بەو هێزانە وەستاون كە دەیانچەوسێنێتەوەو سەركوتیان دەكا: ((... لە ساڵانێكەوە كۆلۆن (كەمینە)یەكی كورد لە ئەستەمبووڵ پێكهاتووەو ئەمڕۆ بوونیان هەیە. ئەم كۆمەڵە كەمینەیەی كەوا بە كۆڵهەڵگر ناو دەبرێن، ژمارەیەكی زۆر گەورەی كرێكارانی كورد پێك دەهێنن. ئەم پیاوە بەستەزمانانە، لە جێی جیاجیای كوردستانەوە، بۆ پەیداكردنی بژێویی خۆیان و خێزانیان هاتوون، ئەم بەستەزمانانە لێرە بە شێوەیەكی زۆر بە ناموس و بە ئارەقەی نێوچەوان، كە لە بەیانییەوە تا ئێوارە ماندوو و شەكەت دەبن و دادەهێزرێن. وەك لە هەموو وڵاتێكدا نموونەیان هەیە، ئەمانیش لۆنجێكی لە لایەن حكوومەتەوە دان پێدانراویان هەبووە. ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە خۆیانەوە هەبوو، بە هۆی كۆششی تایبەتیانەوە، ناكۆكیی نێوانیان و كارەكانی دیكەیان لیژنەی ئەم لۆنجەیە چارەسەری دەكردو كۆتایی پێ دەهێنا. حكوومەتیش بە رێگەی شارەوانییەوە ئەم رێكخراوەو بزووتنەوەی كرێكاران كۆنترۆڵ دەكا. كەواتە ئەو كارانەی پەیوەندییان بە كرێكارانەوە هەیە، چاك و خراپ بە هەر شێوەیەك بێ بابێ، رێكخراوێك بە بەرپرسێكی رەسمییەوە بەستراوە. دەستدرێژیی دەرەكیی كەسێك یان هێزێك بۆ سەر ئەمە، لەگەڵ چەمكی سنووری خۆ نەزانی و خۆ نەناسینەوەشدا تا سنوورێك كە نەكرێ روونبكرێتەوە دزێو و هەڵسوكەوتێكی رەش رەشە))[٢٦].

لە نووسینەكەدا باس لەوە كراوە كە رەفیع جەواد بەگی سەرنووسەری رۆژنامەی (عەلەمدار) و ئەحمەد قەدری ئەفەندیی بەڕێوەبەری كاروباری نووسینی رۆژنامەكە، سەریان لە كۆڵهەڵگرە كوردەكانی سركەجی داوە. هەروەها باس لەو فشارە كراوە لە ئارەزووی بە هەڵبژاردنی كەسێكیان بۆ سەرۆكایەتیی لۆنجەكە خستوویانەتە سەر كۆڵهەڵگران. لە ژمارەی (٢٥)ی گۆڤارەكەدا ئەمجارەیان نووسینێكی دیكە بە ناوونیشانی (كرێكارانی كورد لە ئەستەمبووڵ) بڵاوكراوەتەوە. سەرنج بۆ مەرجە قورسەكانی ژیانی كرێكارە كوردەكان راكێشراوەو پێویستیی یارمەتیدانی ئەم مرۆڤانە لە لایەن كوردەكانەوە پێشنیار كراوە: ((بە كورتی، دەمانەوێ بڵێین، با ئێمە لەگەڵ كرێكارانی كورد خەریك بین بۆ ئەوەی بێگانان پەنجەی تێوەرنەدەن)). دواتر ئەم كرێكارانە هەر لەم نووسینەدا بە ((لە داهاتوودا تۆوێكی باشی كوردستان)) دادەنرێن[٢٧].

26- Görev Sınırları-Haddı Aşma, Jîn, no 24, 1919.

27- İstanbul’da kürd İşçileri, Jîn, no 25, 1919.

له كۆبوونه‌وه‌ی شه‌شه‌می كۆمه‌ڵه‌ی بنه‌ماڵه‌ی به‌درخانییان كه ساڵی (١٩٢٠) دامه‌زراوه، باس له ناهه‌قییه‌ك كراوه كه كۆڵهه‌ڵگره كورده‌كان تووشی هاتوون و له‌م باره‌یه‌وه به‌رگریی پێویست به‌رچاوخراوه. چواره‌م بڕیاریان په‌یوه‌ندیی به‌م بابه‌ته‌وه هه‌یه ((له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له لایه‌ن كۆڵهه‌ڵگرانی به‌نده‌ری حه‌سر (Hasır) به‌شی ساڵح ره‌ییس نه‌دراوه ئه‌م به‌ش وه‌رگرتنه دژ به یاسایه، دوای ئه‌وه‌ی باس له‌و سه‌ردانه كرا كه له بابه‌ت ئه‌و فشاره‌وه كراوه كه فه‌رمانبه‌ری ناوه‌ندی (ئه‌مینوێنو) و یاریده‌ده‌ری كۆمیسێری ته‌خته قه‌ڵا خستوویانه‌ته سه‌ر ئه‌وانه (كۆڵهه‌ڵگره‌كان!)، بڕیاری ئه‌وه دراوه، به‌ڕێزان عه‌بدوڕڕه‌حمان و جه‌لاده‌ت عالی سه‌ر له به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیی پۆلیس بده‌ن و رێ له‌و ده‌ست تێوه‌ردانه نایاساییه‌ی ئه‌و فه‌رمانبه‌ره ناوبراوانه بگیرێ))[٢٨]. لێره‌دا جه‌لاده‌ت عالی به‌گی باسكراو ئه‌و جه‌لاده‌ت به‌درخانه‌یه كه دواتر به‌و لێكۆڵینه‌وانه‌یه‌وه ناسراوه كه له باره‌ی زمانی كوردییه‌وه ئه‌نجامی داون. له مادده‌یه‌كدا كه له پرۆگرامی كاری كۆمه‌ڵه‌ی بڵاوكردنه‌وه‌ی زانستی و بڵاوكراوه‌ی كوردی، كه له ئه‌سته‌مبووڵ دامه‌زراوه، باس له‌وه كراوه كه پێویسته له نێو كرێكارانی كورددا هه‌ندێك كۆمه‌ڵه‌ی هاوكاری دامه‌زرێ[٢٩].

## كۆڵهه‌ڵگره كورده‌كان و بیری نه‌ته‌وه‌یی

نه‌ته‌وه‌ویسته كورده‌كانی ئه‌سته‌مبووڵ و رۆشنبیرانیان دره‌نگیش بێ، تێده‌گه‌ن كه ئه‌و گرووپه كورده كارگه‌رانه‌ی له ئه‌سته‌مبووڵ خه‌ریكی كاركردن بوون و كۆڵهه‌ڵگره‌كانیان هێزێكی به بایه‌خن. ئه‌و كۆڵهه‌ڵگرانه‌ی هه‌میشه به سووك دانراون و تووشی هه‌موو جۆره ناهه‌قییه‌ك هاتوون، پارچه‌یه‌كی كۆمه‌ڵگای كوردن و پێویستیی خۆكردنه خاوه‌نی كێشه‌كانیان زۆر دره‌نگ پێ زانراوه. قازانجی هێنانه ریزی نه‌ته‌وه‌یی ئه‌مانه، قه‌واره‌ی جددی په‌یداكردنی گیروگرفته‌كه‌و له ده‌مێكدا كه ده‌گاته خاڵی ته‌قینه‌وه. واته ساڵی (١٩٠٨) دوای مه‌شرووتییه‌تی دووه‌م ده‌ست به تێگه‌یشتنی ده‌كرێ. چوونه ناو كارگه‌ره كورده‌كانه‌وه و له نێو ئه‌واندا پروپاگانده كردن و به تایبه‌تی له‌ناو قوتابییه كورده‌كان و كۆڵهه‌ڵگراندا، دیدی

28- Malminanij, Cızira Botanlı Bedirhaniler ve Bedirhani Ailesi Dernegi'nin Aile Tutanakları, s.27.
29- Kürd Tamim-İ Maarif Cemiyeti Bildirisi, Jîn, no 10.



دامه‌زراندنی په‌یوه‌ندیی چڕتر، به‌ره‌به‌ره گرنگی په‌یداده‌كا. له‌م ده‌مانه‌دا پێكهاتنی یه‌كه‌م به یه‌كگه‌یشتنه‌كانیان ده‌بینین[٣٠].

سه‌یید عه‌بدولقادر كه په‌یوه‌ندیی نێوان كۆڵهه‌ڵگره كورده‌كانی له ئه‌سته‌مبووڵ و ئه‌و بیره نه‌ته‌وه‌ییه كورده‌ی لێره‌دا په‌ره‌ی سه‌ندبوو و بزووتنه‌وه‌ی رۆشنبیریی دابین كردبوو. ساڵی (١٩٠٨) كه له تاراوگه‌وه گه‌ڕاوه‌ته‌وه ئه‌سته‌مبووڵ، كۆڵهه‌ڵگره‌كان له مانگی ره‌مه‌زاندا خۆپێشاندانێكی خۆشه‌ویستییان بۆ رێكخستووه[٣١]. سه‌یید عه‌بدولقادر له لایه‌ن كۆڵهه‌ڵگره كورده‌كانه‌وه خۆشه‌ویست بووه‌و وه‌كو پیاوێكی حسێب بۆ كراو له سه‌رچاوه‌كاندا باسی كراوه، قه‌دری جه‌میل پاشاو نووری ده‌رسیمی كه شایه‌تحاڵی سه‌رده‌مه‌كه‌ن، له‌م باره‌یه‌وه هه‌ندێك روونكردنه‌وه‌یان خستووه‌ته روو، سه‌یید عه‌بدولقادر كه‌سایه‌تییه‌كه، نه‌ك هه‌ر له لایه‌ن كۆڵهه‌ڵگرانه‌وه، به‌ڵكو هه‌ر هه‌موو ئه‌و كوردانه‌ی له ئه‌سته‌مبووڵ بوونه، خۆشه‌ویست بووه: ((سه‌یید عبدولقادر ئه‌فه‌ندی نوێنه‌ری كۆمه‌ڵانی كوردی ئه‌سته‌مبووڵ و كه‌سایه‌تییه‌كی سیمبۆلئامێز بووه. هه‌موو كار و ناخۆشییه‌كانی كرێكارانی كورد به هاتنه‌كایه‌ی كه‌سایه‌تیی ئه‌وه‌وه چاره‌سه‌ر ده‌بوو. ئه‌و یارمه‌تییانه‌ی كرێكارانی كورد ده‌یانبه‌خشییه كۆمه‌ڵه‌ی هێڤیی قوتابییانی كورد له ئه‌سته‌مبووڵ به میانبینیی ئه‌وه‌وه ده‌بوو))[٣٢].

په‌یوه‌ندیی پێشه‌وایانی وه‌ك سه‌یید عه‌بدولقادر و سه‌عید نوورسی به كۆڵهه‌ڵگرانه‌وه، له پله‌ی به‌راییدا له داب و نه‌ریتی ئه‌و رێز و خۆشه‌ویستییه‌وه بناغه‌ی داڕشتبوو كه له نێو ((كاكی گه‌وره)) و ((براكانی دیكه‌دا)) هه‌یه. په‌یوه‌ندییه‌كان له چه‌مكی رێكخستنه هاوچه‌رخه‌كانه‌وه دوور بوو. یه‌كه‌م كۆششی دڵسۆزانه له باره‌ی هێنانه‌وه‌ی كۆڵهه‌ڵگران بۆ ڕیزی بزووتنه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌یی به دامه‌زرانی كۆمه‌ڵه‌ی ته‌عالیی كوردستان له ساڵی (١٩١٨)دا په‌ره‌ده‌ستێنێ. سه‌یید عبدولقادر ده‌كرێته سه‌رۆكی كۆمه‌ڵه. له‌م ده‌وره تازه‌یه‌دا، په‌یوه‌ندییه‌كان له نێوانی ((كاكی گه‌وره)) و ((براكانی دیكه))دا ورده ورده واز لێ ده‌هێنرێ. له جیاتی ئه‌مه، ژیانی كۆمه‌ڵپه‌روه‌رانه و مۆدێرن ده‌ست به فه‌رمانڕه‌وایه‌تی ده‌كا. به‌شێكی زۆری ئه‌و داهاته مادده‌یه‌ی

30- Nuri Dersimi, Hatıratım, ankara, 1992, s.42.
31- İsmail Göldaş, Kürdistan Teali Cemiyeti, İstanbul, 1991, s.18.
32- Kadri Cemil Paşa, Doza Kürdistan (Kürdistan Davası), Ankara, 1991, s.97.

له ڕێی سەیید عبدولقادرەوە لە کارگە و کۆڵهەڵگرە کوردەکان دابین دەکرا، بۆ خەرجیی ڕێکخراو تەرخان دەکرا[٣٣].

کۆڵهەڵگرە کوردەکان کە ساڵانی کۆن تەنیا بەوە قایل دەبوون کۆشش لە پێناوی ژیانێکی سادەدا بکەن. لەم سەردەمەی ئەمرۆماندا، دەسا پەیوەندیی لەگەڵ خەباتی ئەتنیکیی گەلی خۆی و نەتەوەیدا دەست پێ دەکا. دەتوانین هەست بە نزیکیی ڕەشید ئاغای سەرۆکی کرێکارانی کورد لە ناوچەی (ئاسلێن هنس) لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە چوارچێوەیەکی وەهادا هەڵبسەنگێنین. لە دۆزی شێخ سەعیدی سەرکردەی ئەو شۆڕشەی کوردە کە ساڵی (١٩٢٥) بەرپا بوو، عەلی ڕەزا ئەفەندیی کورد، لەو سەردەمەدا لە ئەستەمبوڵ کە سەری لە هەندێك کەس داوە، دەڵێ: لە ماڵی ڕەشید ئاغای سەرۆکی کرێکاراندا ماونەتەوە کە لە ئەستەمبوڵ دەژیا[٣٤]. سەرچاوەی ئەوتۆش هەن دەڵێن: ڕەشید ئاغا، یەك لە ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان بووە[٣٥].

سەیید عەبدولقادر کە ساڵی (١٩٢٥) لە ئەستەمبوڵ گیراوەو براوەتە دیاربەکر و لەوێ لە سێدارە دراوە، بەلای کۆڵهەڵگرە کوردەکانەوە لە دەستدانێکی گەورە بووە. ئەکرەم بەگی بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەستەمبوڵ کە سەیید عەبدولقادری دەستگیر کردووە، دواتر هەوڵی بێدەنگ کردنی کۆڵهەڵگرە کوردەکان دەدا. ((ئەکرەم بەگ خۆی ئامادە کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوونێکی کورد لە ئەستەمبوڵ کە دوور نەبوو ڕووی بدایە. ژمارەی کورد لە ئەستەمبوڵ نزیکەی دە هەزار بوو و ئەمانە بە گشتی ئەو کۆڵهەڵگرانەی دەوروبەری (ئونقەپانی) بوون. کۆڵهەڵگرەکان ماوەیەك خرۆشا بوون، تاڕادەیەك خستنە ناو دەریای فەرمانبەرێکی پۆلیس سنووریان بەزاندبوو. ئەکرەم بەگ هێنانە ژێر باری ئەوانەشی پشتگوێ نەخستبوو))[٣٦]. لەو ماوەیەدا دەنگۆی خۆ ئامادەکردنی ((کوردە چەکدارەکانی ئەستەمبوڵ)) بۆ یاخیبوون لە ئارادابووە و هەواڵەکان لەم بارەیەوە دەگەنە بەڕێوەبەرێتیی ئاسایشی ئەستەمبوڵ.

33- Kadri Cemil Paşa, Doza Kürdistan, s.42.
34- Uğur Mumcu, Kürt-İslam Ayaklanması, Ankara, 1991, s.18.
35- Tarık Zafer Tunaya, Türkiye'de Siyasal Partiler 11, s.186.
36- Metin Toker, Şeyh Said ve İsyanı, s.59.



## زارۆ ئاغا (١٧٧٤-١٩٣٤)ی ڕابەری ئەفسانە ئامێزی کۆڵهەڵگرەکان

کۆڵهەڵگرە کوردەکان کە خەم و باری جیهانیان لەسەر شان دەگرت، دوای ئەوەی ڕیزە ڕووداوێکیان بەسەردا ڕەت بوو، زارۆ ئاغای ڕابەری ئەفسانەئامێزی خۆیان دەخوڵقێنن. کاریزماترین کەسایەتیی کۆمەڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوڵ، بێگومان ئەوەی ساڵانێکی درێژ ئەوەی ڕابەرایەتیی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی کردووە، زارۆ ئاغا، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا لە دایك بووەو یەکێکە لەو یەکەمین کۆڵهەڵگرە کوردانەی هاتوونەتە ئەستەمبوڵ. ناوبانگی لەو سەرچاوەیەوە ئاوی خواردووەتەوە کە لە سەردەمی خۆیدا بە تەمەنترین مرۆڤێکی دنیا بووە. چاپەمەنیی جیهان زارۆ ئاغا بە (مەتۆسالەم-مەتهوسالەم)ی مۆدێرنی سەردەممان داناوە. هەندێك سەرچاوە ساڵی لە دایك بوونی زارۆ ئاغا بە (١٧٧٧) و هەندێکی دیکەیان بە (١٧٧٤) داناوە. بە پێی ئەم ژمارانە دەتوانین بڵێین زارۆ ئاغا (١٥٧) یان (١٦٠) ساڵ ژیاوە. لەم ساڵانەی دواییدا لەو نووسینانەدا کە لە هەندێك گۆڤاری ئەمریکا[٣٧] و ئەستەمبوڵ[٣٨] و ستۆکهۆڵمدا[٣٩] دەرچووە، باسی زارۆ ئاغایان کردووەتەوە کە چیرۆکەکەی بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلە.

سەرچاوە کۆنە کوردییەکان لەبەر هەر هۆیەکەوە بێ، زۆریان باس لە زارۆ ئاغا و چیرۆکی ژیانی نەکردووە. بەتایبەتی لە بڵاوکراوە وەرزانە کوردییەکانی ئەو ساڵانەدا، تەنانەت ناتوانین هەواڵی

37- Vera Beaudin Saeedpour, The Resurrection of zero Agah, Kurdish Times, vol.1, no 2, 1986, s.60-62.

نووسەر هەر لەو گۆڤارەدا هەندێك وێنەی سەرنجڕاکێشی زارۆ ئاغا بڵاودەکاتەوە کە لە ئەرشیفێکی کۆندا دۆزیبوونییەوە. لە وێنەیەکدا زارۆ ئاغا گیتارێکی بە دەستەوەیەو لە کۆنسێرتێکدایە، لە وێنەیەکی دیکەدا لە نیویۆرك لەگەڵ کیژێکی لاودایە، لەو وێنەیەشدا کە لەسەر بەرگدایە، زارۆ ئاغا بە جلی کوردییەوە پۆزی لێ داوە، ئەم وێنەیە بە ڕێتێچوونێکی گەورەوە لە ساڵانێکی زووتردا گیراوە.

38- Anthony Bryer, Zaro Aga (1774-1934): The Stories of a legend-Last of the Lions, Cornucopia 7/11, 1994-1995.

لە شوێنێکی ئەم نووسینەدا، زارۆ ئاغا لەگەڵ تیپێکی ئارکیۆلۆژیی ئینگلیز دایە کە سەریان لە زارۆ ئاغا داوە، وێنەکە ساڵی (١٩٢٨) گیراوە.

39- Rohat Alakom, Ev Dinya ji Zaro Axa re ji Nemaye, Armanc, no 133, 1992.

مردنی زارۆ ئاغاشیان تێدا ببینین. زارۆ ئاغا کە لە نێوانی ساڵانی (١٧٧٤-١٩٣٤)دا نزیکەی (١٦٠) ساڵ ژیاوەو بە تەمەنترین مرۆڤی جیهان ناسراوە. زارۆ ئاغا کە لە شاری بتلیسی کوردستاندا هاتووەتە جیهان، بەرەو کۆتاییی سەدەی هەژدەم دەچێتە ئەستەمبوڵ، لەوێ وەکو کرێکارێك لە بنیادنانی قشڵەی سەلیمییە و مزگەوتەکانی ئۆرتە کوێی و تۆپخانەدا کار دەکا. ساڵی (١٨٢٦) لە دەمەدەمی لە ناوبردنی (وەجاخی یەنیچەری) کە زارۆ ئاغا (٥٠) پەنجا ساڵان بووە، ساڵانێکی دوورو درێژ لە ئەستەمبوڵ سەرکاری کۆمەڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکان بووە: ((کە جێی شیاوی خۆی هات، نامانەوێ کوردەکانی ئەستەمبوڵیش لە بیر بکەین کە کارە گرانەکانی گومرگی ئەم شارە گەورەیەیان کوت و مت بە تەواوی بە دەستەوە گرتووە کە سەرۆکەکەیان، زارۆ ئاغای بە ناوبانگی بە تەمەنترین پیاوی جیهانە. (١٥٢) ساڵی تەمەنە و کاتێك ئەم لاپەڕانە دەنووسم هێشتا لە ژیاندایە))[٤٠]. زارۆ ئاغا کە دواتر لە ئەنجومەنی شاردا ئەرکی سەرۆکی خزمەتگوزارانی بەڕێوەدەبرد، رۆژانی دوایی لە ئەستەمبوڵ بەسەربردو ساڵی (١٩٣٤) هەر لەوێ دەمرێ. زارۆ ئاغا نزیکەی سەد ساڵی تەواو وەك کۆڵهەڵگرێك لە ئەستەمبوڵ کار دەکا، مەجید ئەفەندیی زاوای لە بارەی ژیانی زارۆ ئاغاوە هەندێك روونکردنەوە ئەنجام دەدا، لە رۆژنامەی جومهوورییەت-ی (١٩٣٤/٧/١)دا بڵاوکراوەتەوە.

((زارۆ ئاغا لە (١١٩١)ی کۆچی*))دا لە گوندی مەرمەنت-ی سەر بە ویلایەتی بتلیسدا لە دایك بووە. تا هەژدە ساڵان لە گوندەکەیدا ژیاوەو دواتر هاتووەتە ئەستەمبوڵ. زارۆ ئاغا لە بیناکردنی قشڵەی سەلیمییە و مزگەوتەکانی ئۆرتە کوێی و تۆپخانەدا کاری کردووە، گەڕاوەتەوە شارەکەی لەوێ ژنی هێناوە، بۆ دەستخستنی پارەی زۆر دیسانەوە هاتووەتەوە ئەستەمبوڵ لەبەر ئەوەی شۆخ و ئەندام درشت و بە هێز و توانا بووە، سەرنجی (سەرا)ی راکێشاوە، سەربازیی لە سەرادا کردووە.

---

40- Mesud Fani, Kürtler ve Sosyal Gelişimleri, Ankara, 1993, s.11.

مەسعوود فانی دەڵێ: زارۆ ئاغا لە لایەن کۆمەڵەیەکی دژ بە خواردنەوەوە بانگهێشتی ئەمەریکا کراوە.

* دەکاتە ساڵی ١٧٧٧ی زایین (وەرگێڕ)



بەڵام لە جەنگی رووسیدا گەڕاوەتەوە شارەکەی، لەگەڵ کەسانی عەشیرەتی خۆی و شەریف میرزا پێکەوە بەشداریی لە جەنگ کردووە. لە لاقییەوە زامدار بووە، گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ، لە تەرسانەدا (کارگەی دروستکردنی کەشتی) کرێکاریی کردووە، چەند جارێك هاتوچۆی شاری خۆی کردووە، لە هەموو چوونەوەیەکیدا ژنێکی دیکەی هێناوە. بەمجۆرە داواکاری زارۆ، کە حەوت جار لە شارەکەیدا ژنی هێناوە، لە گومرگەکاندا کۆڵهەڵگری بووە. زارۆ لەم کارەدا زوو خۆی نواندووە، بووەتە کەهیە (کوێخا)ی هەموو کۆڵهەڵگران. زارۆ ئاغا کە لە هەموو بەندەرەکان بەشی وەردەگرت، سەرەڕای زۆر گەورەیی تەمەنی، هەموو کەسێکی دەترساند، ئەوەی بەرەنگاری دەبوو بە مشتەکۆڵە لێی دەدا. زارۆ (١٣) سیانزە جاران ژنی هاوردووە، سیانزدە منداڵی بووە کە پێنجیان کچ بووەو (٢٩) بیست نۆ نەوەی بووە. لە منداڵەکانی تەنیا دوا کچ، گویللو خانم شەست ساڵانە و هێشتا لە ژیاندایە، زارۆ لە کاری کوێخایەتیدا پتر لە بیست ساڵ ماوەتەوە، کە وای لێ هاتووە نەتوانێ هیچ کارێك بکا، کۆڵهەڵگرەکان لە یارمەتیدانیدا بەردەوام بوون. چونکە لە چاوی ئەواندا شوێنێکی پیرۆزی بووە. پیرێتیی زارۆ بەر لە دە ساڵ سەرنجی شارەوانیشی راکێشاوە، لە سەردەمی سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئەمین بەگی ئۆپێراتۆر (نەشتەرگەر)دا ناونیشانی سەرۆکی خزمەتگوزارانی شارەوانیی دراوەتێ. مووچەی (٥٠) پەنجا لیرەی بۆ بڕاوەتەوە، ئەم بارودۆخەی تا مردنی درێژەی بووە)).

هەواڵی مردنی زارۆ ئاغا کە لە (١٩٣٤/٦/٢٩)دا بووە، مێدیای هەموو جیهانی وروژاندووە، ئەو نەخۆشخانەیەی تێیدا نووستووە پڕ دەبێ لە رۆژنامەنووس. دواتر رۆژنامەکانی هەر هەموو جیهان لە نزیك کۆتایی مانگی حوزەیران. رۆژی (١٩٣٤/٦/٣٠) ئەم هەواڵە بە خوێنەرانیان رادەگەیەنن: ((بە تەمەنترین پیاوی جیهان مرد)). بۆ لە نزیکترەوە ناسینی زارۆ ئاغا، دەبێ بە زمانی ژمارە قسە بکرێ. زارۆ ئاغا سەدەو نیوێك ژیاوەو بەشداریی لە شەش جەنگی گرنگدا کردووە. لەو سەروبەندەی تێیدا ژیاوە، نزیکەی دە سوڵتان لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا فەرمانڕەواییی کردووە. زارۆ ئاغا بە پێی هەندێك سەرچاوە (١٠) دە جار و بەلای هەندێك سەرچاوەی دیکەشدا (٢٩) جاران ژنی هێناوە. جگە لەم ژمارانە لە بارەی زارۆ ئاغاوە گەلێك ژمارەی شیکاریی دیکە پەیدا دەبن. بە پێی ژمارەی یەکێك لەوانەی حەزیان لە ژمارەیە، زارۆ ئاغا رێك (١٨٨٤) مانگ، (٥٨٣٠٥) رۆژ ژیاوە. ئەگەر ئەو قسانەی لە بارەی زارۆ ئاغاوە هەن و ئەفسانەکانیشیان تێکەڵ بکەین دەتوانین لیستی ئەم ژمارانە درێژتر بکەین. بۆ نموونە

وەك ئەوەی گوایە سێ گورچیلەی بووە[٤١]. زارۆ کە رۆژانی لاوێتیی بە بیردا دەهاتەوە کە لە بیری نەدەچوونەوە.. واتە ساڵانی لاوێتیی کە لە تەمەنی (٩٠) نەوەد ساڵیدا بووە.

بە پیرترین مرۆڤی جیهان دانانی زارۆ ئاغا لە بەرژەوەندیی هەندێك کۆمپانیا و ناوەندی سوودمەندی دیکە بوو، بۆیە ئاسانکاری بۆ زارۆ ئاغا دەکرێ کە بە وڵاتە جودا جوداکانی جیهاندا بگەڕێ. زارۆ ئاغا کە گەشتەکانی هەندەرانی بە رابواردنێکی لە تام بەدەر و رەنگین بەسەرچووە، ساڵی (١٩٢٥)، ئیتاڵیا و (١٩٣٠) ئەمریکا و (١٩٣١) ئینگلتەرە گەڕاوە، هەر گەشتێکی لەم گەشتانە دەبێتە رووداوێکی ئەوتۆ کە مێدیاکان ماوەیەکی چاك دەیکەنە تەوەری سەر باسەکانیان. بابەتی ئەو گەشتەی ساڵی (١٩٣٠)ی بۆ ئەمریکا بە شێوەیەکی زۆر رەنگین بەسەر دەچێ، زارۆ ئاغا (١٨ی تەمووزی ١٩٣٠) چووەتە ئەمریکا، نۆ مانگی لێ ماوەتەوەو گەلێك کەسایەتیی بە بایەخ و نوێنەرانی دامەزراوان دەبینێ[٤٢]. زارۆ ئاغا بەسەر یۆناندا چووەتە ئەمریکا، بەجۆرە سەرنجی مێدیاکانی یۆنانی راکێشاوە. لە گۆڤارێکی ئەو ساڵانەی سوێددا وێنەیەکی زارۆ ئاغا بەرچاو دەکەوێ، لە سەربانی کابینەکانی کەشتییەکی ئەڵمانی بە ناوی برەمەن (Bremen) بووە، لەسەر کورسییەکدا پۆزی لێ داوە. هەر ئەو گۆڤارە سوێدییە وێنەیەکی فۆتۆگرافیی زارۆ ئاغا لەگەڵ فۆتۆگرافی (لارس ئۆلۆفسۆن)ی بەتەمەنترین مرۆڤی وڵاتی خۆیان پێکەوە بڵاوکردووەتەوەو هەواڵەکەی بە ناوونیشانی (بەتەمەنترین دوو کەسی جیهانی و سوێدی) پەخش کردووە. نەك تەنیا لە نموونەی سوێدیدا، لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی وڵاتانی دیکەشدا باس باسی زارۆ ئاغا بووە، چاپەمەنیی هەر وڵاتە و لەم هەلەدا بەساڵداچووانی خۆیان، یان بۆ ناساندنەوەی Metusalem ی خۆیان هەلیان قۆستووەتەوە.

41- M. Salahattin, Zaro’ya da Kalmayan Dünya, Milliyet 1.7.1934.
42- 156 Year old Turk comes to visit Us, New York Times 19.7.1930.

(لەگەڵ ئەوشدا کە زارۆ ئاغا بە خۆی کوردە، لە رۆژنامەکانی ئەو ساڵانەدا بەگشتی هەموویان بە (تورك) یان ناساندووە. زارۆ ئاغا کە بە کوردی قسەی دەکرد، لەم گەشتەی ئەمەریکایدا بە هۆی عاسم ریدوان و ئەحمەد مووسای دوو وەرگێڕەوە کە یاوەرییان کردووە، وەڵامی پرسیارەکانی چاپەمەنی و ناوەندە جیاجیاکانی دەدایەوە).



یەك لەو بابەتانەی مێدیاکانی جیهانی پتر وروژاندووە، ژیانی هاوسەرێتیی زارۆ ئاغا و شێوەی روانینی بەرامبەر ئافرەتان بووە، کە چاوی بە ئەتاتورك کەوتووە، پێی گوتووە کاری چاکت کردووە، بەڵام رەخنەی ئەوەی لێ گرتووە کە ئازادیی زۆری بە ئافرەتان داوە. لە ژمارەی رۆژی (١٩٣٤/٦/٣٠)ی رۆژنامەی میللییەتدا نووسینێك (٢٩) بیست و نۆ جار ژنهێنانی زارۆ ئاغای دەرخستووە، هەر لەو هەواڵەدا ((لە وەڵامی ئەوانەی لێیان پرسیوە، بۆچی ئەو هەموو ژنە زۆرەی هێناوە، دەڵێ: چی بکەم، ئەو ژنانەی هێناومن زوو پیر دەبن و دەمرن، بەرگە ناگرن)). لە ژمارەی رۆژی (١٩٣٠/٨/١٣)ی رۆژنامەی کات (وقت - Vakit)دا وێنەیەکی سەرنجراکێش بڵاوکراوەتەوە. نۆ کچی ئەمریکی دەوروبەری زارۆ ئاغایان گرتووە، بە شێوەیەکی زەوقدار دەبینرێ. دووانیان لە باوەشی زارۆ ئاغا دانیشتوون، کوڵمی پیرەمێرد رادەمووسن، ئەو جۆرە فۆتۆگرافانە یادگارییانەی لەگەڵ زارۆ ئاغا کێشراون. بەتایبەتی هی ساڵی (١٩٣٠)ی زارۆ ئاغا کە لە ماوەی گەشتی ئەمریکا، لە مێدیاکانی جیهاندا جێی زۆری گرتووەتەوە.

مالیك ئەکسێل لەو کتێبەیدا کە بە ناوی (ناوەڕاستی ئەستەمبوڵ)ـەوەی نووسیوە، باسی رۆژانی رابوردوو دەکات و یادەوەرییەکی میهری خانم ناوی مامۆستای وێنەکێشی دەکا کە پەیوەندیی بە زارۆ ئاغاوە هەیە. زارۆ ئاغا بانگکراوەتە قوتابخانەی سەناییعی نەفیسە (هونەرە جوانەکان)ی گەدك پاشا، لێرە وەکو مۆدێلێك کاری کردووە. بەڵام زارۆ ئاغا دوای سێ رۆژ بزر بووە، جارێکی دیکە بەشداریی لەو کارانەدا نەکردووە. هۆیەکەشی بەمجۆرە باس کراوە: ((دەمەتەقێ بەردەوامە، میهری خانم بەڕاستی دەیویست مۆدێلی پیاو بهێنێتە قوتابخانە، چونکە بە مۆدێلێکی بێ گیانی وەك بۆرەك، وێنەی رەنگاو رەنگ ناکێشرێ. ئەمەیان بە وەزارەتی مەعاریف (پەروەردە) راگەیاند، پیاو دەیتوانی بە جلوبەرگەوە بێت. تەنیا بەو مەرجە رێ دەدرا، لە کەسانی سەقەت و ئەوانە بن کە سەرنج! راناکێشن. لە جێی مۆدێلی سەقەت و ناشرین، پیرەمێرد پەسەند کرا. زارۆ ئاغا کە تەمەنی سەد ساڵی رەت کردبوو، لە قاوەخانەکانی قوتابخانەدا دادەنیشت، هێنرایە قوتابخانە. قوتابیيە کچەکان بەبێ سەرپۆش دەچوونە بەردەمی ئەم مۆدێلە پیاوە راستەقینەیە، سەرباری ئەوەش بۆ دڵنیاکردنی ئەو، قاوەو چایان پێ دەبەخشی.

زارۆ ئاغا، دوای سێ ڕۆژان گوم بوو، جارێکی کە سەری لە قوتابخانە نەدایەوە، مەگەر چی هۆی نەهاتنەوەی ئەوەیە کە دەڵێ: ((-کچەکان هەموو تەماشام دەکەن، چاوم لێ لا نادەن، سەرباری ئەوەش دارجگەرەیەك (قەڵەمی ڕەش) بە دەستەوە دەگرن، بۆمی درێژ دەکەن.

- هەروەها بە ئەنقەست چاوم لێ دادەگرن، دواییش دەست بەسەرو ڕوومەتدا دەهێنن. پێم دەڵێن سەیری ئێرە بکە، سەیری ئەولا بکە، نازانم سەیری کامیان بکەم، هەموویان وەك (حۆری)ن، یەکدووانیش بن هەر قەیدی نییە. ئێ من ئەم هەموو کیژە چ لێ بکەم، بە خودای ئیدی نایەم.

بەر لەوەی ماوەیەکی زۆر بەسەردا بچێ، ئەمەریکاییەك زارۆ ئاغا بەوەی بە تەمەنترین پیاوی جیهانە، دەباتە ئەمریکا، لەوێ کە شانی، جگە لە کۆپانەکەی چیی دیی نەدیوە، سمۆکنی پێ لەبەر دەکەن. زارۆ ئاغا لە تەمەنی (١٥٥) ساڵیدا هەر دەڵێی تازە زاوایە. لە ڕاستیدا ئەو، ئەم جۆرە جلوبەرگەی پێ خۆش نەبووە. لەوانەشە ئەو بە دوای ئەو کراسەیدا دەگەڕێ کە لە (تۆپخانە)دا بەردی پێ دەگواستەوە بۆ مزگەوتی (نوستەرییە)، بەڵام تازە بەم کارەوە گلاوە.

ئێستاکە ئەو هۆیانەی ناچاریان کردووە لە قوتابخانەی (هونەرە جوانەکانی ئیتاس)ی گەدك پاشاوە هەڵبێ زۆر پترن. زارۆ ئاغا بۆ سەکۆی سەر گەورەترین ساختمانی نیویۆرك سەر دەخەن، لەوێ بۆ خۆشی و شادمانیی ئەمریکا دوعا بۆ زارۆ ئاغا دەکەن. زارۆ ئاغا وەك ڕۆبۆتێك نە پێدەکەنی، نەزیز دەبێ. جوانترین ئارتێستانی ئەمەریکا، هەندێکیان ملچەملچ گۆناکانی ماچ دەکەن، هەندێکیان لە باوەشیدا ڕۆدەنیشن، برێکیان لە باری لە ئامێزگرتنیدا فۆتۆگرافی لەگەڵدا دەگرن. ئەم هەواڵانە بە هەموو جیهاندا بڵاودەبێتەوەو لە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبووڵدا دەردەچن، ئەو ڕێزلێنانەی زارۆ ئاغا بە درێژایی تەمەنی نەدیبوو لێرە دەیبینیێ))[43].

گەلێك ئۆرگانی چاپ، بەتایبەتی مێدیای تورك سەرەڕای بە ڕەسەن کورد بوونی زارۆ ئاغا، وەك تورکێك دەناسێنرێ، بەجۆرە لەم ساڵانەدا کەسایەتیی کوردیی زارۆ ئاغا بەردەوام دەشارڕێتەوە. بەڵام کە دەچێتە بەردەمی چاپەمەنیی جیهانی، ئەو زارۆ ئاغایەی بە زەحمەت بە تورکی دەئاخڤێ، بە کوردی قسەکردن پەسەند دەکا و ئەم بارودۆخە لە چاوی مێدیای

43- Malik Aksel, İstanbul'un Ortası, Ankara, 1977, s.106-107.



جیهانییەوە هەڵنایێ. لە کۆتاییدا هەندێك ڕۆژنامە و گۆڤار ناچاری نووسینی بە کورد بوونی زارۆ ئاغا دەبن، دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە زارۆ ئاغای تەمەن زۆر بەرەو پێش چوو، زۆر ئاگای لەو ڕووداوانە نەبووە کە لە وڵاتی خۆیدا یان لە جیهاندا ڕوویانداوەو تەواو بووە، کەوا بێ توێژی جوداجودا زارۆ ئاغایان بە ئاراستەی ئامانجەکانی خۆیان بە مێدیایان ناساندووە. بەپێی هەندێك سەرچاوە، زارۆ ئاغا کە دووجار چووەتە بەردەمی ئەتاتورك، ئەتاتورك هەر بە سوڵتان ناو دەبا.

لە بارەی (یاخیبوونی) شێخ سەعیدەوە کە ساڵی (١٩٢٥) بەرپا بووە. دوای هەندێك ڕوونکردنەوە کە لە ڕۆژنامەی جومهوورییەتدا بڵاوکراوەتەوە، ڕەخنە لەم یاخیبوونە دەگرێ: ((زارۆ ئاغای بە تەمەنترینی ئەو کوردانەی لە ئەستەمبووڵ دەژین، ڕەخنەی لە یاخی بوونەکە گرتووەو مەحکوومی کردووە، زارۆ ئاغا دەڵێ: من نە ئەو نەفرەت لێ کراوە دەناسم کە شێخ سەعیدی پێ دەڵێن و نە پیاوەکانی دەناسم، خودا بەڵایان لێ بدا!. لە لایەکی دیکەوە زارۆ ئاغا خواستی کە خودا دەوڵەتەکەمان و میللەتەکەمان و (غازی پاشا)[*10] مان لەناو نەبا))[44]. لە ژمارەی ڕۆژی (١٩٣٤/٧/١)ی ڕۆژنامەی میللییەتدا، محەممەد سەلاحەددین بە ناوونیشانی (دنیا بۆ زارۆش نەما) نووسینێکی سەرنجڕاکێش بڵاو دەکاتەوە، دیسانەوە لە ژمارەی ڕۆژی (١٩٣٤/٧/٢)ی ڕۆژنامەی میللەتدا وتارێکی دیکە بە شێوەی: ((دوای زارۆ ئاغا داخۆ پیرترین کەس پیاو یان ژن لە تورکیا کێ دەبێ؟)). دەنووسێ. لەم نووسینەیدا، ئەو نووسەرەی پێنج پرسیار بەرەو ڕووی خوێنەران دەکاتەوە، بە هۆی ئەم ئەنکێتە (لێکۆڵینەوە)یە هەوڵ دەدا بگاتە ئەنجامێك. محەممەد سەلاحەددینی وتارنووس بۆ دواجار بە شێوەی، ((با شەرەفی نیشتمان بوونی بە تەمەنترین پیاو بە وڵاتانی دیکە نەفرێنین))[*11]. خوێنەران ئاگادار دەکاتەوە.

[*10] غازی پاشا: مەبەست مستەفا کەمال ئەتاتورکە (وەرگێڕ).

44- Faik Bulut, Türk Basınında Kürtler, İstanbul, 1992, s.80.

((ئەم پەیامەی زارۆ ئاغا لە ژمارەی (٢٨ی شوباتی ١٩٢٥)ی ڕۆژنامەی جومهوورییەتدا بڵاو کراوەتەوە)).

[*11] واتە: بانەیەڵێن وڵاتی دیکە بە نیشتمانی بە تەمەنترین پیاو دابنرێ (وەرگێڕ).

زەحمەتی و نیگەرانیی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوڵ دەچێتە ناو کرۆکی ئەدەبیاتی هاوچەرخی تورکیشەوە. بەتایبەتی لە هەندێك چیرۆکدا بەرەو رووی نموونەی جۆراو جۆری ئەو کۆڵهەڵگرە کوردانە دەبێتەوە کە دەچنە ئەستەمبوڵ. ئەگەر ئەم چیرۆکانە بکەینە سەرشار و بکەوینە رێ، بەلای کەمەوە هەندێك زانیاریی پڕ بایەخ لە بارەی ئەو کارەگرانانەوە کە کۆڵهەڵگرانی تێدابوون و مەرجەکانی ژیانەوە بە دەست دەخەین.

ئەو پەیوەندییانەی نێوانی کەمینە ئەتنیکییەکانی ئەستەمبوڵ، بەتایبەتی (ڕامۆ)ی چیرۆکی (ئەو کەرەی نێردرایە گوند)ی سەعید فایق کە ئەو کۆمەڵگەی (ڕۆم)ەی لە ئەستەمبوڵ دەژیا، لە چیرۆکەکانیدا خستووەتە باری بیرێکی بە بایەخ. ئەو رامۆیە بەشداری هەموو چارەنووسێکی کۆڵهەڵگرە کوردەکانە. ((لە یەك لە گوندە نزیکەکانی سنووری ئێرانەوە هاتبوو، لەبەر ئەوەی دەیتوانی تەواوی دەردەکانی بە فەرهەنگێکی سەد وشەیی دەربڕێ، دەکرا بگوترێ دەردی نییە، لە کاتێکدا تاڵەموویەکی پرچی سپی نەبوو بوو، لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا بوو، سمێڵێکی باریك و رەش و درێژی هەبوو، هێندەی تاشە بەرد بەهێز بوو، کاتێك بارە هەرە قورسەکانی بەندەریان بە سەرشانییەوە بار دەکرد. هەستی بە شانازی نەکردایە، مرەی لێ دەهات. هەر هیچ نەبێ رووی گرژ دەکرد، یانیش لەناوچاوە منداڵانەکەیدا هاڵاوی تووڕەییەکی بەرفشار کەوتوو دەبریقایەوە. ئەم جۆرە شتانە نەدەبوو! بە باری رانینی ئەو مرۆڤانەوە پێدەکەنی کە ناچاری پاراستنی هێزی خۆیان بوون. نە بە سوپاسگۆ دادەنرا، نە بە لە خۆبایی. هیچ شتێك بە روویەوە دیار نەدەبوو. هەروەها نیهانپارێزیش بوو))[٤٥]. رامۆ کە لە دەڤەری وانەوە هاتبوو و لە زمانی کوردی بەولاوە هی دیکەی نەدەزانی، لە ئەستەمبوڵ کێشەی تازەی بۆ دەخولْقاند. بەلای نووسەرەوە ((فەرهەنگی)) رامۆ، تەنیا لە هەندێك وشە پێکدەهات، بۆ نموونە: ئەحمەد، محەمەد، بار، کۆپان، بەگ، نامە، شار، درۆ، راست، کراس، ئاسن ... رامۆ کە پارەی بەشی ئەوەی نەدەکرد کەرێك بکرێ و بینێرێ بۆ شارەکەی، بەسەرهاتی ئەستەمبوولی، لە چیرۆکەکەدا بە شێوەیەکی جوان دەخرێتە گۆ، ئەم دیدەی سەعید فاییقە لە بابەتی کۆڵهەڵگری کورددا تا دوایلە باوەڕ پێ هێن بوو، ((رامۆ دوای ئەوەی باری دەخستە سەر کۆپانەکەی

45- Sait faik, Bütün Eserler: 2, Şahmerdan, Lüzumsuz Adam, İstanbul, 1982, s.80-86.



هەڵیدەسەنگاند. ئەم بزاوتە، هی کەسێك بوو بڕیاری راهاتنی لەگەڵ چارەنووسی خۆی دابێ، هەڵتیزانی پیاوێکی بە زات بوو. بەجۆرە ئەو کەلوپەلەی بە سەدو بیست کیلۆ دادەنرا، وەکو نەبووبێ وا بوو. کە ئەو رێیە باریکەی لە بەندەرەوە دەستی پێ دەکرد دەپێوا بەو مێشە رەشانەی بە روویەوە دەنیشتنەوە، جگە لە تورکییەکەی بە زمانێکی دیکە کفری دەکرد. لە کەللە سەریەوە وەکو بڵێی ریزێك رەشەبای رەت کردبێ مێشی لێ هەریەکە بەلایەکدا دەفڕی. هێدی هێدی دەڕۆیشت و هەرگیز بیری نەدەکردەوە))[٤٦].

لە چیرۆکی (ئاوی بەگرانی چۆڕاو)ی یەشار کەمالیشدا کۆڵهەڵگرێکی دیکەی کورد کە لە ناوچەی وانەوە هاتووەتە ئەستەمبوڵ دەبینینەوە، (( دوا پایز بوو، رەشیدی کۆڵهەڵگر هات. پیاوێکی درشت بوو. کەرەکەی بە پێش خۆی داوەو لە وان-ەوە رانیویەتی تا ئەستەمبوڵ سی ساڵە لە ئەستەمبوڵدا باری هەر هەموو ئەوانەی دەهاتنە هاوینە هەواری (کنالی) رەشید هەڵیاندەگرێ. دوو سێ ساڵ جارێك تاسەی شارەکەی، ناخی گەماروو دەدا، کەرێکی دەهێناو بە پێش خۆی دەدا، هەر بە پێیان تا وان دەهات))[٤٧].

لە چیرۆکی ((برابەش))ی ئۆرخان کەمالدا بەسەرهاتەکانی کۆڵهەڵگرێکی (سیڤەرەك) لە ئەستەمبوڵ باس دەکا. کۆڵهەڵگری سیڤەرەك، لەو سەرەك کۆڵهەڵگرانەی قەناعەتی پێ هێنان خۆش نابێتەوە. ئەم کۆڵهەڵگرە کوردەی خەڵکی سیڤەرەکە، بەرگەی ناهەقییەکان ناگرێ. ئەگەر بەگرانیش بەسەریدا بشکێتەوە، بە گیان لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەیدایە: ((برادەرینە: لەمەودوا ناوکی خۆمان بە دەستی خۆمان دەبڕینەوە. پێویستیمان بەم لۆتییە نییە! ئەوەی دەستیشمان دەکەوێ دەیکەینە برابەش. باشە؟

لەوە باشتر چی هەیە.

46- Aynı Yapıt, s.81.
47- Yaşar Kemal, Sarı Sıcak-Bütün Hikayeler, İstanbul, 1983, s.223.

دەست لە ناو دەستی برادەر، چاکەت لەسەرشان، بە کاسکێتی[*١٢] بەرەو پشتەوە لاری سەیوانۆچکە وەرگەڕاوەکەیەوە لە پێشەوەی برادەرانیدا لەو جاددەیەدا کە کارەبا رووناکی کردبووەوە هێدی هێدی رێی دەکرد))[٤٨].

لە چیرۆکی (کۆڵهەڵگری ئەلازك)ی بەکر یلدزدا، چۆن چۆنیی کوژرانی حەسەن ناو کۆڵهەڵگرێکی ئەلازك لە لایەن کۆڵهەڵگرە نەغەدەییەکانەوە باس دەکا. لالۆ حەسەن کە کۆپانێکی نوێی بۆ خۆی کڕیبوو، لە دەمێکدا کە لەو پەڕی ئومێدەواریدا بوو، لەو شەڕەدا کە لەگەڵ ئەو کۆڵهەڵگرانەدا تووشی هات، دەستیان بەسەر بازاڕەکەدا گرتبوو بە چەقۆ لێدراو کوژرا[٤٩].

## قاوەخانەکان: ناوەندی دەنگوباسی کۆڵهەڵگران

وەك لە چیرۆکەکانی برابەش-ی ئۆرخان کەمال و کۆڵهەڵگری ئەلازگ-ی بەکر یڵدزدا دەبینرێ، گیروگرفتەکانی ناو کۆڵهەڵگران خۆیان، بەتایبەتی ئەو دەمەقاڵێیانەی لە ناو سەرەك کۆڵهەڵگر و کۆڵهەڵگران و کۆڵهەڵگرانی دیکەو خاوەن کەلوپەلی کۆڵهەڵگراندا رووی دەدا، گەلێك جاران پێکدادانەکان رووداوی خوێناوییان لێ دەکەوتەوە. لەم رووداوانەدا هۆیە ئەتنیکییەکان دەورێکی گەورە دەبینن. وەکو بەکر یڵدز ئاماژەی پێ کردووە. دیارە زۆر جار، ئەوانەی لە ناو خۆیاندا کۆمپانیایان داناوە و ئەوانەی گرووپی ئەتنیکی و ناوچەییان پێکهێناوە، کۆڵهەڵگرە تازە هاتووەکانیان لا پەسند نەبووەو نەیانویستوون. هەموو دەمێك تێکدانی ئەم بنەمایە ئاسان نابێ. تێکەڵ بوون و بوونە ئەندامی رێکخراوەکانی هاوشاری، کە تۆڕێکی هاوکاری دەگەیەنێ، یەکەم هەنگاوێکە لەم بارەیەوە بنرێ. بۆیە کۆکترین راسپێریی ئەو کۆڵهەڵگرانەی رێی ئەستەمبوولْ دەگرنە بەر، بێگومان ئەو هاوشارییانەی خۆیانن کە لە ناوچەکانیانەوە هاتوون. ئەگەر لە دەڤەرەکانی خۆشیانەوە نەهاتبن، بە ناچاری دەبێ ((هاوشاریی کاتی)) یان ((بە قسە هاوشاری)) پەیدا بکەن. ئەم رێکخستنە کۆمەڵایەتییە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی تازە دێنە ئەستەمبوولْ. بۆ ئەو کۆڵهەڵگرە کوردانەی تورکی نازانن. گرنگییەکی نەبڕاوەی ژینئامێزی

---

[*١٢] کاسکێت: کڵاوێکە لە بەشی پێشەوەیدا سەیوانۆچکەیەکی بۆ سێبەر خستنەوەی هەیە .. (وەرگێڕ).

48- Orhan Kemal, Onuncu kadin, İstanbul, 1982, s.188-195.
49- Bekir Yıldız, Güneydoğu Öyküleri, İstanbul, 1979, s.85-95.



هەیە. بە پێچەوانەوە لە دەرەوەی گرووپدا بزر بوون، تووشی مەترسیی لە گۆڕێدا خشانەوە دەبن. ئەم هەڵوێستەش بە تایبەتی بۆ ئەوانەی بۆ یەکەمجار دێنە ئەستەمبوولْ، بەربوونەوەو کەوتن دەگەیەنێ. هەندێکیان هەر هاوشارییەکانیان بە فریایان دەکەون. بەشێك لە بەدبەختەکانیان بە دەستبەتاڵی دەگەڕێنەوە شارەکانیان، بەشێکیشیان تێکەڵ بە ((بێ گوریس))ەکان دەبن کە واتای بنەڕەتی وشەی کۆڵهەڵگر دەگەیەنێ[٥٠].

شیاوترینی ئەو جێیانەی کۆڵهەڵگرەکان هاوشارییەکان و راسپێرەکانی خۆیانی لێ ببینن، قاوەخانە، چایخانە، چێشتخانە و بیرەخانەکان بووە. ئەم جۆرە شوێنانە وەکو ناوەندی هەواڵ دەوری گەورەیان بینیوە. وەکی دی ئاگری نەتەوەیی کە بۆ ئەم جۆرە شوێنە گشتییانە دەتەنییەوە یەکسەر گڕی دەگرت. لەم ساڵانەدا دیاربەکرییەکان بەگشتی هاتوچۆی قاوەخانەی عەبدوڵڵا چاوشی ئەرغەنییان دەکرد کە لە (دیوان یولۆ)دا بووەو[٥١] دەرسیمییەکانیش بەگشتی هاتوچۆی قاوەخانەی عەلی پاشای ئەزرنجانییان دەکرد کە لە ناوچەی (ئونقاپانی)دا بووە[٥٢]. لە لێکۆڵینەوەیەکدا زانا ئەمەریکییەکان لەم بارەیەوە ئەنجامیان داوە، تێیدا روون کراوەتەوە کە ساڵی (١٩٢٢) قاوەخانە و بیرەخانەکانی ئەستەمبوولْ کرێکاری کوردیان لێ بووە[٥٣].

---

[٥٠] بێ گوریس: بەو بێکارانەیان گوتووە کە گوریسی سەر بە مۆری فەرمیی چەتاڵدار-یان نەبووە، ئەو گوریسە لە لۆنجە دەدرا و لە بارهەڵگرتندا بەکاردەهێنراو دڵنیایی و متمانەی پێیان دەبەخشی، بۆیە ئەوانەی ئەو گوریسەیان نەبووە ناچار بە قاچاخ کاری کۆڵهەڵگرییان کردووە.

بڕوانە:

Necdet Sakaoğlu, Tanzimat’tan Cumhuriyet’e Tarih Sözlüğü, 1985, s. 65.
51- Kadri Cemil Paşa, Doza Kurdistan, s.28.
52- Nuri Dersimi, Hatıratım, s.31.
53- İstanbul 1920, Editör: Clarence Richard Johnson, çev. Sönmez Taner, İstanbul, 1995, s.227.

## ئەنجام

یەکەم کوردێك یان ئەو کوردانەی پێیان بە خاکی ئەستەمبوولدا نابێ کێن؟ نازانین. بەڵام لە سەدان ساڵەوە کورد لە ئەستەمبوولدا ژیاون. لێکۆڵینەوەیەك ساڵی (١٩٢٢) لە بارەی ئەستەمبوولەوە کراوە پیشانی دەدا کە ئەستەمبوول وەك (موگناتیسێکی کۆمەڵایەتی) مرۆڤان بەرەوخۆ رادەکێشێ. لە خاڵێکی سەرنجڕاکێشدا، هەر لەو لێکۆڵینەوەیەدا ئەوە دەربڕاوە کە کوردەکانی ئەستەمبوول بە تەنیا دەکرێ ببنە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ[٥٤]، وەکو لەو بەشەیدا کە سەرگوزەشتەی سەد ساڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوولی گرتووەتەوە. (١٨٢٦-١٩٢٥) دەردەکەوێ، کۆڵهەڵگرە کوردەکان ناچاری ئەنجامدانی کاری تاڕادەی باوەڕنەکردن گران و داهێزەربوون. وەکو ئەوەی هەموو ئەمانە بەس نەبن، ئەمجارەیان ناچاری تەکاندانی ناوپێکدادانی سیاسی و تاکە کەسی و ئەتنیکیی وەکو هێزێکی کاریگەر بەکارهێنراون.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمماندا نەتەوەپەرست و نیشتمانپەروەرە کوردەکان کە لە ئەستەمبوول دەستیان بە بزووتنەوە کردووە و لە کۆتاییدا کۆڵهەڵگرە کوردەکان خۆیان لەناو ئەم ئازارە مێژووییەدا بینیوەتەوەو بەلای کەمەوە بە توندی پشتگیریان لێ کردووە. نەتەوەپەرستە کوردەکان کە هەلی گەیشتن بە هەموو کۆڵهەڵگرانیان نەبووە، لە ئەنجامی (یاخی بوونی!) شێخ سەعیددا کە ساڵی (١٩٢٥) بەرپا بووە. هەر هەموویان پێکەوە ناچاری بەجێ هێشتنی ئەستەمبوول دەبن و بەمجۆرە کۆڵهەڵگرەکان وەك لە مێژە وابووە بۆ چارەنووسی خۆیان بەجێ دەهێڵرێن، رووداوی گیرانی سەیید عەبدولقادر لە ئەستەمبوول و لە دیاربەکر لە سێدارەدانی ساڵی (١٩٢٥) کە ساڵانێکی دوورو درێژ باوکی دەردی (خەمخۆر)ی کۆڵهەڵگرە کوردەکان بووەو رێپیشاندەری ئەوان بووە، بە واتایەکی دیکە (سەرکردەی فەخری)ی ئەوان بووە، بەڵکو یەکێك لە گرانترین گورزێك بووە لە کۆمەڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوول دراوە.

54- İstanbul 1920, s.76.



وەکو لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوتووە کە بەسەرهاتی سەد ساڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوولی کردووەتە بابەتی خۆی، بە چڕی دەبنە ئامانجی فشاری جیاجیا[٥٥]، دیارترینی فشارەکان و شێوەی بە چڕی تاقیکراوی لە ئەستەمبوولەوە ناردنی کۆڵهەڵگرەکانە بەرەو تاراوگە. بەڵام ئەوان دیسانەوە رێیەکیان بۆ دۆزیوەتەوەو یەکڕاست بۆ سەلماندنی بێتاوانیی خۆیان بە خۆویست دەچنەوە ئەستەمبوول. ساڵی (١٨٩٦) دوای ئەو رووداوانەی نێوان کۆڵهەڵگرە ئەرمەنییەکان و کۆڵهەڵگرە کوردەکان (هـ.ج.دوایت H.G.Dwight)ی ئەمریکایی، لە ناوچەی تەقسیمدا بەرەو رووی کۆڵهەڵگرێکی کورد دەبێتەوە، قسەکانی ئەم کۆڵهەڵگرە زۆر بە بایەخ دەزانێ. ئەروس یومول ساڵی (١٩٩٦) لە ئەستەمبوول بەشداری لە (پانێل Panel)ێك دەکا بە ناوی (زۆر رۆشنبیرییەتی)یەوە، سەرنجمان بۆ ئەم رووداوانەی ساڵانێك لەمەوبەر رادەکێشێ و ئەو قسانەی کۆڵهەڵگری کورد بە ئەمریکاییەکی گوتووە، ئەم قسانە دەخاتە پێش چاوان: ((دوایتی نووسەری ئەمریکایی کە باسی ئاهەنگە پیرۆزەکانی (پاسکالیا)[*١٣] دەکا، رۆژی دوای جەژنەکە، باسی ئەو ئاهەنگە پیرۆزانەش دەکا، لە قسەکانی دوایت تێدەگەین کە لەو گۆڕەپانەدا کە ئاهەنگەکەی تێدا لە کەشێکی خۆشیدا بەرێ چووە بۆ

---

[٥٥] لە سەرەتادا ئەم لێکۆڵینەوەیەی لە بارەی کۆمەڵی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی ئەستەمبوولەوە، وەکو بەیاننامەیەك ئامادەکرا، بە نیازی ئەوەی لەو کۆنفرانسە نێو دەوڵەتییەدا پێشکەش بکرێ کە لە پاریسدا لە ١٩/٢٠ی ئەیلوولی (١٩٩٦)دا بە ناوی (کوردو شار)ـەوە رێکخرابوو. هەر ئەو دەقە لەگەڵ هەندێك وێنەدا رۆژنامەی (ئوێزگویر پۆلیتیکا)دا وەك زنجیرە نووسینێك بڵاوکرایەوە (٢٩-١٩٩٦/١٢/٣٠). ئەم لێکۆڵینەوەیە دواتر کراوەتە کوردی و لە گۆڤاری (چرا) دا بڵاوکراوەتەوە کە لە لایەن کۆمەڵەی نووسەرانی کورد-ەوە لە سوێد دەرچووە.

(Cimaeta Hemalên Kurd Li Constantinopole, no 7, 1997)

هەر ئەم لێکۆڵینەوەیە دواتر لە گۆڤاری ((کە بیکەچ)) دا بڵاوکرایەوە کە لە تورکیا دەرچووە:

(Kebikeç, no 5, 1997).

[*١٣] پاسکالیا: وشەیەکی (رۆم)ییە، ناوە بۆ جەژنێکی خرستیانان (دیان)، رێکەوتی رۆژی بڵند بوونەوەی مەسیحە. (وەرگێڕ)

پیرۆزبایی ئەرمەنییەکان و رۆمەکان، لازەکانیش بە شایی (هۆرۆن)[*١٤] بەشدارییان لە ئاهەنگەکە دەکرد، لەم دیمەنە رەنگینەدا کوردەکانیش بەشداری دەکەن. لە مەیدانی رێورەسمەکەدا چادر هەڵدراوەو وازی و شاییەکانی خەڵکانی خۆیانیان پیشان دەدا، کەچی قەرەجەکان بە دەهۆڵ کوتان بەشدارییان لەم جومبشەدا کردووە. دوایت لە کۆڵهەڵگرێکی کوردی پرسیوە کە لەوێ هەڵپەڕکێی کردووە، بۆچی لەم پیرۆزبایییەی پاسکالیایەدا بەشداریی کردووە، لە کاتێکدا خرستیان (دیان) نییە. لەو وەڵامەدا کە وەریگرتووە گوتوویەتی: ((لەوەتی دەستوور جاڕ دراوە، هەر هەموومان یەکین، ئەگەر میللەتێك کەیفخۆش بێ، ئەوانی دیکەش لەگەڵیدا و پێکەوە کەیفخۆش دەبن. ئێستا تاکە کەموکوڕییەکمان ماوە ئەویش لەناوبردنی جیاوازیی هەژار و دەوڵەمەندەو هەموو پێکەوە پارەدار بوونمانە))[٥٦]. هـ.ج.دوایت لەو بیرەوەرییانەیدا کە ساڵی (١٩١٥) نووسیویەتی ئەم قسانەی لە دەمی ئەم کۆڵهەڵگرە کوردەوە دەرچووە بە ((دیدێکی سۆشیالیستی)) هەڵدەسەنگێنێ و بە سەرنجڕاکێشی دادەنێ. بەڕاستیش ئەم وتە بەواتایەی ئەم کۆڵهەڵگرە کوردە، دەکرێ بە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرای ئەوە دابنرێ کە ئەو زنجیرە رووداوە بێتامەی وا بەر لە سالآنێك رووی داوە، لە لایەن کێیانێکەوە دروست کراوە[٥٧]. لەم جۆری کۆڵهەڵگرە کوردە دادوەرەش لە کتێبی (ترومپاچییانی ئەستەمبووڵ)ی (ڕەشاد ئەکرەم کۆچو)دا بەرچاومان دەکەوێ. ئەم کۆڵهەڵگرەی ناوی بەکری کورد (کویرت بەکر) بە هەڵسوکەوت گەلێك لەو پیاوە دەچێ کە لە سەرەوەدا پۆرترێتی کێشرابوو: ((بەکری کوردی یەك لە ترۆمپاچییانی سەردەمی عەبدولحەمیدی دووەم، چالاکترین لاوی هۆبەی دائیرەی شەشەمی شارەوانیی بەیۆغلۆ بوو، لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوکارە ترومپاچییەکان پێکەوە لە شوێنە هەرە بەکارەکانی بازاڕی بەیۆغلۆ کە بەلای شارەوانییەوە پەسەند بووە کۆڵهەڵگریی دەکرد، دەسکەوتی بە پارەی زێڕ، رۆژی خۆی لە بیست لیرە دەدا. ردێن تاشراو، سمێڵ زل، کوردێکی درشتی وەك کەرتە سنۆبەر، لەگەڵ ئەوەی بە رواڵەت سامناك بوو، ئێجگار بە

[*١٤] هۆرۆن: شاییەکی پڕ جووڵەیە و بە هەنگاوی یەکسان و تایبەتە بە خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باکووری ناوچەی دەریای رەش (وەرگێڕ)

56- İstanbul'da Çokkültürlülük, İstanbul Dergisi, no 20, 1997.
57- H.G.Dwight, Constantinople-Old and New, London, 1915, s.332.



بەزەیی بوو، رۆژانە نیوەی ئەوەی دەستی دەکەوت کۆی دەکردەوە، دە قرووشی بۆ شوێن، ئەوەی دیکەش بەو هەژارانە دەبەخشی کە دەرۆزەیان نەدەکرد))[٥٨].

ژمارەی کۆڵهەڵگرەکان کە بەر لە سەدان ساڵەوە لە ئەستەمبووڵ هێزێکی گرنگیان پێکەوە نابوو تا دەهات کەمتر دەبوو و لە کۆتاییدا، لە هەندێك کاتپۆستاڵ (پۆستکارت)ی مێژوویی کە ژیانی کۆنی ئەستەمبوولێیان کردووەتە بابەت، شوێنەواریان بەجێ هێشتووەتەوە[٥٩]، ئەو کۆڵهەڵگرە کوردانەی خەم و باری دنیایان هەڵدەگرت، سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ، ئێستاشی لەگەڵدا بێ و لەم سەردەمەشماندا لە هەندێك ناوچەی دیاری ئەستەمبووڵ، وەك لە سرکەچیدا پەنجەبازی لەگەڵ ژیاندا دەکەن. ناوونیشانی نووسینێکی (محەممەد ئاکتاش)ی رۆژنامەنووس کە چووەتە نێو کۆڵهەڵگرە کوردەکان و لە نزیکەوە چاودێریی ژیانیانی کردووە، وەکو خەمی بە سەدان ساڵ درێژە هەبووی بێ کۆتایی و تەواوبوونی کۆڵهەڵگرە کوردەکانی چڕ کردبێتەوە وایە کە پێیان دەڵێ: ماندووانی مێژوو و شار[٦٠].

58- Reşad Ekrem Koçu, İstanbul Tulumbacıları, İstanbul, 1981, s.191.

[٥٩] نموونەی کۆڵهەڵگرە کوردە کۆنەکان بوونەتە بابەتی هەندێك لەو پۆستکارتانەی جارو بارێك لە ئەستەمبووڵ چاپکراون. بەگشتی ئەو پۆستکارتانەی بەگشتی دیمەنی ئەو کۆڵهەڵگرانەیان دەنواند کە لە بەردەمی قاوەخانەکاندا پۆزیان لێ دەدا هەندێك روونکردنەوەی دوور لە راستییان لە ژێردا دانراوە. بۆ نموونە، وەکو: قاوەخانەی تورك، یان بیرەوەریی سەلانیك. بەتایبەتی: یەکێك لەمانە، سەرەڕای دیمەنی کوردەوارییی، تێبینیی دیکەیان لە ژێردا نووسراوە: ((Sourenir de Salanique)) یان ((Cafe Turk)) ئەم فۆتۆگرافانەی کۆڵهەڵگرانی کوردیان دەنواند، کە لە ئەلبوومێکدا ساڵی (١٩١٧) بڵاوکراوەتەوە، لەم ئەلبوومەدا، وەك روون کردنەوەیەکی تێدایە: بەرامبەر بەم ناڕاستییانە لە گۆڤاری مێژوو و کۆمەڵدا روونکردنەوەیەك بڵاوکراوەتەوە:

Kartpostallar Üzerine, no 171, 1998.
60- Mehmet Aktaş, Sesime Gel, Avesta Yay. İstanbul, 1996, s.14-17.

## پاشکۆکان

### پاشکۆ: (۱)

**لە بارەی نوێکردنەوەی ئەو حوکمەی بۆ پشتگیری لەو بینایانەی لە لایەن کوردەکانەوە لەو زەوییە قۆرغ کراو و سەربەخۆیانەدا دروستکراون کە تایبەتن بە ئاغەڵی ئەو کۆشکەی لە تەرکۆس- دایە و دەوار و ئاژەڵی دیکەیان تێدایە. (۱۲٤٥/٣٤١/٣)**

خەتتی هومایۆن (فەرمانی سوڵتان) بۆ جێبەجێکردنی پێویست دەرکراوە، حوکمێك بۆ نوێنەرانی ناحیەی تەرکۆسی سەر بە قەزای خاسلەر، کە موتەوەللی (سەرکار)ی وەقفەکانی ئەستەمبوولی سوڵتان محەممەد خان و مەیتەرەکانی ئاغەڵی تەلار، کە لە ناحیەی تەرکۆس- دایە، سکاڵایان داوە، ئەو ئاغەڵ و زەوییانەی بە خەتتی هومایۆن هی ئەو دەوار و ئاژەڵانەیە کە لە ئاغەڵی تەلاری میریدا بووە لە ناحیەی ناوبراودا، لە کاتێکدا پێویست بوو دەست لە سنوورەکەی نەدرێ، ئەو ماڵە کۆچەرە کوردانەی کە لە هەندێکی ئەم زەوییانەدا نیشتەجێ بوونە و زەوییەکانیان بەکارهێناوە، کە بەپێی قانوون، ئەوە براوەتەوە کە هیچ مافێکیان بەسەر ئەم زەوییانەوە نییە و زەوییەکان هی سوڵتان محەممەد خانی خودا لێخۆش بووە و لە کاتێکدا بە سەنەد ئەمەیان پێ ڕاگەیەنراوە، ئێستا کە زەوییەکان بە خوتو خۆڕایی سوود لێ وەردەگرن، لەمەو پێشیش بە پێی سکاڵای سەرکاری وەقف و ئاغەڵەوانانی ئاغەڵی کۆشك پشکنەری ئەوقاف و ئەو زاتەی لە لایەن پشکنەری ئەوقافەوە نێرراوە پێکەوە چوونەتە سەر ئەو زەوییانەی نێوان گوندی (قەرەجە وێران)ی ناحیەی (تەرکۆس) و (ئسترانجە) و لەو کۆبوونەوەیەدا کە ئەنجام دراوە، سەرکاری وەقفەکانی سوڵتان محەممەد خانی خودا لێخۆش بوو و



ئەو ئاغەڵەوانانەی بە پێی ئوسووڵی موقاتەعە لە لایەن وەقفەوە تەسەرروفیان بە ئاغەڵەکە کردووە و بەڕێوەبەری ئاغەڵەکە جێگری سەرکاری سوڵتان بایەزید خان و ڕۆژنامە نووسەکەی، ئاغەڵەکە بووەتە وەقفی سوڵتان بایەزید و بە ئامادەبوونی کوردەکانی دانیشتووی گوندی (یایلا) ئەو شوێنەی پێی گوتراوە ئاغەڵ لە خوارووی (ئسترانجا)وە تا چیمەنی (چەلەبی ئۆغڵو) و لە وێوە تا (یاسسی گێچید) و (ویران دەگرمەن) و لەوێشەوە تا (حیسارجك) و (قوشقایە) و وەجاغەکانی گەچ و تا (کەرمە) و (دەربەندی چاشنگیر)ی سەر (کاریەیی جەدید) و بۆ (دەولەتلوکاڤاك) و لەوێشەوە (خانی میدیەیی)، لە دوایەوە بۆ (چایر دەرەسی) و لەوێوە بۆ (تورانلی گوێللەر) و (ئەرەگلییۆڵی) و لە (چۆرلۆ دەرەسی)یەوە بۆ ئاغەڵی کۆن (ئەسکی مەندارا) و لەوێوە بۆ (دەلیکلی تاش) و بۆ (ئەنبار دەرەسی) و مەیدانی کۆستا و پردی (کیریازی) و بۆ چیمەنی (ئسترانجا) و (ئەیازمە) و سنووری (میخالە ئۆغڵو) و لەوێوە تا ئاسیاوی (چەلەبی ئۆغڵو) کە سنوورەکانی تەواو دەبن و لە تەك (باڵتاخۆر)ـەوەیە، زەویوزاری لێکۆڵراوە بە ئوسووڵی موقاتەعە (ڕێوشوێنی زەوی بۆ دابڕین) لە لایەن وەقفی (ئەبولفەتح)ـەوە بۆ ئاغەڵی کۆشك تەرخان کراوە. تەنانەت لە ساڵی (۱۱۲۲) هەزار و سەد و بیست و دوودا لەگەڵ خاوەن موڵکی بە تەسەررووفی دەوروبەرەکەی و لە رووی سنووری ئاغەڵەکەوە ناکۆکییان لە نێودا بووە و لە ئەنجامی دادگاییدا بەڵگەی (حوجەت و تەمەسسوك)مان دراوەتە دەست و لە هەزار و سەد و بیست و چواردا بە بەرچاوەوەگرتنی دادویستیی خاوەنی موڵکداریان و تیمار و خەڵکی ئسترانجە و ئەوانی دیکە، لە کاتێکدا حوکممان بۆ دەرچووە و دراوەتەوە دەستمان. کوردەکان بەوەی کە ((لە وەقفی سوڵتان بایەزید و لە زەوییەکانی پاشا بیگلیتلی-ی ناحیەی چاتاڵجەیە)). بە ناهەق جێنشینی ئەو کێڵگەیەی سەر سنووری ئاغەڵەکەیان و لەسەر داوای پێشلێگرتنیان، جێگری سەرکاری سوڵتان بایەزید و بە پێی وەڵامی کوردەکان ئەو زەوییانەی لە (ساریجە بایرلیغی) و ئاغەڵی (سووسگری)یەوە تا (دەرەئینی) و تا (یالنز پێلید ئەغاجی)، لەوێوە تا ڕێگا، لەوێوە تا (بۆڵلیجا)، لەوێوە تا (تورناڵی گوێلو)، لەوێوە تا (موملیجا)، لەوێوە تا دەرگای (شەبگەلەن)، لەوێوە تا ئەو شیوە گەورە (بویوك دەرە)یەی دێتە (ئسترانجا) و لەوێوە تا (سەڤاد دەرەسی) بە پێی بەڵگەنامەکانی بەردەستمان و بەپێی قسەی خۆیان وەقفی سوڵتان بایەزید و تەسەرروفی کوردەکانە، کاتێك تەماشای ئەو بەڵگەیەی بە دەست سەرکاری وەقفی ئەبولفەتح- دایە و ئەمیری و ئەمەسسوك

و فەتواو ئیعلامەکان دەکرێ جگە لە راستیی قسەکانی سەرکاری وەقف و مەیتەرەکانی ئاغەڵەکە، لە بارەی کێلگەکەوە کە داوای سوێند خواردن لە هەردوو لایان کرا، سەرکاری ئەبولفەتح لەسەر ئەوەی زەوییەکان سەر بە وەقفی سوڵتان محەممەد خانە سوێندی خواردو بە شایەتیی پەنجا کەس سەلماندی و بە هۆی سوێند نەخواردنی عەبدوڵلای سەرکاری وەقفی سوڵتان بایەزید و کوردەکان، بڕیاردرا، کێڵگەکە هی وەقفی سوڵتان محەممەد خانە و هی خاوەنانی ئاغەڵەکەیەو رێگا بە داربڕینەوە لە کێڵگەکە نەدرێ و سەرکاری وەقفی سوڵتان بایەزید و کوردەکان رێیان لێ بگیرێ کە تێیدا نیشتەجێ بن، هەروەها کوردەکان ئاگادار کرانەتەوە کە لە جێی پێشوویاندا دانیشن، بە ئیعلامنامەی ئیبراهیم حەنیف و محەممەد حفزیی پشکنەرانی وەقف و بە پشتگیری لێ کردنی محەممەدی پیری زادەی شەیخولئیسلام، بڕیاری تازەکردنەوەی ئەو فەرمانە درا کە لە سەردەمی سوڵتان مەحموود خاندا دەرکراوە.

**ڕەبیعولئاخری ٢٥/١١٦٨ی ك ٢-٣ی شوباتی ١٧٥٥**

## سەرچاوە:

(İstanbul Ahkâm Defterleri, İstanbul Tarım Tarihı (1743-1757) İstanbul Külliyâtı IV. Proje ve yayın yönetmeni Ahmet Kal'a).

## پاشکۆ: (٢)

### چیرۆکە ڕووداوەکانی سەدەی نۆزدەهەمی ئەستەمبووڵ

لە سەرەتای حوکمدارێتیی عەبدولمەجیددا پلانەکانی رێکخستنەوەی لەشکری تورك هەر لەسەر کاغەز بوون. لە لایەن جەنەڕاڵ (چرزانۆسکی)یەوە بە هاوکاریی دوو ئەفسەری پۆڵۆنی (زابلۆسکی) و (برۆزوزۆکی) نەخشە کێشرابوو. بۆ تۆپچییان پرووسییەکان، بۆ پیادەکان فرەنسییەکان، بۆ سوارەکان ئیتاڵییەکان، بۆ دەریاییەکانیش ئینگلیزەکان، وەکو پەروەردەکار هێنرابوون، بەڵام کەس بۆ چەکهەڵگرتن بانگ نەکرابوو. لە ئییالەتەکاندا (قەڵەمڕەوی ویلایەت) کۆکردنەوەی سەرباز بە زەحمەت بەڕێوەدەچوو و لە مەیاندا وازیان لە پایتەخت هێنا.



لاوان بە کۆمەڵ بۆ لە سەربازی هەڵاتن و تا کراوە، بۆ کار پەیداکردن دەهاتنە ئەستەمبووڵ و جگە لە پیرەمێردو و سەقەت و بۆکار دەست نەداوەکان بەولاوە، کەس لە شارەکاندا نەدەما.

لەو چاخەدا حەسەن ڕەزا پاشا کە سەرعەسکەر (وەزیری جەنگ) بوو. بە رەسەن کورد بووە، لە کاتێکدا لە ناو بازاڕدا خاوەن ئەجزاخانە (دەرمانخانە) بووە، سوڵتان مەحموود کە بە بەردەمی دووکانەکەیدا رەت دەبێ کە بە گەورە نە دەژمێررا، سەرنجی سوڵتان بەوە رادەکێشێ کە تورکیی بە شێوەیەکی زۆر گونجاو نووسیوەتەوە. لە جیهانی خوارەوەوە بەرزکرایەوە، لەوە دوانەکەوت کە ببێتە یەکێك لە پیاوە بە بایەخەکانی حوکمدار. بە مردنی سوڵتان، پشتگیریی والیدەی(*) وەدەست خست و بووە یەکێك لە راوێژکارە سەرەکییەکانی پادشای تازە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لایەنگیرێکی ئاگرینی چاکسازییەکان نەبوو، لە ناحەزەکانیشی نەبوو. ئەگەرچی پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ رەشید و فوئاد پاشادا نەبەستبێ، لەبەر ئەوە نەبووە کە رەخنەی لە باوەڕەکانی ئەوان هەبووە، بەڵکو مانەوەی تورکەکان لە دەسەڵاتدا و بێگومان ئارەزوویان لە بەڕێوەبەرێتیدا پاڵی بەوەوە ناوە کە ببێتە لایەنگیری پیاوە گەورەکانی ریزی پێشەوە، ئەوانەی وەکو محەممەد عەلی پاشای زاوای مەحموود و سەفوەت پاشای تاتاری قرم بوون، پیاوانی سەردەمی کۆن بە سوپاسەوە تێکەڵیان بوون، وەکو حوسێن پاشای بەندەرلی کە پێشتر ئاغای یەنیچەری بووە و دواتر ریشەی ئەوانی هەڵکۆڵی، یانیش وەك تاهیر پاشای لە دەریاوانە ئیتاڵییەکان وەرگەڕاوە، کە لە جەنگی دەریاییی بەرامبەر یۆنانییەکاندا ناوبانگی دەرکردبوو، هەر وەك کەسانی دیکەی لەم چەشنە.

سەرەڕای ئەوەی رەزا سوودی لە رووخۆشیی دوو سوڵتانی یەك لە دوای یەك بینیبوو، لە بواری سیاسیشدا بۆ ئەوەی هەر لەناو ئەو پلانەدا لەگەڵ رەشید پاشادا بمێنێتەوە، ناچاری گەڕان بوو بە دوای پشتگیریدا، بەسەر عەسکەر دامەزرانی ئەو بۆ گەیشتن بە ئامانج، مەرجەکانی دابین دەکرد. پێویست بە سەرباز هەبوو و دەبوو پەیدا بکرێن. رەزا بۆ جێبەجێکردنی ئەمە، رێی ئەو مزگەوتانەی بە ئامانج گرت کە موسڵمانێکی زۆریان تێدا نوێژی هەینی دەکرد. بە هەموو ئەو لەشکرەوە کە لەبەر دەستیدا بوو بە هێزی زابیتە (هێزەکانی ئاسایشی ناوشار) و سەربازەکانەوە گەمارووی هەموو ئەو مزگەوتانەی دا کە لە پایتەختدا بوون. ئیمانداران کە لە مزگەوت دەردەچوون بە ناوی خەلیفە- سوڵتانەوە هەموو ئەو پیاوانەیان لێ دەگیرا کە بۆ

سەربازی دەستیان دەدا و ئەوانە هێنراونەتە ئەو قشڵە بە ژمارە زۆرانەی ئەستەمبوولْ. تەنیا کادیرە بەتاڵەکان لەو فەوجە جۆراو جۆرانەدا ناونووس کران کە هەبوون. بەڕێوەبەرایەتیی سەڵتەنەت پێیانی راگەیاند کە ئەوان سەربازی سوڵتانن، فەتوای شەیخولئیسلام خوێندرایەوە. لە ناو ئەم رەشبگێرەدا ئەوانەی بەڕاستی خەڵکی ئەستەمبوولْ بوون، بۆ بەکارهێنانیان لە خزمەتی پۆلیسیدا جیاکردەوە. بەم پێیە کە رێکخران، سوڵتان لە یەك رۆژدا بووە خاوەنی ٤٠,٠٠٠ پیاو. موسوڵمانان بەبێ لاری ملیان بۆ بەڕێوەبەرایەتیی سوڵتان کەچ کرد. بەڵام ئافرەتان بەرامبەر رەزا پاشا کەوتنە خەباتی ئاشکراو بەرگری. ئاپۆرەیەکی گەورەی ئافرەتان رێیان لێ گرت، چەند یاریدەدەرێکی و ژمارەیەکی کەمی دەوروبەری لەسەر پردی سەرکەنداوەوە رەت دەبوون، فەرمانی بەوانەی دەوروبەرەکەی دا کەمێکی لێ دووركەونەوە و بەکارهێنانی چەکی بە هەر هۆیەکەوە بێ و هەوڵی بە وەرچەرخاندنی ئەسپەکانیان، بڵاوە پێ کردنی قەرەباڵغییەکەی لەو سەربازانەی کە یاوەرانیان پێکدەهێنا قەدەغە کرد.

کوردێکی شەنگ و شۆخ تەنیا بە خۆی، لەسەر پشتی ئەسپەکەیدا، بێ بیرکردنەوە .. ئازایانە، بەڵام زۆر بە هێمنی بە ناوەڕاستی ئاپۆرەکەدا رەت بوو، بەرامبەر سوکایەتی پێ کردنی ئەو ئافرەتانەی سنووری تووڕەییشیان بەزاندبوو و دوعای بەدیان و هەڕەشەکانیان هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. بە پاپۆشەکانیان لێیان دەدا، بەردو تەنانەت تۆپەڵە قوڕیشیان تێ دەگرت. بێ ئەوەی خۆی تێکبدا بە دەستی راستی و بە دەستی چەپی سڵاوی لێ دەکردن و بە زەحمەت بەرەو پێشەوە دەچوو. ئەو ماوەیەی نێوانی وەزارەتی جەنگ و سەرای دۆڵمە باخچەی بەمجۆرە بڕی.

بەسەرو گوێلاکی قوڕاوییەوە چووە حوزووری سوڵتان و چەکدار کردنی (٤٠,٠٠٠) پیاوی پێ راگەیاند، ئەمە یەکەم لەشکری رێکوپێك و کاریگەر بوو. رەزا پاشا ناوونیشانی سەرعەسکەری جیهانی وەرگرت.

لەو کاتەوە، هیچ کەسێك لە چاوی حوکمداردا سوودی لە ریزلێنانی لەوە گەورەتری نەبینیوە و هیچ کەسێك لە ئەنجومەنەکانی ئیمپراتۆرییەتدا گرنگیی پتری وەدەست نەهێنا.

* والیدە (سوڵتان): ناوی (بەزمی عالەم)ە، ساڵی (١٨٥٣ کۆچی دوایی کردووە). ژنی دووەمی سوڵتان مەحموودی دووەم و دایکی سوڵتان عەبدولمەجیدە. (وەرگێڕ)



## سەرچاوە:

(İstanbul Araştırmaları: 3/1997, İstanbul Büyükşehir Belediyesi Kültür İşleri Daire Başkanlığı Yayınları, İstanbul Araştırmaları Merkezi, s.160-162).

## پاشكۆ: (٣)

### سەرۆکی شارەوانیی ئەستەمبوولْ لە ئێستگەی گوێزتەپەدا کوژرا

پیاوێکی بەژن و باڵا کەڵەگەت، لاواز و گەنمڕەنگ (٢٣ی مارتی ١٩٠٦) رۆژی هەینی لە ئێستگەی گوێزتەپە چاوەڕێی لە قیتار دابەزینی ریدوان پاشایان دەکرد.

ریدوان پاشا لەو چەندانەدا شەهرەمینی (ئەمینی شار)ی ئەستەمبوولْ، واتە سەرۆکی شارەوانی بوو. ئەو رۆژە بەر لە هەموان فەرید پاشای ئەڤلۆنیەیی سەدر ئەعزەم (سەرەك وەزیران)، ئەندامی حکوومەت و لەگەڵ لە ریزی پێشەوەبووانی دەوڵەت پێکەوە دوای ئەوەی لە (سەلاملق) واتە لە دابونەریتی نوێژی جەمعەی پادشادا ئامادەبوون مزگەوتی یڵدزی جێ هێشتووە، دائیرە فەرمییەکان کە پشووی حەفتە دەبێ، بە پەلە بۆ هەندێك کاروبار سەری لە مەقام (فەرمانگە)ی خۆی داوە، لەوێ دوای ماوەیەك خەریك بوون بە (ئستمبۆت)ـەکەی[*] پەڕیوەتەوە (حەیدەر پاشا) و دواتر بۆ چوونەوە بۆ ئەو ماڵەی کە ئامادەیی کچانی ئەرەنکۆیی بووە و ساڵی (١٩٤٤) سووتاوە، سواری قیتار (واگۆنی وەزیران) بووە.

قیتار لە سەعات (١٨,١٠)دا گەیشتە گوێزتەپە و ریدوان پاشا ماڵئاوایی لە هەندێك پاشای وەك خۆی کرد کە لە قیتاردا بوون و دابەزی. قیتار کە کەوتە جووڵە، ئەم بۆ ئەوەی سواری عەرەبانەکەی بێت کە لەبەر دەرگای چوونە دەرەوەدا وەستا بوو کەوتە رێ کردن و چووە ناو بینای ئیستگەکەوە (ئەوسا بینای ئیستگەی گوێزتەپە ئەوەی ئێستا نەبووە)، ئەو بینایە بووە کە ئێستا وەکو (لوژمان) بەکاردەهێنرێ. کە قیتار لە گوێزتەپە نزیك دەبووەوە رەمپەیەك دەستی پێ دەکرد و بەرز دەبووەوە تا لای بینای ئیستگەی ئەمڕۆ دەگەیشت و دواتر وردە وردە نزم دەبووەوە. دواتر ئەم رەمپەیە هەڵگیراو بینای ئەمڕۆی ئێستگە دروستکرا. کەچی کۆنەکە، بۆ بەڕێوەبەرانی ئێستگە، بووە (لۆژمان).

هەر رێك لەم كاتەدا چەند ساتێك لە جێی جیاجیاو هەولێی سەرنج رانەكێشانی دراوەو چوار باڵابەرز چاوەڕێ بوون، پیاوی لاواز و گەنمڕەنگ، بە هەنگاوی بێ شڵەژان لە چوار لاوە بەرەو ئەو چوون و چوار پێنج هەنگاویان لە نێواندا مابوو دەمانچەكانیان راكێشاو دەستیان بە ئاگر كردنەوە كرد. ریدوان پاشا بێ ئەوەی هیچ بڵێ بەربووبووە سەر زەوی. هەشت گوللەی بەسەر و سەرسنگ و زگی كەوتبوو و لە یەك ساتدا مرد بوو. بە چەكەكانیانەوە خۆیان بە دەستەوە دابوو، دانیان بەوەدا نابوو كە پاشایان بە زانین و بە مەبەست و خۆ بۆ ئامادەكردن كوشتووە، بكوژەكان ئەم كەسانە بوون:

- عەبدوڵڵای كوڕی محەممەدی بتلیسی- تەمەن بیست و دوو ساڵ.
- محەممەد ئەسعەدی كوڕی سەعدوڵڵای وانی-ی تەمەن بیست و دوو ساڵ.
- ئەمین عەبدوڵڵای كوڕی تاتاری هەكاریی- تەمەن سی و پێنج ساڵ.
- ئەحمەدی كوڕی محەممەدی وانی-ی تەمەن سی و پێنج ساڵ.

ریدوان پاشا لەو كەسانە بوو كە متمانەی عەبدولحەمیدی دووەمی وەدەست خستبوو. نزیكەی شانزدە ساڵ سەرۆكی شارەوانیی ئەستەمبووڵ بووە. ئەوسا، كە بوو بە قوربانیی ئەم تیرۆركردنە، پەنجاو یەك ساڵان بووە. بە پیاوێكی زۆر راست و بە نامووس ناسراوە. خوێندنێكی رێكوپێكی دیتبوو. لە ژووری وەرگێڕانی بابی عالییەوە پێگەیشتبوو و فەرەنسییەكی باش فێر بوو بوو. دوای ئەوەی لە هەندەران كاری كردبوو، لە كارێكی بە بایەخی وەك سەرنووسەرێتیی یەكەم مەجلیسی مەبعووسانی عوسمانیدا كە ساڵی (١٨٧٦) كرابووەوە، دامەزرابوو. دواتر لە دادوەرێتیی ترابزون، بورسە و سەلانیك و لە نووسەرێتیی سەراو لە راوێژكارێتیی ناوخۆییدا كاری كردووە و ساڵی (١٨٩٠) لە سەرۆكایەتیی شارەوانیی ئەستەمبووڵ دامەزرابوو.

رێدوان پاشا، لەو فەرمانانەدا كە بینیبوونی لە هەموویاندا توانستی پلەیەكی مامناوەندیی نواندووە، كەچی عەبدولحەمیدی دووەم لەبەر ئەوەی ئەو كەسانەی لاپەسەند بوو كە لەگەڵ خۆیدا راستگۆ بوون و لە توانایی كاریاندا ((مامناوەندی)) بوون. بڕیاری دابوو تا دوایی ئەو هەر لە سەرۆكایەتیی شارەوانیدا بەكاربهێنێ. ریدوان پاشا كە هەر لە كۆنەوە جددی و



بەسەرگرانی ناسرابوو، وردە وردە بەم پشتگیرییەی پادشاوە لە روو دەرچوو بوو، پۆزی ((چیا گچكەكان من رۆمناون))ی لێداوەو بە پێی ئەمە دەستی بە هەڵسوكەوت كردبوو.

كەچی لەم دەورەدا كەسێكی دیكەش هەبوو كە پێی وابوو خۆی چیا گچكەكانی خوڵقاندوون عەلی شامیل پاشای بەدرخانیی قومانداری قشڵەی سەلیمییە. بەدرخانییەكان بنەماڵەیەكی بەناوبانگی باشووری خۆرهەڵات بوون. بەدرخان پاشای باپیری عەلی شامیل پاشا، بەگزادەی جزیرە بوو و بە حەوت پشت دەگەیشتە شەرەفخانی بتلیسی، رەسەنی ئەوەش بۆ سەلاحەددینی ئەییوبیی بەناوبانگی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەییوبی و بەو هۆیەوە دەگاتە خالیدی كوڕی وەلیدی موجاهیدی گەورەی ئیسلام و سەركردەی.

عەلی شامیل پاشا لەگەڵ ئەو خۆبەختكەرانەی كۆی كردبوونەوەوە بەشداریی لە جەنگی عوسمانی- رووسی (١٨٧٦-١٨٧٧)دا كردووە كاریگەرییەكی گەورەی نوواندووەو پێی زامدار بووەو بە شەلی ماوەتەوە. عەبدولحەمیدی دووەم، بەدرخانییەكانی گەلێك پشتگیری دەكرد. ئەوانیش لەگەڵیدا راستگۆ بوون. هەروەها عەبدوڕڕەززاق بەگی هەر ئەم بنەماڵەیە، وەك مەئمووری تەشریفات فرمانی ئەنجام دەدا و لە ژێر چاودێریی تەحسین پاشای سەرنووسەری مابەین و لە پیاوە نزیكەكانی پلەی یەكەمی پادشا بوو.

عەلی شامیل پاشا لەبەری (ئویسكویدار)دا ئەوەی هەڵیدەواسی هەڵیدەواسی و ئەوەی دەیبڕی دەیبڕی. هەر كەسێكی بویستایە دەیگرت، فەلاقەی دەكرد، لە قشڵەدا بەندی دەكرد، لەبەری ئەوبەردا ئاسایی، دەرەبەگایەتییەكی دانابوو. نەیدەهێشت ریدوان پاشا تێكەڵی كاروباری شارەوانی بێ، ئەسنافی (خاوەن پیشە)كانی كۆنترۆڵ كردبوو، كەسێك كەموكوڕییەكی هەبایە بە خۆی سزای دەدا، بەڵام فەقیرو هەژاری دەپاراست، چاودێریی مافەكانیانی دەكرد، بۆیە لە لای خەڵكی زۆر خۆشەویست بوو، لەبەر ئەوەی ئەو ناوەی چاوشكێن كردبوو كەس نەیدەوێرا شكات بكا، سەر بۆ فەرمانەكانی دانەنوێنێ.

لەو دەمانەدا عەبدوڕڕەززاق بەگ، لە نێوانی شیشلی و نیشانتاشیدا خانوویەكی نوێی بینا كردبوو، بەڵام ئەو كۆڵانەی ماڵەكەی لێ بوو رێیەكی خۆڵ بوو بەردڕێژ نەكرابوو. هەینییەك عەبدوڕڕەززاق بەگ لە كاتی سەلاملق (رێوڕەسمی نوێژی هەینیی سوڵتان)دا بارەكەی بە ریدوان پاشا گەیاندووەو تكای بەردڕێژكردنی كۆڵانەكەی لێ دەكا.

ریدوان پاشا، لەبەر ئەوەی عەلی شامیل پاشا، سەرەڕای ئاگادار کردنەوەی تێکەڵی کاروباری شارستانی دەبوو، بەهۆی ئەمەوە دڵی لە بەدرخانییانیش شکابوو. بۆیە وەکو تکاکەی قبووڵ کردبێ وا دیاربوو تەنانەت وەکو لەم بارەیەوە دەردەکەوێ بەڵێنیشی دابێ، داواکەی جێبەجێ نەکردووە. عەبدوڕڕەززاق بەگ لە چەند ڕێوڕەسمێکی سەلاملقدا ئەو تکایەی هەر دووبارە کردووەتەوەو وەڵامی بەجێ هێنانی وەرگرتووە، کەچی کۆڵانەکە هەر بەردڕێژ نەکراوە، بۆیە ئەمەی بەرامبەر ریدوان پاشا خراپ لە دڵ گرتبوو و بیری لە چارەسەری تۆڵە لێ سەندنەوە کردووە. ریدوان پاشا هەمیشە پیاوێکی بە ناوی ئەحمەد ئاغای لە خزمەتدا بووە. عەبدوڕڕەززاق بەگ ئەوی بە پیاوانی خۆی بەگرت داوەو لە ژێر خانی ماڵەکەیدا بەند کردووەو هەواڵی بۆ ریدوان پاشا رەوانە کردووە:

- ئەگەر کۆڵانەکە بەردڕێژ نەکەی ئازادی ناکەمەوە.. ریدوان پاشا، بەم زۆرداریيە زۆر خراپ تووڕە دەبێ و لەڕێی تەحسین پاشاوە شکاتی لە لای پادشا لێ دەکاو ئەگەرچی بۆ ئازادیی پیاوەکەی تکای فەرمانیشی کردبێ، وەڵامێکی دەست ناکەوێ، عەبدولحەمیدی دووەم بە مەبەستی زیز نەکردنی هیچ لایەکیان لە خۆی، خۆی لە دەرەوەی ئەم کێشەیە راگرت. ریدوان پاشا لەسەر ئەمە بڕیاری بە زۆر وەرگرتنەوەی ئەحمەد ئاغای داو تاقمە کەناسێکی دەست بە قازمەو پێمەرەو کوتەك دەنێرێ و بەسەر ماڵەکەدا دەدەن، لەم بارەدا کارەکە بە پێکدادانی چەکدارانە دەگۆڕێ، بەدرخان بەگی برای عەبدوڕڕەززاق بەگ کە لە ئەفسەرانی لەشکری خاسسە بووە بە گوللە دەمانچە بریندار دەکرێ. بەمجۆرە ئەحمەد ئاغا رزگار کرا، ئەوانەی رزگاریان کرد، هەر بەوەندە نەوەستان، هەموو لایەکی کۆڵانەکەیان هەڵکەندو وایان لێ کرد کەڵکی پێدارۆیشتنی نەبێ.

نۆرەی شکات کردن ئەمجارەیان هی عەبدوڕڕەززاق بەگ بوو. بەخۆی کە یەکێك بوو لە کارەمەندانی سەرا، ئەگەرچی بەسەر ماڵەکەیدا دەدەن و بەزۆر چوونە ژوورەوەو بە سەختی بریندار بوونی براکەی و بەمجۆرە دەست درێژی بۆ سەر گیانی کردنیشی لە ڕێی تەحسین پاشاوە، عەرزی خونکار کردبێ پادشا ئەم جارەش تێکەڵی کارەکە نەبووە. بەمجۆرە دۆزەکە بۆ بەدرخانییان قاڵبی عیززەتی نەفسی وەرگرت و لەسەر ئەمە، عەلی شامیل پاشا هاتە ناوەوەو



ئەو کردەوەی کوشتنەوەی لەسەرەوە باسمان لێوە کرد، رێکخست و ریدوان پاشای بە پیاوە راستگۆکانی خۆی بە کوشت دا.

## کۆتایی بەدرخانییان

ڕووداوەکە جۆش و خرۆشێکی گەورەی لەناو شاردا ورووژاند، کوشتنی وەزیرێك، سەرۆکی شارەوانی بێ و بە نزیکیی لە پادشاوە ناسراوە، بەمجۆرە لە پێش چاوی خەڵکیدا کارێکی کردە نییە. بەڵام عەبدولحەمیدی دووەم دیسانەوە لە ناو نیگەرانیدا بوو. نەیدەویست بەدرخانییەکان بشکێنێتەوەو نە چاوپۆشی کردن لە کوشتنی بەم شێوەیەی ریدوان پاشاش لە توانادا بوو. فەرید پاشای ئەڤلیۆنیایی-ی سەدر ئەعزەم (سەرەك وەزیران) دۆستی نزیکی ریدوان پاشا بوو، سەرەڕای ئەمەش لەبەر بارودۆخی سنوور بەزێنی و لە روو دەرچوونیان، بەدرخانییانی خۆش نەدەویست و دەیویست بە بیانوویەك لە پێش چاویان بخات و سەرکوتیان بکا. وەکی دی بەوەی پێویستیی فرمانی بوو بێگومان لەگەڵ چاوپۆشی لە رووداوەکەدا نەبوو، کە دوو دڵیی پادشا دەبینێ وەزیری دادو وەزیری ناوخۆ دەخاتە تەك خۆی و دەچێتە حوزووری پادشا و بەمجۆرە دەست بە ئاخافتن دەکا:

ئەگەر لەبەرچاوی خەڵکیدا کوشتنی فەرمانبەرێکی بەرزترین پلە، کە ئەرکی ئاسایشی ناوەندی دەوڵەتی لە ئەستۆدا بێ و تا پلەی وەزیری بەرزبووبێتەوە، بەمجۆرە بایەخێکی پێ نەدرێ، ئەنجامی زۆر قورسی لێ دەکەوێتەوەو ئەگەر تۆقێنەرانی ئەوان بە پێی قانوونی سزا، سزا نەدرێن، شەرخوازان بێترس دەبن و دواییش وەزیرانی دەوڵەت هەموویان بەرەو رووی ئەو مەترسییە دەبنەوە.

وەك هەموو جارێکی دیکە، فەرید پاشای سەرك وەزیران، تا بێزار و دڵگران کردنی پادشا قسە دەکا و بەدەمییەوە بە چاکی بزواندنی بیمە بەناوبانگەکانی ئەوی لە بیر نەدەکرد. لەسەر ئەمە خونکار (سوڵتان) ناچار بوو رێ بە جێبەجێ کردنی پێویستیی قانوون سەپاندن بدا.

لە ماوەی بەڕێوەچوونی دادگایی کردندا، روون بووەوە کە ئەم کارە لە ئەنجامی فشاری تۆقێنەری بەدرخانییاندا هاتووەتە گۆڕێ، لەسەر ئەمە، وەکو ئەوەی چوار بکوژەکە حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو، بە عەلی شامیل پاشاوە، بەشێکی زۆری بنەماڵەی بەدرخانی بەرەو

تەرابولسی غەرب(*) و بەشەکەی دیکەشی بۆ شام دوور خرانەوە، تا جاڕدانی مەشرووتییەتی ساڵی (١٩٠٨) لەوێیانە مانەوە، ئیدی دوای ئەمە بەر لێبوردن کەوتن و توانییان بگەڕێنەوە. عەلی شامیل پاشا کە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە زینداندا ماوەتەوەو ئەم ئەنجامەی هەرگیز بەبیردا نەدەهاتەوە، زۆری لا گران بوو و لەوێ نەخۆش دەکەوێ و بێ ئەوەی لەم لێبوردنەوەیە سوودمەند بێ و بگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ، مردووە. لەو سەردەمانەدا تەمەنی (٥٣) ساڵان بووە. ئەگەر چی بەپێی قسەی خۆی نەك کوشتنی ریدوان پاشا، تەنیا هەندێك ترساندنی بە پیاوانی خۆی راسپاردووە. ئەم پیاوە نەزانانە بە نیازی ئەوەی گەورەی خۆیان پتر مەمنوون بکەن و لە نێو خۆیاندا بڕیاری ئەوەیان داوە کە تاوانەکە بە تەواوی بگرنە ئەستۆی خۆیان و ئەم تاوانەیان ئەنجام داوە.

بەڵام دادگا ئەم قسەیە قبووڵ ناکاو ئەو و عەبدوڕڕەززاق بەگی پێکەوە بەهاوکاری بە تاوانی ((هاندان و ناچار کردنی)) بکوژەکان تاوانبار دەکا و بە پێی ئەوەش بڕیارەکەیان داوە.

## سەرچاوە:

(Midhat Sertoğlu, İstanbul Sohbetleri, İstanbul, 1992, s.65-68).

* ئستمبۆت: کەشتیی گچکە (وەرگێڕ)

* تەرابولسی غەرب: لیبیا (وەرگێڕ)

## پاشکۆ: (٤)

### شوکری بابانی مام و مامۆستام

شوکری بابان مامیشمە و ئەو ساڵەی لە کۆلیژی ماف دەرچووم، مامۆستام بوو. (١٩٣٣) لە شۆڕشی زانکۆدا، لە بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەی (مولکییە)وە کراوەتە مامۆستا (پڕۆفیسۆر)ی رێبازە ئابوورییەکانی کۆلیژی ماف. کە ئەم هەواڵە بیسترا، هەموو برادەرە قوتابییەکان خەمیان لێ نیشت. ((شوکری بەگ زۆرمان پێ دەخوێنێ، لە تاقیکردنەوەکاندا



گاڵتە بە قوتابییان دەکا، پرسیار لە دەرەوەی کتێب دەپرسێ، لە لێکۆڵینەوەدا لە بارەی قوتابییانەوە بە پێودانگی خودیی خۆی قوتابی هەڵدەسەنگێنێ)).

دواتر، هاتە پۆلەوە، بۆ ئێمە، واتە بۆ سێ پۆل، دەستی کرد بە راڤەکردنی رێبازە ئابوورییەکان. بابەتەکە لە لایەکەوە زۆر بە زەوق بوو، لە لایەکی دیکەوە بە زانایی و بە تام باسی لێوە دەکرا. هەمووومان بە جددی و بە پابەندییەکی زۆرەوە گوێمان لێ دەگرت. تێگەیاندنی وانە، بەو شێوەیەی هەموو قوتابییان دەیزانن، بەیانییان کاتێك لە ماڵەوە دەردەچێ کە لە (فەنەر یۆڵو) دایە، ئەو گوڵە مێخەکەی لە باخچەیەوە کردوویەتییەوەو بە بەرۆکییەوەیە، لە لایەکی پلیکانەکانییەوە دادەبەزێ و سەردەکەوێتەوەو پیاسە دەکا، هەموو سەرنجێك بەرەو خۆی رادەکێشێ، لە راڤەکردنەکان و راپۆرتەکانیدا لایەك بە ئاڵۆزی ناهێڵێتەوە تێگەیشتنی زەحمەت بێ.

کە لە تاقیکردنەوەکان نزیك دەبووینەوە لە پۆلدا خەمێك پەیدا دەبوو و دواییش رۆژی تاقیکردنەوە دەهات. ئەوانەی پێیان وا دەبوو دە وەردەگرن، کە نمرەکان دەخوێندرانەوە بینییان سێیان وەرگرتووەو کەوتنە گریان، هێشتا برادەرە خانمەکان چونکە بایەخ بە لەبەرکردن دەدەن، وەڵامی پرسیارەکانیان تووتی ئاسایی دابووەوە.. بە هیچ جۆرێك نەیاندەویست لەو فشارەی مامۆستا شوکری دەیخستە سەر ئەو شێوەیە تێبگەن. کەچی من چونکە دەمزانی لە ژێر دەستەواژەی ((چاودێریی برازاکەی کرد))ی پڕۆفیسۆردا سەر کۆنە دەکرێم زۆرم سەعی دەکرد، بەڵام دیسانەوەش بە دڵنیاییەوە لەسەر کورسیی تاقیکردنەوەدا دانەنیشتووم.

– رۆبەرت ئۆوین ناوێك دەناسی؟

– دەناسم.

لە کاتێکدا بە درێژایی ساڵ، هیچ باسی ئۆوینمان نەکردبوو.

– ئایا ئەم زاتە لە بارەی مافی موڵکایەتییەوە کتێبێکی هەیە؟

لەبەر ئەوەی رێتێچوونی، نووسینی کتێب لە لایەن کەسێکەوە، لە چاو نەنووسینییەوەدا کەمترە، گوتم:

- کتێبی لە بارەی موڵکایەتییەوە نییە.

- ڕاستە، نییەتی .. بەڵام داخوا بەمن دەڵێی، ئەگەر کتێبێکی وەهای نووسیبایە، چیی دەنووسی؟

من بەبێ دوو دڵی وەڵامم دایەوە:

- لە بارەی موڵکایەتییەوە دەینووسی، ئەو سەری بڵند کردەوە، وەها، ڕۆبێرت ئۆوین لە ئینگلتەرە لە پێشەنگەکانی سۆشیالیزم بوو. ئەو ئەمەم پێ دەڵێ و هەوڵی ڕاگەیاندنی دڵگرانیم دەدا، من هەستم بەمە کرد و بێ ئەوەی بیری خۆم ڕوون بکەمەوە، واتە بەمەبەستی ئەوەی ڕێی سووربوونەوەی بەرامبەر گوێگرانی لێ بگرم بەوەی دیلی قسەکانی خۆیەتی، ئەم وەڵامەم دایەوە:

- لایەنگیری موڵکایەتیی دەکرد چونکە کرێکارانی ئەو کارگەیەی دایمەزراندبوو و خستبوویە کاری، کردبوونە هاوبەش، ئەزموونەکە سەری نەگرت، بەڵام ئایا هاوبەش کردنی کرێکار نابێتە بەڵگەی لایەنگیریی موڵکایەتی؟

سێ چوار ساڵ لەمەوبەر ئەوسا کە ڕۆبێرت ئۆوینم بە قوتابیی غەڵەتە سەرای زانی و خستمە سەرکار، کاتێك ئەو کتێبەی سوبحی نووریم خوێندەوە کە بەناوونیشانی (لایەنگیریی کۆمەڵە هاوکارییەکان)ـەوە بوو زانیبووم و لە بیرم نەکردبوو.

لەکاتێکدا و بە هەر حاڵ ئەو چاوەڕێی بوو من بڵێم: ((کە سۆشیالیست بوو، دژی موڵکایەتی دەنووسێ)).

لێی وەستاو بیری لێ کردەوە، کە هەستی بە بوونی لایەنی ڕاستیی دەکردم، منیش بۆ لابردنی دوو دڵیی ئەو درێژەم بە قسە دا.

- گوتم، گوتنی قسەیەکی یەکلاکەرەوەش دەبێتە هەڵە، ئێمە لە بارەی شتێکی نەبووەوە بیرمان خستە گۆڕێ، ئایا گفتوگۆ لە بارەی شتێکەوە کە نەبێ، دەبێ و حوکمی لەسەر دەدرێ؟.



لە هێڵەکانی سەر ڕووی مامەوە هاتنەوە سەر باری خۆم هەست پێ کرد، ئەگەر هەر بڕێ بڕێ، بۆ ئەوەی ((نەڵێن نمرەی تەواوی داوەتە برازاکەی)) یەك دوو نمرەی لێ دەبڕیم، هەر وەهاشی کردو (٨)ی داپێم. ئەو ئێوارەیە کە لە کۆلیژ دەرچووین و دەچووینەوە چاوەڕوانیم کرد، خۆم لێ بردە پێشەوە.

- گوتی: خراپ نەبووی بەڵام تۆزێ پترم تەنگاو بکردیتایە؟

- بێگومان گەورەم، بەمجۆرە وەڵامم دایەوە، ئەگەر مامۆستا بییەوێ قوتابییەکەی بخاتە خوێندنەوە، هەرچۆنێك بێ چارەیەکی بۆ دەدۆزێتەوە، کەوتینە پێکەنین، کە لە پرۆفیسۆر جیابووینەوەو گەڕامەوە کۆلیژ ئەو خانمە برادەرانەی داوێنەکانیان بەسەر پلیکانەکاندا ڕاخستبوو بەچاوی ئاوساوەوە بەد دۆعا (دۆعای خراپ)یان لە مامۆستا دەکرد، یەك واژەم نەگوت.

شوکری بابان ساڵی (١٨٩٠) لە بەغدا لە دایك بووە، ئەوساکە، زهنی پاشای باوکی موهرداریێتیی واتە بەڕێوەبەرێتیی قەڵەم (نووسینگە)ی تایبەتیی مدحت پاشای والیی بەغدای ئەوسای بەدەستەوە بووە، مستەفا زهنی پاشا کە بە موهرداریێتی (مۆردار) دەستی بە ژیانی بەڕێوەبەرایەتی کردبوو، لە کەربەلا و یەمەن و بۆلۆ و تەرابولسوششام (شاری تەرابولسی لوبنان)و بوردوردا موتەسەرریفێتیی کردووە، دواتریش والیی یانیە و ئەدەنە و حیجاز، لەو دەمەدا کە لە بۆلۆدا موتەسەرریف بووە، لەبەر دانانی کتێبێکی لە بارەی شیاو و ڕاست نەبوونی بەخشینی خەلیفایەتی بە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە، بەر لەوەی بڵاوبکرێتەوە زمانی لێ دراوە، بەسەر ماڵیان داداوە، کتێبیان نەدیتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمە زهنی پاشایان بۆ قەستەمۆنی دوورخستەوە و پاشاش بۆ ئەوەی بەڵایەکی نەیەتە سەر کتێبەکەی سووتاندووە.

شوکری بابان کە لە غەڵەتە سەرایدا قوتابی بووەو لە پشوودا کە چووەتە بۆلۆ بۆ لای باوکی لەناو هەڵچوونەوەی ئەم ڕووداوەدا ژیاوە.

شوکری بابان کە غەڵەتە سەرایی تەواو کردووە، لە لایەن ئیسماعیل حەققی بەگی نووسەرو یەك لە وەزیرە کۆنەکانی مەعاریفی برای گەورەیەوە کە (١٤) ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو،

نێردرایە پاریس. حوسێن شوکری (حوسێن ناوی زهنی پاشای باوکی بوو) لە پاریس کۆلیژی مافیش و قوتابخانەی، زانستە سیاسییەکانیشی خوێند و خوێندنێکی سەرکەوتووی ئەنجام داو گەڕایەوە وڵات.

شوکری بابان، گچکەترینی بنەماڵەی زهنی پاشا، تاکە منداڵی دایکیشی بوو، منداڵەکانی زهنی پاشا بە پێی سەرەیان، ئەحمەد نەعیم-ی (ئەندامی ئەعیان) و مامۆستای مێتافیزیك و فەلسەفەی دارولفونوون (هونەرە جوانەکان)، ئیسماعیل حەققیی نووسەری سیاسیی رۆژنامەی (تەنین) و مامۆستای بناغەی ماف (حوقووقی ئەساسی)ی قوتابخانەی موڵکییە، لە نێوانیاندا کچێك، ئەمینە، ...

عاسم کە موتەسەرریفی قەرەحیسار بووە گرانەتا لە تافی لاویدا ژیانی کردە ئامانج و پێکای، دوای ئەویش، سولەیمان حیکمەت دێ کە کۆنە مەبعووسی (نوێنەر- نێردراو)ی سلێمانی بووە. ئەمانە منداڵەکانی فەیرووز خانمی هاوسەری یەکەمی پاشا بوون، حوسێن شوکری کوڕی ئیجلال خانمی هاوسەری دووەم بووە کە هەوێیی فەیرووز خانم بووە. دایکی کە بەرامبەر شوکری خۆشەویستیی لەوانی دی پتر دەردەبڕی، ئەمەش بەلای ئەوانی دیکەوە غەریب نەبوو، بەڵام شوکریش بەری لەو گرێ دەروونییە نەدەگرت کە هەر هەموو پێکەوە دەیانویست بەرەنگاری بن. ئەو بۆیە لە چاو ئەوانی دیکە پتر بە ناخی خۆدا چوو و بێدەنگتر بوو.

مستەفا زهنی پاشا نوێنەری جۆری باوکسالاریی خانەوادە بوو. هەموو خێزانی لەسەر سفرەدا دەبینی، دوای خواردنی ئێوارە بۆ ئەوەی جگەرەکێشان بۆ منداڵەکانی دابین بکا بەجێیان دەهێڵێ و دوابیش هەموو پێکەوە لەگەڵ ئەو میوانانەی دەهاتەماڵیان لە سالۆندا دادەنیشتن و دەپەیڤین. بێگومان وەکو لە هەموو کۆمەڵێکی پیاواندا باسی سیاسەتیش دەکرا. نەعیم بەگ لەناو ئیتتیحادییەکان دەرچوو بوو و پتر دنیای لە روانگەیەکی ئایینییەوە دەبینی. ئیسماعیل حەققی و حیکمەت بەگ ئیتتیحادی بوون، عاسم بەگ چونکە بە کارمەندی لە هەندەران دەگەڕا تێکەڵی ئەم گفتوگۆیانە نەدەبوو، لە کاتێکدا بابە پاشا لەم گفتوگۆیانەدا بەو ئۆتۆریتە (سەرکردایەتی — مافی سەرکردایەتی)یەی دایدەدا (تەلقینی دەکرد) هاوسەنگییەکی دادەمەزراند، بە حوکمدانێکی لەسەر راهاتووەوە کە لە رەوشتی دەوەشایەوە لە دامەزراندنی هەڵسەنگاندندا زەحمەتێکی نەدەکێشا، لەناو سیستەمی بنەماڵەی باوکسالاریدا باس لە



هەموو شتێك دەکرێ و گفتوگۆ لەسەر هەموو بیرێك دەکرێ بەڵام کەس بۆچوونی خودی خۆی ناگەیەنێتە ئاستی بێزارکردنی ئەوانی دی.

منداڵەکانی زهنی پاشا لە چوارچێوەی بنەماڵەدا وا پەروەردە کرابوون بەرامبەر یەکدی لێبوردە بن. شوکری بابان خۆشەویستترین کەس و ئەوەی هەستی دەکرد نزیکترین کەسە لەلای، ئیسماعیل حەققی بەگی براگەورەی بوو، چەند مخابنە کە ئەم کاکە خۆشەویستە لە (١٩١٣)دا کاتێك لە قوتابخانەی مولکییەدا وانەی دەگوتەوە لە ئەنجامی خوێنبەر بوونەوەی مێشکدا کۆچی دوایی کردبوو، ئەوسا کە مرد لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا بوو. قوتابییانی لە بارەی مێژووی مردنییەوە ئەمەیان نووسیوە:

**محتاج نور أفقده سوندکمی؟ سن حیات**

**تاریخك أولدی؛ روشن أی نیر کمالات**

ئیسماعیل حەققی بەگ کە لەو سەردەمەدا نووسەرێکی سیاسیی چەمك خۆرئاوایی بوو، لە بارەی بەرزبوونەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف (پەروەردە) لە کابینەی حەققی پاشادا ناوبانگێکی شایستەی لە وڵاتدا وەدەست هێنابوو، شوکری بابانیش هەر دەبێ لەبەر ئەو نزیکییەوە لێی، دڵی چوو بێتە سەر نووسەرایەتی.

مامم دوای گەڕانەوەی لە خوێندنی ئەورووپاوە، لە کۆمیسێرییەتیی سەراسای میسر دامەزرێنرا، حیکمەت بابانی برا گەورەی، بەر لەم کارەدا بووە، بەڵام مستەفا کەمال کە چووەتە تەرابولسی غەرب بۆ خەبات کردن لە دژی ئیتالیاییەکان، لەبەر ئەوەی ئەنوەر و فەتحی بەگ لە میسرەوە پەڕیونەتەوەو چوون. حیکمەت بابان ئاسانکاری و رابەرایەتیی رێگای بۆ کردوون، حکوومەتی ئینگلیز کە سەری لە دەوڵەتی عوسمانی داوە، داوای گێڕانەوەی ئەم نووسەرەی کردووە. حکوومەتی عوسمانی لەسەر ئارەزووی ئینگلیز ئەگەر کارمەندی بگێڕابایەوە دەبووە رووداوێکی شەرەف شکاندن، لەسەر ئەوە لە هەڵبژاردنی تەواوکاریدا حیکمەت بابان بووە نێردراوی سلێمانی. بەم شێوەیە لە کارەکەشیدا نەما. لەسەر ئەمە برابچووکیان، واتە شوکری بابانیان ناردە میسر، کە یەکەم جەنگی جیهانی دەستی پێ کرد، هاوپەیمانان ئەمجارەیان یەخەگیری ئەمیش بوون و لە میسرەوە دەرچوونی ئەمیشیان داوا کرد.

بەمجۆرە ئەم لاوە فەرمانبەرە بە نرخە دوای ماوەیەك لەو لیژنەیەدا کە دەچووە (برێست لیتۆڤسك) فرمانی وەرگرت. لە پاش ئاشتیشدا لە سەردەمی باڵیۆزیی غالب کەمالی-ی سۆیلەمەز ئۆغلو نێردرایەوە مۆسکۆ، شوکری بابان کە دوای ئاگربەس گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ کە بەڕێوەبەری قەڵەمی (نووسینگە)ی تایبەتی وەزارەتی ناوخۆ بووە، لە لایەن عیززەت بەگەوە کە وەزیری هاوبەشی (ئیئتیلافی) بووە لەم کارە دوور خراوەتەوە، ئەویش چووە سەر رۆژنامەی تەرجومان کە لە لایەن حیکمەت بابانەوە کڕابوو دەستی بە رۆژنامەگەریتی کرد. رۆژنامەیەك بوو هەر بە ناوەکەی خۆی (تەرجومانی حەقیقەت) لە ئەستەمبووڵ یەکێك بوو لەو رۆژنامانەی پشتگیریی خەباتی نەتەوەیی و مستەفا کەمال (ئەتاتورك) یان کردووە. بۆ نموونە دوای سەرکەوتن، شوکری بابان بە ناوی رۆژنامەکەی و خوێنەرانییەوە شمشێرێك وەك دروشمی سەرکەوتن بۆ مستەفا کەمال دەبا. دواتریش راوێژکاری مافی کۆمپانیای شەکر لە ساڵی (١٩٢٦)دا لە قوتابخانەی مولکییەدا بە مامۆستای ئابووری و رێبازەکانی دادەمەزرێنرێ، دوای ماوەیەکی کەم بووەتە بەڕێوەبەری هەر ئەو قوتابخانەیە.

دوای ئەوەی مولکییە گوازرایەوە ئەنقەرە، شوکری بابان کە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی باڵای بەدەستەوە بوو وەك لە سەرەوەش باسمان کرد لە (١٩٣٣)دا وەکو پرۆفیسۆری باڵا هاتە زانکۆ.

شوکری بابان، ناوی بەشێکی زۆری ئەو قوتابییانەی لە کۆلیژی ماف (حوقووق) و قوتابخانەی باڵای بازرگانی و کۆلیژی ئابووریدا پێیانی گەیاندبوو، دواتر لە نێو ئەو ناوانەدا بینی کە لە وڵاتەدا ناسرابوون، بەڕێوەبەرە گشتییەکان، پشکنەرە داراییەکان، تەنانەت وەزیرەکان لەو کەسانە بوون کە لە ئەزموونەکانی بەردەمیدا ئارەقەیان رشتبوو.

من ئەم دێڕانەم یەکەم وەك برازای خۆی و دووەم وەك قوتابی و ئینجا وەك هاوپیشە دەنووسم، بەمجۆرە من هەر وەکو لە دەرەوە، هەروەها لە ناو بنەماڵەشدا بینیومە و لەو بڕوایەدام تا پێم کراوە گەیشتوومەتە حوکمێکی راستگۆیانە. زیرەکییە زۆر بەرزەکەی کەموکوڕییەکی هەبوو، کەموکوڕییەکی وەها لە ناوەندی ئەکادیمیدا دیسانەوە چەند کەسێکی دیکەی زۆر زیرەکم بینی بوو. ئەوانەی وەك ئەم کە لە بارەی شتێکەوە خەریکی لێکدانەوە دەبوون لایەنە



شیاوەکانیان حسێب بۆ دەکردو لە نێو ئەو رێتێچوونانەدا بایەخی لە رادەبەدەریان بەو رێتێچوونە دەدا کە لقوپۆپی هەیە.

شوکری بابان بە ساڵدا چوو، بەڵام ژنی نەهاورد، بەر لە نەخۆشییەکەی بۆ کۆتایی هێنان بەو ژیانە بە تەنیا بەسەری دەبرد کە تکای ژنهێنانمان لێ کرد ئەو بە هەزاران کەسی شادمانی نەدەدیت، هەمیشە برادەرێکی نێگەتیڤی نزیکی خۆی بە نموونە بۆ ئێمە دەهێنایەوە، ((ئەو پیاوە بەستەزمانە بە ئامانجی ئەوەی لە پیریدا خزمەت بکرێ ژنی هێناوە، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم لەبەر ئەوەی خانمەکە چاوی کوێر دەبێ، ئەو خۆی ناچار بووە چاودێریی ژنەکەی بکا)). ئێمە کە رێتێچوونی لە سەدا زۆر کەمی شتی وەهامان پێ دەگوت:

– لێمان دەپرسی، ئایا شتی وەها نابێ، کە پێمان دەگوت ئەم رێتێچوونە دەگمەنە. ئەو وای لێ دەهات، لە سەدا یەکەکانیش بترسێ. ئەم بارە بێگومان بە پێی دوورترین رێتێچوونەکانی ئەو کە لێکیدەدایەوەو پێش زیرەکییە لێکۆڵەرەوەکەی دەکەوت، ئەم زیرەکییە نەحەساوەو لێکۆڵینەوەیە، دەبوو لە ژیاندا لەو شوێنانەدا کە هەمیشە دەهاتە بەرامبەری، پێویست بوو ئازاترینی هێرشەکانی ئەنجام بدایە، ئەی ئەگەر لە دەستی نەبێ، ... بەم هۆیەوەش ژیانێکی بەبێ جووڵە و دوورەپەرێزی رەبەنیی بەسەر برد.

ئەو زیرەکییە لێکۆڵەرەوەو بە یەکگەیەنەرەی، تایبەتمەندییەك بوو ئەوی لە دەوروبەرەکەی جیا دەکردەوە، ساڵانێکی درێژ کە سەرنووسەریی (بەیانی نوێ)ی بەجێ دەهێنا. لە رووداوە سیاسییەکانیشدا، کە لە سەر ئەم رێتێچوونە دانسقانەدا دەوەستا، سەرنجی خوێندەوارانی خستووەتە جووڵە. بەمجۆرە لە لایەکەوە ژیانی پڕ هەڵچووی سەرنووسەریی دەچێشت و لە لایەکی دیکەوە لە چارەسەر دەگەڕا، بۆ ئەوەی لە زیانە چاوەڕوان کراوەکانی ئەو بە دووری بگرێ.

بەو رادیۆیەی ئەوەندەی لەپێك بوو هەموو ئێستگەکانی جیهانی تا سەعاتە درەنگەکان گوێ لێ دەگرت. رۆژنامە فەرەنسییەکانی بە رێکوپێکی دەخوێندەوە.

کە خۆشیان دەویست زۆر مەمنوون دەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی ببێتە ئامانجی ئەو خۆشەویستییە، بچووکترین کاردانەوەی نەدەنواند. بۆ ئەوەی شوکری بابان باش بناسین، بۆ بە چاکی ناسینی شوکری بابان، دەبوو بە خۆشەویستییەوە لێی نزیك ببینەوە، تەنانەت بۆ خۆشەویستییەکەش

دەبوو هەوڵی بۆ بدەین، ئەگەر بیویستایە دەبووە خاوەنی دەوروبەرێکی زۆر بەرین ئەو ڕۆژەی دایکی لە دەست دا، ئەوانەی بینییان ئازار ئەوی چۆن برژاند، ئەو خەمی تەنیاییەشی کە هەستی پێ دەکرد لە هێڵە بێدەنگەکانی ناوچاوییەوە هەست پێ کرد. وڵات بە مردنی شوکری بابا بەهایەکی گەورەی لە دەست دا. وەکو دوا ڕۆڵەی بەروبوو چاك بەخشی بنەماڵەی مستەفا زهنی پاشا، دەروونمانی پڕ لە ئازار کرد، ئێمەی لەگەڵ هەست بە بۆشاییەکی ئەوتۆ بەجێ هێشت کە خۆیشی زۆر بە چڕی هەستی پێ کرد.

**سەرچاوە:**

(Cihad Baban, “Hocam ve Amcam Şükrü baban”, Ord. Prof. Şükrü Baban’a Armağan, İstanbul Üniversitesi İktisat Fakültesi Mecmuası, Sayı 1-4/ 1984, s.3-10.

## پاشکۆ: (٥)

### زارۆ ئاغا لە تەمەنی (١٦٢)ساڵیدا مرد

زارۆ ئاغای بە تەمەنترین پیاوی دنیا لە نەخۆشخانەی منداڵانی شیشلیدا تا هەتایە چاوەکانی لە ژیان لێکنا. زارۆ کە لە تەمەنی (١٦٢) ساڵیدا مرد، جیاوازیی لەگەڵ منداڵاندا نەبوو. بەر لە دە ساڵ تەواوی پیاوەتیی نەمابوو. ڕۆژانی کۆنی بە بیردا نەدەهاتەوە. لە شیر و ماست بەولاوە هیچی دیکەی نەدەخوارد. بەمجۆرە زارۆ چ جیاوازییەکی لەگەڵ منداڵاندا هەبوو؟ ئەدی ئێمە بە پیرەکان ناڵێین منداڵ؟.

زارۆ ئاغام زۆر بینی بوو. کە لە شارەوانیدا سەرەك کارگوزاران بوو، کە لە تۆپخانەدا لە قاوەخانە دادەنیشت و دواتریش لەو ڕووداوەی ئۆتۆمبیلەدا لە ئەمریکا کە ئەمەیان بەهۆی ئێش پێ گەیشتنی سەریان دادەنا.

زارۆ، پێش دوو مانگ بە جارێك نەخۆش کەوت. چوار ساڵ دەبوو قودرەت خانمی هاوسەری مردبوو، تەنیا مابووەوە. لەو خانووە گچکە بە تەختە دروستکراوەی تۆپخانەدا، شەوانە بێدەنگ لە پێخەفەکەیدا گرمۆڵە دەبوو. دەچووە قاوەخانەی جەعفەر ئەفەندیی یەك لە نەوەکانی کە لە دۆغرویۆڵدا بوو، لە ڕێدا لە ترامواى و ئۆتۆمبیلەکان ڕادەما و دواییش:



- لە ئەمەلیکا (لە ئەمەریکا) من چی بووم؟ دەیگوت ئافرەتان، کیژانم لەلا پڕ بوون. دەچمەوە... ئەو هەناسە سەردەی زارۆ دەیکێشا بۆ دیمەنی ئافرەتی شەنگ و شۆخی دەوروبەری بوو. دەسا وەها! پیرەمێردی سەدەو نیوی، لە دوا ساڵانیدا ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئەمریکای دیتبوو، چاوی کرابووەوە. زارۆ، چەند ڕۆژێك لە ماڵەکەیدا نەخۆش بوو، دوایی گوێزرایەوە نەخۆشخانەی ئەڵمانی، لەوێشەوە برایە نەخۆشخانەی منداڵان. د.بەهجەت سابت بەگ چاودێریی دەکرد. شکاتی زارۆ لە ژانی هەموو جەستەی بوو. پشکنرا. پیرە زارۆ کە تا پانزدە ڕۆژ لە نەخۆشخانە نووست، لە یەکەم نووستنیدا چاکتر بووەوە، تەنانەت ماوەیەك چووەتە باخچە و چاودێریی نەخۆشە گچکەکانیشی کردووە. تەنانەت ڕۆژێکیان، پێنج منداڵی دڵخۆش کردبوو کە دەست لەناو دەست خەریکی وازی کردن بوون، گوتبووی:

- ڕۆڵەکانم، چاك دەبنەوە، ئێوەش ئەوەندەی من دەژین. زارۆ دوای ئەوەی لە خەستەخانە هێنرایە دەر، دیسانەوە چووەوە ناو زنجە بێ کارەباکەیەوە. لە ئەمریکاوە کتێبێکی دوعایان بۆ ناردبوو، ئەم بە نامەی دڵداریی تێدەگەیی.

- من بۆ (ئەمەلیکا) بانگ دەکەن. دەسا خەریکم دەڕۆم. ژن دەهێنم.

دیسانەوە ڕۆژێکیان لە نەخۆشخانە لێیان پرسیوە، چۆن ژنێکی دەوێ... پیرەی سەدو شەست ساڵە، وەکو تازە بە زەوق و ئارەزووی زانیبێ، جۆرە ئافرەتێکی لاوازی پێ پەسند بووە. لەو دەمەدا ژنێکی قەڵەو بۆ سەردان هاتووەو بە وێدا ڕەت دەبێ پێیشان دەدا و دەڵێ:

- هی وەهام ناوێ..

زارۆ ئاغا دوای ئەوەی دە ڕۆژ لە ماڵی خۆیدا خەوت.. لە هیکڕا خراپ بووەوە .. ئەو ڕۆژەی بۆ دواجار تێکچووەوە، کوڕەزاکانی ویستوویانە بیبەنە نەخۆشخانەیەکی دیکە، پیرە گوتوویەتی: ((من ببەنە ئەو شوێنەی لێی بووم)). کە سوور بووە، چاوەڕێی ڕۆژی دواتریان کردووە. کەچی سەر لە بەیانیی ڕۆژی شەممەی (١٦ی حوزەیران) بە تەکسییەکەوە براوەتەوە نەخۆشخانەی منداڵان. لە قاوشی (هۆڵی) ژمارە یەکدا نوێنرا بوو. بەهجەت سابت بەگ چاودێریی کردووە. زارۆ لە خەستەخانە، لە یەکەمین ڕۆژانیدا تەنیا شۆربای دەخوارد، دواتر

ئەوەشی نەدەخوارد. تەنیا محەلەبی و شیر و ماستیان پێ دەرخوارد دەدا. بەر لە پێنج رۆژ کە خوێنیان لێ گرتووەتەوە، دەستە وشکە دەمار مۆرەکانی بۆ دوکتۆر درێژ کردووە:

– گیانم ئازار مەدەن، خوێنم لێ بگرنەوەو هەندێك بحەسێمەوە. بەڵام هەموو ئەمانە سوودیان چییە، کات هاتبێ دکتۆر کەڵکی چییە؟ بەمجۆرە دوا بوو.

لە ماوەی سێ رۆژی دواییدا تەواوێك لەسەرخۆ چوو بوو.

– کات تەواو! ئەوها ورێنەی دەکرد.

سەر لە بەیانیی رۆژی پێنجشەممە، رێکەوتی ٢٨ی حوزەیران دوکتۆر نەشئەت عومەر بەگیش پشکنیبوویەوە. ئەگەر بەهجەتی سابت بەگ بێ یان نەشئەتی عومەر بەگ، دەسا ئومێد لە پیرەمێرد برِا بوو، کاتژمێر بەرەو دوو و نیو دەچوو... فاتمە خان کە بە شەو چاودێریی دەکردو لەلای بوو، لە پرێکدا گوێی لە هەناسە زیادبوونی زارۆ بوو بوو کە لێفەکەی تا چەناگەی راکێشراوە. لە جێی هەڵساوەتەوەو روانیویەتی پیرەمێردی سەردەم، هەردوو قۆڵی بەلایەکاندا کردووەتەوەو جارێکی دیکەش هەناسە هەڵدەکێشێتەوەو دواییش چاوەکانی بەسەر ژیاندا دەنووقێنێ. زارۆ مردبوو! رفعەت بەگی سەرۆکی نۆژداران و بەهجەت سابت بەگ ئاگادار کراونەتەوە، کە بەیانیش بووەتەوە گویلو خانمی کچی و جەعفەر ئەفەندیی نەوەی کە بۆ بینینی هاتبوون لە مردنی ئاگادار کراونەتەوە.

بەیانیی هەینی، (٢٨ی حوزەیران)، یەکەم کەس من بە گەڕانەوەی لە ئەمریکاوەیم زانیبوو. هەروەها یەکەم کەسیش من بووم هەواڵی مردنی زارۆم زانی. ئەم هەواڵە منی زۆر خەمبار کرد. یەکسەر بە ئۆتۆمبێل چوومە نەخۆشخانە.

پیرە زارۆ لە قاوشدا نەمابوو، بە کفنی سپییەوە پێچرابوو، چەناگەی بەسترابوو، لەسەر تەختەدا خەوتبوو. لووتی هەندێك بەلای چەپدا خوار کرابووەوە.

قسەم لەگەڵ دوکتۆرەکاندا کرد، گوتیان ئەو، بێ ئەوەی هیچ بڵێ، بێدەنگ، بێ ئازار چەشتن مرد. چوومە دەرەوە. (٤٠-٥٠) کەس بە ژن و پیاوەوە بەردەرگایان گرتبوو، زۆربەیان لاوی (٢٠-٢٢) ساڵان بوون. گویلو خانمی کچی کە شناسنامەکەی لە ماڵەکەیەوە هێنابوو، لە زەویدا دەگەوزایەوەو دەپاڕایەوە:



– بمانکەنە ژوورەوە، با جارێکی کەش باوکمان ببینین.

رێیان پێ درا. نەوەکانی زارۆ بە چاوی نماوییانەوە هێرشیان بردە ژوورەوە... دەموچاوی کرایەوەو هەموویان رووی ساردی وەك بەفری زارۆیان پێنج جار و دە جار ماچ کرد.

زارۆ، رۆژی هەینی و شەوەکەی لە نەخۆشخانەدا مایەوە، سەر لە بەیانیی شەممە لە نەخۆشخانەدا نەشتەرگەریی ئەنجام درا. نەوەکانی بە پارچە پارچەکردن و برِین و دوورینەوەی باپیریان قەت قایل نەبوون. دواتر بەهجەت بەگ کە پێی گوتن:

– من بەر لە مردنی، بە ئامادەبوونی نووسەری دادگا بە زارۆ ئاغام مۆر کردووەو رێم لە خۆی وەرگرتووە. ئێوە قایل بن قایل نەبن، من نەشتەرگەرییەکە هەر دەکەم، ئیدی .. قایل بوون. نەشتەرگەرییەکە سەعات دە، دەستێ پێ کرد، سەعات دوو تەواو بوو. وەکی دی، دڵی پیرەش برا بوو. نزیکی سەعات سێ و نیو تەرمی زارۆ ئاغا خرایە ناو کامیۆن (لۆری)ی جەنازەی ژمارە (١١٢)ی شارەوانییەوە، گویلو خانمی کچی کە هێشتا دانەکاسابووەوەو ئەحمەدی، یەك لە نەوەکانی کە تازە هاتبووەوەو فریای بە زیندوویی بینینی باپیرەی نەکەوتبوو، سواری لای شوفێرەکە بوون. کامیۆنە بە زەردو رەش بۆیاخ کراوەکە دەستی بە جووڵانەوە کرد. بەدوایەوە نەوەکانی سواری پێنج ئۆتۆمبیل بوون. زارۆ ئاغایان لەو رێیانەوە بردە ئەییوب، کە پتر لە سەد ساڵ پێیاندا رۆیشتبوو. سەعات نزیکی پێنج بوو بەردەکێڵێکی دیکەی بە پشتی ئەییووبدا چەقێنرا. زارۆ نێژرا.

با ئەوەش بڵێم: زارۆ بەر لە مردنی گوتبووی تەمەنی (١٦٢) ساڵە، لە کاتێکدا دکتۆر بەهجەت سابت بەگ دەیگوت، تەمەنی پیرەمێرد، هەر (١٣٠) ساڵ دەبوو. لەو لێکۆڵینەوانەدا کە دکتۆر لەمەودوا ئەنجامیان دەدا ئەمە دەردەخا. جگە لەمە، لە کاتی نەشتەرگەریدا، لە جەرگی زارۆ ئاغادا نەخۆشیی دیق دیترا بوو. هەروەها لە زراویشیدا بەرد دۆزرابووەوە.

مێزڵدانیشی خراپ و هەموو لەشی لە بارێکی داهێزراودا بووە. خاڵێکی شایانی سەرنج دان ئەوە بووە، تاکە لایەکی ساغ و پتەوی پیرەمێردە، دڵی بووە. خودای لێ خۆش بێ.

**سەرچاوە:**

(Yedigün Dergisi, Sayı: 69/1934).

# سەرچاوەکان


1- Adivar, Halidi-Edib, Mor Sakimli Ev, Atlas Kitabevi yayinlarI, İstanbul, 1992.

2- Akçura, Gökhan, Türkiye'nin en çok yaşayan adamı Zaro Ağa nasıl öldü? Albüm-Aylık Görsel Kültür Dergisi 5/1998.

3- Aktepe, M. Münir, İstanbul'un, Nüfus Mes'elesine Dâir Bâzı Vesikalar, İstanbul Universitesi Edebiyat Fakültesi Tarih Dergisi, no 13, 1985.

4- Akpınar, Alişan, Osmanlı Devletinde Aşiret Mektebi, Göçebe Yayinları. İstanbul, 1997.

5- Akşin, Sina, İstanbul Hükümetleri ve Milli Mücadele, Cem Yayinevi, İstanbul, 1983.

6- Aksüt, Sadun, Şarkılarda İstanbul, Altin Kitaplar, İstanbul, 1994.

7- Akşener, Haşmet Sırrı, Van'dan Vaniköy'e, İstanbul 1996.

8- Aktaş, Mehmet, Sesime Gel, Avesta Yayinları, İstanbul 1996.

9- Alakom, Rohat, Li kurdistanê Hêzeke Nû: Jinên kurd, Apec Yayinları, Stockholm, 1995.

10- Alakom, Rohat, Bir Kürt Diplomatinin Fırtınalı Yılları: General Şerif Paşa, Apec Yayinları, 1995.

11- Alakom, Rohat, İstanbul'daki Kürt Hamal Topluluğu, kebikeç-İnsan bilimleri için kaynak araştırmaları dergisi, no 5, 1997.

12- Alakom, Rohat, Kürt Kadınları Teali Cemiyeti, Tarih ve Toplum, no 171, 1998.





13- Alus, Sermet Muhtar, İstanbul Kazan Ben kepçe, Yayina Hazırlayan: Necdet Sakaoğlu, İletişim Yayinları 1996.

14- Altan, Ahmet, Kılıç Yarası Gibi, Can Yayinları, İstanbul, 1998.

15- Ateş, Ahmed, Molla Gürani, İslam Ansiklopedisi, cilt: 8, İstanbul, dördüncü baskı, 1987, s. 406-408.

16- Aytepe, Oğuz, Yeni Belgelerin Işığında Kürdistan Teali Cemiyeti, Tarih ve Toplum 174/1998.

17- Ayverdi, Ekrem Hakkı, Fatih Devri Sonlarında İstanbul Mahalleleri, Şehrin İskânı ve Nüfusu, Vakıflar Umum Müdürlüğü Neşriyatı, Ankara, 1958.

18- Baban, Cihad, Hocam ve Amcam Şükrü Baban, Ord. Prof. Şükrü Baban'a Armağan, İ. Ü. İktisat Fakültesi Mecmuası sayı: 1-4, 1984, s. 3-10.

19- Babinger, Franz, Fâtih'in Hocaları çev. Şevki Yazman, Hayat Tarih mecmuası, sayı: 4, 1970.

20- Barkan, Ömer Lütfi, Osmanlı İmaparatorluğunda Toprak İşçiliğinin Organizasyonu Şekilleri, İ. Ü. İktisad Fakültesi Mecmuası 1/1939, s. 29-74.

21- Bayrak, M. Orhan İstanbul'da Gömülü Meşhur Adamlar, Türkiye Anıtlar Derneği, İstanbul 1979.

22- Bayrak, Mehmet, Kürtler ve Ulusal Demokratik Mücadeleleri, Öz-Ge Yayınalrı, Ankara, 1993.

23- Belge, Murat, İstanbul Rehberi, dördüncü baskı, Tarih Vakfi Yurt Yayınları, İstanbul, 1995.

24- Birsel, Salâh, Kahveler Kitabı, Nisan Yayınları, İstanbul, 1991.

25- Bryel, Anthony, Zaro Ağa (1774-1934): The Stories of a Legend-Last of the Lions, Cornucopia 7/11. 1994-1995.

26- Celil, Celîlê, Jîyana Rewşenbirî û Sîyasî ya Kurdan, Jîna Nû Yayınları, Stockholm, 1985.

27- Celil, Celîlê, XIX. Yüzyıl Osmanlı İmparatorluğu'nda Kürtler, çev. Mehmet Demir, Öz-Ge Yayınları, Ankara, 1992.

28- Celil, Celîlê, 1880 Kürt Ayaklanması, çev. Yaşar Abdülselamoğlu, Jîna Nû yayınları, Stockholm, 1992.

29- Cemil Paşa, Ekrem, Muhtasar Hayatım, Brüksel Kürt Enstitüsü Yayınları, Brüksel, 1989.

30- Çağlayan, Mehmet, Şark Uleması, İstanbul, 1996.

31- Deleon, Jak, Eski İstanbul'un (Yaşayän Tadı), Remzi Kitabevi, İstanbul, 1996.

32- Delaon, Jak, Boğaziçi Gezi Rehberi, Remzi Kitabevi, İstanbul, 1998.

33- Dersimi, Nuri, Hatıratım, Ankara. 1992.

34- De Régla Paul, Eski İstanbul'da Azınlıklar, çev. Reşad Uzman, İstanbul, sayı: 8/1970.

35- Dünden Bugüne İstanbul Ansiklopedisi (yayımlayan: Tarih Vakfı ve Kültür Bakanlığı, 1996).

36- Ein Besuch beim Boykotsundikat, Neue Freie Presse, 24 Januar 1909.

37- Elmacı, Ekrem, 1908 Avusturya Boykotunda Liman İşçileri, Kebikeç, no 5, 1997.

38- Erdeha, Kamil, Milli Mücadelede Vilayetler ve Valiler, İletişim Yayınları, İstanbul, 1975.



39- Erder, Sema, İstanbul'a Bir kent kondu: Ümraniye, İstanbul 1996.

40- Ergin, Osman Nuri, İstanbul Şehri Rehberi, İstanbul belediyesi, 1934.

41- Ergin, Osman, İstanbul Şehreminleri, İstanbul Belediyesi, 1996.

42- Eyüp'te Sosyal Yaşam, editör: Tülay Artan, Tarih Vakfı Yurt Yayınları, İstanbul, 1998 (Eyüp Üzerine İncelemeler).

43- Gedik, Betil, İstanbul Yahudileri, Pera-Orient Yayınları, İstanbul, 1996.

44- Gerçek, Selim Nüzhet, Türk Temaşası, Meddah, Karagöz, Ortaoyunu, Kanaat Kitabevi, İstanbul, 1942.

45- Giz, Adnan, Bir Zamanlar Kadıköy… İletişim Yayınları, İstanbul, 1990.

46- Grèce, Michel de, II. Abdülhamid-Yıldız Sürgünü, İstanbul, 1995.

47- Göldaş, İsmail, Kürdistan Teali Cemiyeti, Doz Yayınları, İstanbul, 1991.

48- Hamsun, K., H.C. Andersen, İstanbul'da İki İskandinav Sayyah, çev. Banu Gürsaler Syversten, Yapı Kredi Yayınları, İstanbul, 1993.

49- Han, Şeref, Şerefname-Kürt Tarihi, İstanbul, 1971, Arapça'dan çeviren: M. Emin Bozarslan.

50- Haskan, Mehmet Nermi, Eyüp Tarihi I-II Türk Turing Turizm İşletmeciliği Vakfı Yayınları, İstanbul 1993.

51- Hiçyılmaz, Ergun, Beni Toprağıma Gömün- İstanbul Azınlıkları, İstanbul, 1993.

52- Hilmi, Refik, Anılar, Nûjen Yayınları, İstanbul, 1995.

53- İstanbul-1920, Editör: Clarence Richard Johnson, çev. Sönmez Taner, İstanbul, 1995.

66- Korcan, Kerim, Patrona, İstanbul, 1983.

67- Malmîsanıj, Bedirhaniler, Apec Yayınları, Stockholm, 1994.

68- Malmîsanıj & Mahmud Levendî, Li Kurdistana Bakur û Tirkîyê Rojnamegeriya Kurdî (1908-1902), Öz-Ge Yayınları, Ankara, 1992.

69- Manneh, Butrus Abu., The Naqshbandiya-Mujaddidiyya in the ottoman Lands in the early 19th Century, Die Welt des İslams, vol. XXII, 1982.

70- Mansel, Philip, Dünyanın Arzuladığı Şehir: İstanbul, çev. Şerif Erol, Sabah Kitapları, İstanbul, 1996.

71- Mantran, Robert, 17. Yüzyılın İkinci Yarısında İstanbul, V Yayınları, Çev. Mehmet Ali Kılıçbay, Enver Özcan, İstanbul 1986.

72- Memoirs of Halide Edib, London, 1926.

73- Mesut, Ahmet, İngiliz Belgelerinde Kürdistan, Doz Yayınları, İstanbul, 1992.

74- Methy, Daniel, I. Dünya Savaşı, Sonrası, Constantiniple'da Kürt Örgütlenmeleri Üzerine Bazı Belirlemeler, Studia Kurdica, no 1-3, 1985.

75- Mıntzuri, Hagop, İstanbul Anıları 1897-1940, Tarih Vakfı Yurt Yayınları, İstanbul, 1993.

76- Minareden Okunan Şiir, Tarih ve Medeniyat, sayı: 49, 1998.

77- Mörner, Birger, Under Halfmånen, Stockholm, 1906.

78- Nursi, Bediüzzaman Said, Divan-I Örfi, Tenvir Neşriyat, İstanbul, 1992.

79- Özendes, Engin, Abdullah Fréres, Yapı Kredi Bankası Yayınları, İstanbul, 1998.

80- Ragıp, Yakta, Zaro Ağa 162 Yaşında Öldü, Yedigün, sayı: 69, 1930.



54- Hovhannesyan, Sarkis Sarraf, Payitaht İstanbul'un Tarihçesi, çev. Elmon Hancer, İstanbul, 1996.

55- İstanbul Ansiklopedisi (Yayımlayan: Reşat Ekrem Koçu). İstanbul, 1959-1971.

56- İstanbul Ahkâm Sefterleri- İstanbul Tarım Tarihi I (1743-1757), İstanbul Külliyâtı IV, Proje ve yayın yönetmeni: Ahmet Kal'a, İstanbul Araştırmaları Merkezi, İstanbul, 1997.

57- İstanbul Kitaplığı-Katalog, Çelik Gülersoy Vakfı, İstanbul, 1988.

58- İstanbul'da Kürd İşçileri, Jîn, no 25. Arap harflerinden Latin harflerine çeviren: M.Emin Bozarslan, Uppsala, 1988.

59- İstanbul Şehri Yıllığı- İstatistik, cild 2, 1931-1932, İstanbul Belediyesi İstatistik Müdürlüğü.

60- Jîn, Kürdçe-Türkçe Dergi (1918-1919). Arap harflerinden Latin harflerine çeviren: M. Emin Bozarslan, Uppsala, 1985-1988.

61- Klein, Janet, Claiming the Nation: The Origins and Nature of Kurdish Nationalist Discourse-A Study of the Kurdish Press in the Ottoman Empire, June, 1996. A Thesis Presented to the Faculty of Princeton University in Candidacy for the Degree of Master of Arts.

62- Kara Fatma at Constantinople, The Illustrated London News, 22Nisan 1854.

63- Kodaman, Bayram, Sultan II. Abdulhamid Devri Doğu Anadolu Politikası, Ankara, 1987.

64- Koçu, Reşad Ekrem, Patrona Halil, 1968.

65- Koçu, Reşad Ekrem, İstanbul Tulumbacıları, Ada Yayınları, İstanbul 1981.

